


گۆڤارێکی هزری ڕۆشنبیری وەرزییە، ژمارە (٣٤) تشرینی دووەم ٢٠٢١




بە سپۆنسەری سەنتەری زەهاوی بۆ لێکۆڵینەوەی فیکری


خاوەنی ئیمتیاز و سەرنووسەر
تۆفیق کەریم

٠٧٥١١٤١٢٥٤٣ - ٠٧٧٣٢٦٣٧٦٦٤
tofeqkarem@yahoo.com

بەڕێوەبەری نووسین: عادل سدیق

بەڕێوەبەری هونەریی: ڕەوشت محەمەد

ڕاوێژکاری یاسایی: بەکر حەمەسدیق





سایتی گۆڤاری خاڵ
www.xallkurd.com

تیراژ: ١٥٠٠
نرخ: ١٥٠٠ دینار



# ناوەڕۆک

## تەوەری ژمارە:



## بابەتی گشتی:








# کۆمەڵگە لە بەردەم باهۆزی سۆشیال میدیادا

گۆڤاری خاڵ بابەتی (کۆمەڵگە لە بەردەم باهۆزی سۆشیال میدیا)دا دەکاتە تەوەری سەرەکی ژمارەی داهاتوو، توێژەرانی بەڕێز دەتوانن بابەتەکانیان لەوچوارچێوەدا بنێرن بۆ گۆڤارەکە، خاڵ دەخوازێت لەژێر ئەو ناونیشانەدا بابەتییانە وەڵامی ئەم پرسیارانە و چەند پرسیاری تری تایبەت بە سۆشیال میدیا بداتەوە:

- کەلێنی یاسا بەرکارەکانی هەرێمی کوردستان تایبەت بە میدیا و سۆشیال میدیا چین؟
- سۆشیال میدیا وەک ئامرازێک بۆ خاڵیکردنەوەی ناڕەزاییەکان و چۆڵکردنی شەقام.
- قۆرخکردنی سۆشیال میدیا لەلایەن کۆمپانیا زەبەلاحەکانەوە وەک سەرچاوەی هەواڵ و زانیاری.
- کێبڕکێی نێوان میدیا و سۆشیال میدیا، داهاتوو بۆ کامیانە؟
- کاریگەری سۆشیال میدیا لەسەر کەلتوور و خێزان و پرسە کۆمەڵایەتییەکان.
- ڕۆڵی سۆشیال میدیا لە پوچکردنی ماناکانی ژیان و بەشمەککردنی ژیان و بەهاکان.
- سۆشیال میدیا و دروستکردنی پاڵەوانی وەهمی.
- کاریگەری نیولیبڕالیزم لە ئاڕاستەکردنی سۆشیال میدیادا.
- سۆشیال میدیا وەک شەقامێکی سێبەر بۆ دەربڕینی ناڕەزایی و داواکردنی ماف.
- کاریگەری میدیا لە ئاڕاستەکردنی شەقام.
- سۆشیال میدیا وەک چەکێکی دووسەرە.
- داواکارین لە نوسەرانی بەڕێز، لێکۆڵینەوەکانیان لەسەر ئەو تەوەر و بوارانەی کە ئاماژەیان پێدراوە تا ڕێکەوتی (١/ ١/٢٠٢٢) بنێرن بۆ گۆڤارەکەمان.




# تەوەری ژمارە

هەمووان هەست بە پەرەسەندنی پوچگەرایی لە دەوروبەرماندا دەکەین، دەبینین زۆر شتی بەهادار بێ بەها بوون، زۆر پاڵەوانی کارتۆنی پەیدا بووە، ڕۆڵی مرۆڤ بەرەو بە ئامێربوون دەچێت، ئەگەر وەهایە کەواتە ئێمە بەرەو کوێ مل دەنێین؟ ئایا توانای وەستاندنی شەپۆلی پوچگەرایی ماوە، یان تازە لەدەست دەرچووە و دەبێت لەگەڵی ڕابێین یاخود تەسلیمی ببین.

ئەم خاڵانە و زیاتریش لەوانەمان بەر لە دوو مانگ ناردە خزمەتی کۆمەڵێک نووسەر و ئەکادیمی بەڕێز، سەرەڕای بەڵێندانیان بە توێژینەوە و بابەت نووسینیان لەسەری، کەچی بەداخەوە زیاتر لە دە بەڕێزمان بە بیانووی جیاواز بەڵێنەکانیان بەدینەهێنا، وەک بڵێی ئەو پەلامارە نەگریسەی پوچگەرایی پریشکیشی بەر بەهای بەڵێندان کەوتبێت.

ڕاستییەکەی بابەتی پوچگەرایی ئەمڕۆ لەلای بەشێک لە بیریار و ڕۆشنبیرە گەورەکان بووەتە جێگای مشتومڕ و لێکدانەوەی جیاوازییان بۆی هەیە، خۆزگە ئێمەی کوردیش وەک لە سەرەتادا وتمان مادام هەموومان هەستی پێدەکەین، خەڵکە بەتواناکانمان دەیانکردە بابەتی گفتوگۆ و لێکۆڵینەوەی وردیان لەسەر دەکرد.

لە تەوەری ئەم ژمارەیەدا چاوپێکەوتنێک و کۆمەڵێک توێژینەوەی بەپێز بڵاودەکەینەوە کە هەریەکەیان لە گۆشەنیگایەکەوە، لە پوچگەرایی و دەرئەنجامەکانی دەدوێن.





بوخاری عەبدوڵڵای قەسریٚ

# پاشخانی
# ئەدەبی پوچگەرایی

**پێشەکی:**

ڕایەڵەی ئەدەب نیشاندان و نمایندەکردنی ئەو هەست و هزر و دیمەنانەیە کە بە تێپەڕینی کات مرۆڤ بەخۆیانەوە مژۆڵدەکەن، هەر سەردەمێك پێشهاتی تایبەت بەخۆی هەیە، بۆیە ئەدەب کە ئاوێنەی ژیانە خۆی لەگەڵ ئەو سەردەمەدا نوێدەکاتەوە کە دێتە بەردەمی. ئەو شتەمان نیشاندەدات کە لە واقیعدا مرۆڤ تێی ئاڵاوە و تێی خزیوە. ئەدەب هەم لە فۆڕم و شکڵ و شێوازگەرییدا، هەمیش لە دید و بیرۆکە و ئایدۆلۆژیادا، پۆشاك و بەرگی خۆی نوێدەکاتەوە و، گۆڕانی بەسەردێت.

ئەم وتارەم، بە پوختی و خێرا، پەنجە دەخاتە سەر ڕەهەندەکانی ئاکاری پوچگەرایی، لە دیوە فەلسەفییە مێژووییەکەیدا لە ئەدەبی جیهانیدا بەگشتی. هەروەها، هەوڵدەدات ڕەگ و ڕیشاڵی پشت ئەو سیما پوچگەراییانە دەستنیشان بکات کە لە ئەدەبدا خۆیان حەشارداوە، چۆن و بۆچی؟

**چەردەیەکی مێژوویی لە سەرهەڵدانی پوچگەرایی Absurd:**

دەگوترێت نوسەر (مارتین ئیسلین) لە ساڵی ١٩٤٢ دا دەستەواژەی (ئابسێرد) واتە «پوچ» و بێ واتا، ی بەکارهێناوە بۆ یەکەمجار بۆ ئاماژەدان بە هەر بەرهەمێکی ئەدەبیی کە نمایندەی بۆشیی و بێواتایی ژیانی مرۆڤی مۆدێرن بکات بە تەکنیک و شێوازگەریی و فۆڕمی تایبەت بەخۆی. ئەدەبی پوچگەرایی ئەدەبێکە کە خۆی داتاشیوە لە تەکنیکە کلاسیکییەکانی ئەدەب، لە کێش و سەروا و زمان و لۆژیک و جوانکاری و ڕووداوگێڕانەوە و چیرۆکخوانی و پەندئامێزی... هتد. چونکە دەیەوێت ئەدەبێکی ڕەمەکی و سادە بێت کە واقیع چۆنە بەبێ ئارایشت وەک خۆی بەبێ مانایی و بەشێوەیەکی ناشیرین و بۆش و پڕ لە نالۆژیکی نەقڵ بکات، دەیەوێت نەقڵی «بێواتایی» بە «بێواتایی» بکات بەشێوەیەکی پڕ لە تەنز و گاڵتە و شۆخی.

پوچگەرایی لە ئەدەبدا ڕەگ و ڕیشاڵێکی فەلسەفیی کۆنی هەیە (کە ئێرە جێی ئەو باس و خواسە نییە)، بەڵام ئەو فۆڕمەی ئێستای پوچگەرایی Absurd داڕشتراوێکی ڕۆژئاوایی ئەوروپییە. مرۆڤی ڕۆژئاوایی لە هەناوی دۆخێکی دیاریکراوی مێژووییەوە پەلی هاویشت بەرەو خۆتەسلیمکردن و بڕواهێنان بە حەتمییەتی ڕەشبینانەی پوچگەرایی. هەرچەندە لە نێوان ڕەشبین بوون و گەشبین بوونی پوچگەراییدا ڕەخنەگرانی ئەدەب کۆک نین، ئیدی پوچگەرایی بووە مۆدەی باوی نێو ئەدەب، بووە جۆر و تایپی باڵای ویستراو، کە وایلێهاتووە بەحیساب»باشترین» و «سەرکەوتوو»ترین تێکست و بەرهەمە ئەدەبییەکانی دنیای ئێستا لە پڕفرۆشترینەکانیان ئەوانەبن کە ڕەهەندی پوچگەرایی بەسەریاندا زاڵە.

تێکڕای ئەم فۆڕم و تایپە ئەدەبییە، پاشخانێکی قوڵی مێژوویی هەیە. دەبێت ئەوە لەبەرچاو بگرین کە دنیای مۆدێرن دابڕانێکی سەختگیری دروستکرد لەگەڵ سەردەمانی پێش خۆی. مرۆڤی ڕۆژئاوا بە خێراییەکی چاوەڕواننەکراو بەرەو ستایلێکی تەواو جیاوازی ژیان کرایەوە. چۆن؟

لەگەڵ سەرەتای سەدەی بیست، زانست بوو بە دوانگەی هەرەبڵندی گەڕان و کەشفی هەقیقەت، تەکنەلۆژیا و داهینان پتر پەرەیان پێدرا، پێوەندی نێوان ئایین و ڕامیاری بە جۆرێکی دی داڕێژرایەوە، ژیانی کۆمەڵایەتی مرۆڤ گۆڕانی بەسەرداهات و مرۆڤ بەرەو تاکگەرایی (فەردانییەت) هەنگاوی هەڵێنا. هەرکەس بەرەو داڕشتەکردنی ئەو شێوەژیانە چوو کە خۆی دەیخوازێت، پانتاییەکانی مۆڕال و ژیریی تەسککرانەوە و پانتاییەکانی سۆز و ئارەزوو بەرفراوانتر بوون. ڕەفاهییەت و خۆشژیانی و لەززەتبازی شوێنی هەندێ لە ڕەوشتە کلاسیکییەکانی گرتەوە، بازاڕگەریی و دۆخی بە مارکێتکردنی ژیانی مرۆڤ گەشەی کرد، دەستی کار ڕووەو کارگە و کارخانە پتر وەکار خران، ژیان ئاڵۆزتر بوو، شارەکان بوون بە بازاڕی گەورە بۆ ساغکردنەوەی کاڵا و کەڵەکە کردنی سەرمایە.

ئەمانە دۆخی مرۆڤی مۆدێرن بوون لە سەرەتای سەدەی بیست دا، بەڵام لەو ئان و ساتانەی ئەوسادا، مرۆڤی ڕۆژئاوایی لە نێوان خواستی ژیانێکی خۆشتر و باشتر و، واقیعێکی پڕ لە نادادیی و توندوتیژی و ڕەگەزپەرستی حەپەسابوو. چینایەتی و برسێتی و خوێنپەرستی و فاشیزم ڕووەو گەشە بوون، ئەوەی مرۆڤ دەیویست دووربوو لەوەی دەیبینی، بۆیە ڕووەو جۆرێک لە بێزاریی و خەمۆکیی و نامۆیی هەنگاوی هەڵێنا. سیاسەتی وڵاتانی زلهێز بەرەو داگیرکردن و کۆلۆنیالیزم وزە و توانستەکانیان خەرج دەکرد، کۆیلایەتییەکی تازەیان بەرهەمدەهێنا بە شێوازێکی تازەی مۆدێرن و بە بەرگێکی ئامێریی و تەکنەلۆژیایی نوێوە.

ئەوکاتە سەرەتای هەرزانفرۆشکردنی بەهای ڕاستەقینەی (مرۆڤ) لەئارادا بوو. لەژێر چنگی سەرمایەداری کۆلۆنیالیستەوە، بە پلان و پرۆگرامەوە، وردە وردە مرۆڤ دەخزێنرایە قەفەزێکی تازەوە کە دەبوو تەنها وەک ماکینەیەک ئیش بکات و کاتژمێری سەرمایەداری بجولێنێت. نەک تەنها لەڕووی جەستەیەوە، بەڵکو لەڕووی ڕۆح و دەروون و سۆز و هەستەکانیشەوە مرۆڤ ناخێکی شەکەتی هەبوو. تا لەپڕ دوو ڕووداوی گەورە ڕوویاندا، ئەوانیش دوو جەنگە جیهانییەکە بوون.

جەنگی یەکەم و دووەمی جیهانی، ناخی مرۆڤی مۆدێرنی هەژاند. بەو هەموو کوشتار و خوێنڕژان و توندوتیژیی و کاولکاریی و خراپکردنەی کە ڕوویاندا، جەستەی مرۆڤایەتی نەزیف بوو، تک تک خوێنی لێ دەچۆڕا. ئیدی ئەو ژمارە زلەی قوربانیدان و خەسارەتی گیانی و ماددی، وایکرد کە مرۆڤی ڕۆژئاوایی ڕووەو نائومێدی و بێهیوایی چوو، ئەو تروسکاییەی خەونبینین بە ژیانێکی دادگەرانەشی لەبەرچاو ونبوو. لێرەوە و لەنێو هەناوی ئەم واقیعەدا پوچگەرایی هێلکەی خۆی دانا و لەدایکبوو. بۆچی؟

چونکە لە پەنجاکانی سەدەی ڕابردوو (دوای جەنگی دووەمی جیهانی) مرۆڤی ئەوروپی مۆدێرن چیتر وەک مرۆڤی کلاسیک لەنێو سیستەمێکی ڕەوشتییانەی ئایینیانەدا نەمابوو، نەشیتوانی بگاتە بەهەشتی سەرمایەداریی لە خۆشگوزەرانی مۆدێرنیزم، هیواو خەونەکانی لەبارچوو، بۆیە دەستەوەستان (پاسیڤیتی) و کۆڵدان و بێهیوایی و خەمۆکی ژیانی مرۆڤی نوێی ڕۆژئاوایی داپۆشی. لە هەناوی شارانێکی وێرانکراوی تەخت و بار کاولبووی وەک بەرلین و لەندەن و پاریس و لینینگراد و وارشۆ و ...هتد، چیتر بەهای مرۆڤ وەک جاران نەمابوو. چیتر وەک جاران هەواڵێکی تاسێنەری بەشووم نەبوو مرۆڤ قڕکردنی مرۆڤ بەچاوی سەری ببینێت، گۆڕە بەکۆمەڵەکان و کامپ و زیندانە گەورەکان و گازی خنکێنەری بەکۆمەڵ لە تراژیدیای یادگەی مرۆڤدا هەڵکەنرابوون. دیمەنە مەرگەساتەکان لەبیرنەدەکران! تەنانەت هەبوون و نەبوونی مرۆڤ (لە پرسیارە وجودییە فەلسەفییەکەیدا) کەوتە ژێر پرسیارەوە.

ئەمانە وایانکرد ئەدیب و وێژەوان و نوسەر و خامەلەدەستان ناخی نەزیفبووی خۆیان خاڵیبکەنەوە، هەڵسن بە فۆرمەڵەکردنی جۆرێکی یاخیبووی تازەی ئەدەب و هونەر کە ڕەنگدانەوەی بێمانایی دۆخی جەنگ و دوای جەنگی مرۆڤی ڕۆژئاوایی بێت. ئیدی شانۆنووس و شاعیر و ڕۆماننووسێکی پاریس یان بەرلین چیتر وەک جاران بە بۆنی گوڵێکی مێخەک یان ڕوومەتی یار نەدەوروژا، بەڵکو لە مەرەکەبی پێنوسەکەیدا خەمێکی قوڵی هەڵدەگرت کە پڕبوون لە فرمێسکی ڕژاوی جەنگ. بەخەسارچوون و بەهەدەرچوونی گیانەکان لەو دوو جەنگەدا هەبوونی مرۆڤ و تەنانەت هەبوونی ئامانج لە ژیانی مرۆڤدا خستە ژێر گومانەوە.

دەبێ بشڵێم کە کزۆڵیی بڕوا بە (ئایین) لەلای تاکی ئەورووپی کاریگەری زۆری هەبوو لەسەر سەرهەڵدانی (پوچگەرایی). بەر لە هەموو شت، ئایینی مەسیحییەت خۆی پرسیارێکی گەورەبوو لە ڕۆژئاوای دوای جەنگی دووەمی جیهانی، دیبەیتی نێوان مەسیحییەت و داروینیزم لە لوتکە بوو، بۆیە مرۆڤی ئەورووپی لە دین دوور دەکەوتەوە، بەڵام دەشیزانی کە جۆرێک لە برسێتی ڕۆحی و دینی ناخی ئازار دەدا. لاوازی مەسیحییەت لە وەڵامدانەوەی پرسیارە وجودییەکان و ڕاوەستان لە بەرانبەر هەژموونی ئیلحادییانەی زانستی ئەوسا، وایکرد مرۆڤی ئەورووپی چیتر چاوەڕوانی گەورە لە مەسیحییەت نەکات بۆ ڕزگاربوون لەو خەمە قوڵەی کە یەخەی گرتووە. بۆیە پوچگەرایی لە بنەچەدا بەرگێکە بەبەر هزری ئیلحاد.

> **ئەدەبی پوچگەرایی ئەدەبێکە کە خۆی داتاشیوە لە تەکنیکە کلاسیکییەکانی ئەدەب، لە کێش و سەروا و زمان و لۆژیك و جوانکاری و ڕووداوگێڕانەوە و چیرۆکخوانی و پەندئامێزی.**

ئیدی هیچگەرایی و بێبنەمایی لە ئەدەب و هونەر و سینەما و مەعریفەخوازیدا گەشەی کرد، لە دیدی مرۆڤێکی ڕۆژئاوایی کە وابەستەی سیستەمێکی ئایینی توندوتۆڵ نەبوو و پرسیارە وجودییەکانی لە مەسیحییەتدا نەدەدۆزیەوە، زۆر ئەستەم بوو وەڵامە وجودییە قورسەکان لە هۆشی خۆیدا هەڵبهێنجێت. تەنانەت هۆشگەرایی و ڕاشناڵیزم و ئەقڵانییەتیش کەوتنە بەربەستییەکی زۆر سەختەوە کە دەربازبوون لێی ئەستەم بوو، هۆشی مرۆڤ نەیدەزانی چۆن لەو واقیعە تاڵە تێبگات کە مرۆڤ خۆی خوڵقاندوویەتی لە کاولکاریی

و خوێنڕێژیی و جەنگ و ستەم. بۆیە ئەدەبی پوچگەرایی ڕاکردنێک بوو لە سیستەمی چوارچێوەداری ئەقڵانییەت، تەنانەت ڕاکردن لە ڕەفاهیەتیش کە زانست بەرهەمی هێنابوو، چیتر ئەقڵ توانستی تێگەیشتن لەو واقیعە تاڵەی نەبوو. چیتر دروشمەکانی شارستانییەتی ڕەوشەنگەریی و هۆشگەرایی نەیانتووانی وەڵامی مرۆڤ بدەنەوە.

لە پەنجاکانی سەدەی ڕابردوودا بۆ مرۆڤی ڕۆژئاوایی زۆر سەخت و قورس بوو بتوانێت هەرسی واقیعێکی تاڵی لەوشێوەیە بکات کە تێگەیشتن لێی بەو خەسارەتە گەورەیە لە دەرەوەی هێز و توانستی ئەقڵی مرۆڤە. مرۆڤی ڕۆژئاوایی چیتر هیچ شتێکی بە (ڕێنامە) و (خاوەن)ی خۆی نەدەزانی، هەستی دەکرد ونبووە لەم جیهانە (بەگوتەی خۆیان) «بێڕەحم» و «بێناسنامەیەدا». بۆیە مرۆڤ پشتی کردە بەها کۆمەڵایەتیی و مۆڕاڵییە کلاسیکییە جێگیرەکان و ئیدی ویستی خۆی لەو دنیایە تازەیە حاڵی ببێت کە مرۆڤ خۆی وەک دۆزەخ خولقاندوویەتی. لەوێوە دەستەپاچەیی و بێئومێدیی و ونبوون و بێ ئامانجی باڵی بەسەر شێوەی ژیانیدا کێشا، ئەدەب کە ئاوێنەی واقیع خۆیەتی کەوتە ژێر چنگی (هیچ) و (پوچی) و (بێ بنەمایی) لە ئایدیاکانیدا. ئیدی لەوساوە، مەدرەسەی (پوچگەرایی) لەژێر ناوەکانی: نیهیلیزم و ئابسێردیزم و پەڕناسیزم و دادایزم و سوریالیزم و ....هتد، بە ژانر و فۆڕم و شێوەی جیاجیاوە گەشەیان کرد.

**ڕەگەزەکانی پوچگەرایی Absurd لە ئەدەبدا:**

لە هزر و بیرۆکە و ئایدیاکانیدا، پوچگەرایی یاخیبوونە لە (بەها) و (مانا) نەگۆڕ و جێگیرەکان. گومانێکی گەورەی مرۆڤی مۆدێرنە لە هەموو ئاکار و دید و هزرێک کە بە چەسپاویی و بە میرات لە چەرخەکانی پێشووەوە بۆی ماوەتەوە. بۆیە پوچگەرایی بڕوای بە یەقین و ئیمان نییە، دوورکەوتنەوەیە لە ئایین و ڕەوشتی ئایینی، چونکە پوچگەرایی وەک فەلسەفەیەک بڕوای بە واتا و (مەعنا)یەکی چەسپاو نییە بۆ ژیان و بوون. هزرێکی شڵۆقی خۆدۆزەرەوەی خۆدروستکەر و تەنانەت خۆڕووخێنیشە. پوچگەرایی خووگرتنە بە (خود)و مانەوە لە گومان و پرسیارەکانی ناخ، بەبێ ئیلهام وەرگرتن لە هێزی یەقینی ئایین. هەروەها جۆرێکە لە خۆکەنارگیرتن و دوورکەوتنەوە لە خەڵک، تەنیایی و گۆشەگیریی و خاڵیبوونەوە لە پێکەوەیی و کۆمەڵگە، وەک فەیلەسوفی فەڕەنسی سارتەر (کە بە باوکی وجودییەتی مۆدێرن ناسراوە) دەڵێت: «دۆزەخ بریتییە لە خەڵک، ئەوانیتر دۆزەخن». ئەم ڕەهەندە لە ئەدەبی مۆدێرندا زۆر بە قوڵی هەستی پێ دەکرێت. ئەدیبە قەڵەمدیارەکانی ئێستای دنیا بەو زمانە کەنارگیرییە دەنووسن، بەو نەفەسە گۆشەگیریی و یاخیبوونەوە دەئاخڤن، ئەدیبە پوچگەراییەکان دەیانەوێ نیشانەی پرسیار بخەنە سەر سەرجەم ڕەوشت و ئاکار و دید و هزر و ئیمان و نەریتێک کە

لەڕێگەی ئاسمان و ئایینەکانەوە خەڵک لەسەری پەروەردە کراوە. ئەوان لە ڕاڕاییدا بیر دەکەنەوە، بۆیە دوژمنی یەقین و سکونن، پێیانوایە کە مرۆڤ تەنها کاتێک دەتوانێت لە ئازاری مرۆڤێکی تر تێبگات کە سکون بگۆڕێتەوە بە گومان و ڕاڕایی و سەرکەشیی و ڕاکردن لە نەریتەکانی کۆمەڵگە.

بۆیەش ئەگەر سەرنج بدەی، کاراکتەرەکانی ڕۆمانە تازە و هاوچەرخە جیهانییەکان کەسانێک نین کە ڕەوشتی ئایینی یان ڕەوشتی کلاسیکی پاڵەوانیی Hero بەسەریاندا بچەسپێت، بەڵکو کەسانێکی یاخیی و دەروونەخۆش و دوودڵ و پەرێشانن کە هەمیشە پرسیاری بێ وەڵامیان هەیە و لە خەم و ئازار suffering دا دەتلێنەوە. ڕەنگە ئەم ڕۆمان و شانۆ و بەرهەمە ئەدەبییە نوێیانە، کە تەنانەت دنیای سینەما و شاشەشی گرتۆتەوە، ئەوەمان پێ بڵێن کە مرۆڤی مۆدێرن لە دەرەوەی یەقینی ئیمان و خواناسیدا دەستەویەخەی جەنگێکە لە ناخی خۆیداو لە ڕاڕایی و گوماندا دەژیت.

ئەدەبی دنیای ئێستا، لە ڕۆمان و شیعر و شانۆ و فیلم، مەودا و دووریی تاکگەرایی و دوورکەوتنەوە لە (کۆمەڵگە) بەسەریدا زاڵە، نامۆبوون و کەنارگیریی alienation یەکێکە لە ئاریشە سەرەکییەکانی مرۆڤی مۆدێرن. نامۆبوونێکی وجودییانە کە ڕەهەندێکی دەروونیشی هەیە و پەیوەستە بە شکان و پەستیی و تورەبوون. ئەدەبی ئێستا پڕە لەو جۆرە ونبوون و نامۆبوونانە: نامۆبوون بە خود، خوا، خەڵک، ناسنامە و شوناس و کات و شوێن و یادگە و ڕابردوو...هتد. تەنانەت لەڕووی تەکنیکی و فۆڕمیشەوە دوو ڕەگەزی گرنگی شانۆ و ڕۆمان کە بریتین لە (شوێن و کات) لە ئەدەبی پوچگەراییدا دەشێوێنرێن و دەخرێنە ژێر چەتری خەون و تەمومژ و لێڵی و ناڕوونیی و ناجێگیریی و گوماندا. نیشانی دەدەن کە ژیان لە سەردەمی مۆدێرندا (کە دوای پەنجاکان بە پۆستمۆدێرنیش ناودەنرێت) کە سەردەمی تەکنەلۆژیای چەک و ڕۆکێت و کارخانە و بینای بەرز و لەمسی شاشە و میدیای زەبەلاحە، وەک ئەوە وایە مرۆڤ لە خەونێکدا matrix بژیت و هەموو شتێک وەک سەرابێکی بیابان کاتیی و گوماناوی و خەڵەتێنەر بێت. ونبوونی شوناس و ونبونی خود لە نێوان ئەو هەمووە چەرمەسەریی و نەهامەتییانەی کە ڕۆژگار و جەنجاڵیی دنیای ئێستا بۆ مرۆڤی خوڵقاندووە، کاراکتەرێکی هەرە سەرەکییە لە ڕۆمان و شانۆ و فیلمی سینەمایی ئێستای دنیای ئەدەب و هونەر دا.

بۆ سەلماندنی ئەم خاڵانەی سەرەوە، دەشێت خوێنەر بگەڕێتەوە بۆ ڕۆمان و شانۆیەکانی فرانز کافکا و ئالبێرت کامۆ و سامۆیل بێکێت و تۆلستۆی و دۆیستۆڤیسکی و ڤێرجینیا وۆڵف و ئیدوارد ئالبی و ژان پۆل سارتەر و سیمۆن دی بو ڤۆار و ئالیس وۆلکەر و ژین ژانێت و ئینیسکۆ...هتد کە گەورەترین فیگەر و کەسایەتییە مۆدێرن و پۆستمۆدێرنە ئەدەبییەکانی جیهانن. بۆ ڕۆماننووسێکی وەک سیمۆن دی بو ڤۆار

سەیرکردنی ئاوێنە ئاریشە و کێشەیە، چونکە ئەوکەسەی کە تەماشای دەکات کەسێکە نامۆیە پێی! دەڵێت:» کاتێک تەماشای خۆم دەکەم لە ئاوێنەوە، هیچ دەبینم، خەمناک دەبم، دادەمێنم، بۆشیی و «هیچ» و بێ واتایی دەبینم». ئەم گوتەیە دەرخەری ڕووانینی ڕەشبینانەی مرۆڤی مۆدێرن و پۆستمۆدێرنە لە (خود)ی خۆی و نامۆبوونییەتی بە بەهای مرۆڤانەی خۆی، ئەمەش لەسایەی ماکینەی کاپیتالیزم کە بەهای مرۆڤ لە وەبەرهێنان و خەرجکردنی (پارە) و سەرمایە و بازاڕدا دەبینێت.

**پوچگـەرایی بڕوای بــە یــەقین و ئیمــان نیـیە، دوورکەوتنەوەیە لە ئایین و ڕەوشتی ئایینی، چونکە پوچگەرایی وەك فەلسەفەیەك بڕوای بە واتا و (مەعنا)یەکی چەسپاو نییە بۆ ژیان و بوون.**

ساموێل بێکێت، نوسەری ئێرلەندی کە یەکێکە لە داهێنەرانی ڕێبازی پوچگەرایی لە ئەدەبی تازەدا، لە شانۆیەکی بەناوبانگدا کە بەهۆیەوە خەڵاتی نۆبڵی پێدرا، بەناوی (لە چاوەڕوانی گۆدۆدا) ئەوە دەردەخات کە قسەکردنی مرۆڤەکان لەگەڵ یەکتریدا لە سایەی دنیای مۆدێرندا واتای «هیچ» دەبەخشێت و نرخی زمان و تێگەیشتن و وشە لەدەست دەدات، مرۆڤ دەبێتە ڕۆبۆتێک کە ئیشی سەرەکیی شەوو ڕۆژی تەنها بریتییە لە کات بەسەربردن، یان قسەکردن لەبارەی کێشەی زنجیری پانتۆڵ، پەتی سێدارە، خواردنی گیزەرێک بۆ ڕزگاربوون لە برسێتی، گێڕانەوەی خەون، باسی کڵاو، باسی تەسک و ناڕەحەتبوونی پێڵاو، یان چوونە توالێت. ئەدەبی ساموێل بێکێت مرۆڤ دەخاتەوە قاوغێکی بچووک کە ئاریشە و باس و خواسە گەورەکانی لەبیرچووە، تەنها لە چاوەڕوانی کەسێکی گوماناویدا کات بەسەردەبات بەباسی شتی «هیچ» و بێنرخ و بچووک! ئەمە مرۆڤی ئێستایە، تەنیا و بێکەس و لە غوربەتدا ونبوو، لە دوای ئەو جەنگە خوێناوییانەی کە بەسەرخۆیدا هێناوە و کاولکاری کردۆتە خەڵات بۆ شارەستانییەتی مرۆڤایەتی.

## پوختە و ئەنجام:

لەڕاستیدا ئەگەر ئەدەبی پوچگەرایی وەک ئاوێنەیەک، یان دەلاقە و پەنجەرەیەک، نەقڵێکی ڕاستەوخۆی جەنگی مرۆڤی مۆدێرن و پۆستمۆدێرن لەگەڵ خۆیی و دەروونی خۆی نیشانبدات، ئەوا کەرەستەیەکی گونجاوە بۆ تێڕامان و لێوردبوونەوە و هزرین. ئەدەبی پوچگەرایی دەبێتە کەرەستەیەکی باش بۆ تاقیگەی دەروونشیکاری تا لەوێوە توێژینەوە لەسەر کرۆکی کێشەکانی مرۆڤی هاوچەرخ بکرێت. بۆچی مرۆڤی ئێستا شەیدای گۆشەگیرییە؟ ئەمە پرسیارێکی دەرونشیکارییە. بۆچی مرۆڤی ئێستا لە دووری ئایین و ئیماندا، ڕاڕا و گوماندار و بێ سکونە؟ تا چەند ئەدەبی پوچگەرایی گەشتی پەستیی و بێزاریی و نائاسودەیی کەسانێکمان بۆ نەقڵ دەکەن کە دەرچەی ئیمانیان لێ ونبووە؟ ئەمە پرسیارێکی فەلسەفی و تیۆلۆژییە.

بۆچی مرۆڤی ئێستا لەگەڵ ناخی خۆیدا لە جەنگە؟ بۆچی مرۆڤی سەردەمی سەرمایەداریی و بازارگەریی واتای ژیان نادۆزێتەوە؟ یان بۆچی واتای ژیانی ون کردووە؟ ئایا ماددە و سەرمایە بەتەنها بەس نین بۆ ژیان؟ چیتر ونە؟

بۆچی مرۆڤی ئێستا لە پانتایی قوڵاییدا تینوێتییەکی ڕۆحی هەیە؟ خوێنەر ڕادەسپێرم کە بۆ ئەم مەبەستە شانۆیەکانی ئیدوارد ئاڵبی موتاڵا بکات. ئیدوارد ئاڵبی نوسەرێکی ئەمەریکییە، بە ڕێبەری پوچگەرایی شانۆی ئەمەریکی ناسراوە، و بەندە ناونیشانی ماستەرەکەی لەبارەیەوە نووسیوە، لەوێوە ئەگەر سەرنج بدەی تێبینی دەکەی کە مرۆڤی دنیای مۆدێرن (کە کاراکتەرەکانی ئەم شانۆیەن) لەناخدا ماندوو و بێزارن. ئەم کاراکتەرانە هەست دەکەن شتێکیان لێ ونبووە و ناشزانن چیە، تینووی ڕاستەقینەن بۆ بەهایە ئاسمانی و ڕۆحی و ئیمانی و ڕەوشتییەکان. یاری دەکەن، دەگرین، پێدەکەنن، ڕادەبوێرن، دەخۆنەوە، سێکس دەکەن، شەڕدەکەن… هەموو شتێک دەکەن و بەختەوەر نین! لە قسەکانیاندا پەستی و توڕەییان لەگەڵ خودی خۆیاندا هەیە، ڕاستە لە جەستەیاندا تێر و بێ کێشەن، بەڵام لە ناخیاندا وێڵ و سەرکەشن، هەست بە نامۆیی و غوربەت دەکەن چونکە شتێکیان لێ ونبووە و نەیاندۆزیوەتەوە، لەو تینوێتییەشدا ئاڕاستەی ئاسودەییان لێ ونبووە و خۆیان لە (دیالۆگ)ەکانیاندا ددانی پێدا دەنێن کە سەرگەردانن و بەدوایدا دەگەڕێن.

شانۆ و ڕۆمان و سینەمای ئێستا لە دنیای ئەدەبدا ژوورە تاریکەکانی ناخی نامۆ و توڕە و بێزار و بێدەنگ و بێهیوای ناخی مرۆڤی هەڵڕشتۆتە دەرەوە بۆ سەر شاشە و پەڕاوەکان. نووسەرانی شانۆ و ڕۆمان و سینەمای بێهودەیی لەڕووی تەکنیک و هزریشەوە کەسانی زیرەکن. بەڵام لەوەش گرنگتر خوێنەر خۆیەتی کە هونەری مامەڵەکردنە لەگەڵ ئەو دەقە ئەدەبی و سینەماییانە، بۆئەوەی مرۆڤی ئێستا ئاڕاستە بکرێت خۆی بدۆزێتەوە و واتا لەژیانیدا بدۆزێتەوە.

توێژەر و ڕەخنەگر و نوسەرەکان دەبێت هێندە وشیار بن کە ئەو پێوەندییە دروست

بکەن لە نێوان ئەو دەقە ئەدەبییانەی پوچگەراییان تێدا هەیە و شیکردنەوەی ڕاستەقینەیان بۆ بکەن بە واقیعی مێژووییەوە، تا خوێنەر بتوانێت تێبگات لە چ دۆخێکدا چ دەقێک نوسراوە، دوورییە مێژوویی و سیاسی و کەلتوورییەکان ببینێت ئینجا دەقێک شیتەڵ بکات، وەک ئەوەی لە پێشەکی ئەم نوسینەم باسمکردوە.

بە کاریگەری ژیرانەی نازانم دەقێکی ئەدەبی مرۆڤی دەستەپاچە (پاسیڤ) و بێ کردار و نامۆ و بێزار و بێ ئیمان و بێ ناسنامە دروستبکات بۆ کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی. وشەی پەرتووک و کتێبە ئەدەبیەکان ڕەنگە نەک تەنها کار لە دۆخی دەروونی خوێنەر بکات، بەڵکو بیکاتە کائینێکی ڕەشبین و بێهودە و بێ سوودیش بۆ کۆمەڵگە، گەرچی نووسەریش ئەو نیازەی نەبوبێت لە بنەڕەتدا. کاتێک دەقێکی ئەدەبی کاریگەریی سەلبی لەسەر دەروونی مرۆڤ دروستبکات بەوەی کە دنیای ڕەشبینی بۆ بخاتە سەر پەڕاو و تەنها ڕەنگی ڕەش هەڵبژێرێت بە ڕەنگی ژیان و وشەی «هیچ» و»بۆش» و «بەتاڵ» و «سفر» بکاتە هاو واتای هەبوون و کەون و ژیان، بەبێ دەرچەی چارەسەر، ئەوا خوێنەر دوور و نزیک دەکەوێتە ژێر هەژموونی هزر و دید و سایکۆلۆژیای نوسەرەوە، ئەو خوێنەرە وشەی»هیچ» دەکاتە ناونیشانی ژیانی خۆی! زۆر نووسەر بەهۆی هەبوونی شۆکی دەرونیtrauma وە وەکو چارەسەری دەروونی دەچن دەستدەدەنە پێنووس و ئەوەی لە ناخیاندا قەتیس بووە دەریدەبڕن و دەنووسن، گرنگە خوێنەر گەشەکردوو بێت و خۆی دارنێت لە سایکۆلۆژیای سەبجەکتیڤی نوسەر و، وەک دەقێکی ڕووت مامەڵە لەگەڵ وشەکاندا بکات، نەوەک بکەوێتە ژێر هەژموونی عاتیفییانەی ئەو دەقە ئەدەبییەوە. بەواتایەکی تر، خوێنەر دەبێت (بوون) ی خۆی وەک بونەوەرێکی هۆشەکیی بهێڵێتەوە و، لەبەرانبەر دەقدا نابێت وەرگرێکی دەستەپاچە و کۆڵەوار بێت، بەبێ شیکردنەوە و ڕامان و ڕۆنان.

ئەدەب، لە پاڵ چێژ و خۆشی خوێندنەوەشی، هەمیشە بە پەیامێکی دیاریکراوەوە دادەبەزێتە کۆشی خوێنەر و دەخوێنرێتەوە. نووسین تەنها خاڵیبونەوە و هەڵڕشتن نییە، بەڵکو بیناکردن و دۆزینەوە و گەشبینی و گەڕان و بەرپرسیارێتیشە. بۆیە بەپێویستی دەزانم، خوێنەرانی دەقە جیهانییەکان وردتر و ژیرانەتر و گەشبینانەتر مامەڵە لەگەڵ ڕووداو و بەسەرهات و وتەکانی ئەو بەرهەمانە بکەن.

# سەرچاوەکان


1 Rasool, Bukhari. Illusion and Reality in Albees Whos Afraid of Virginia Woolf and Sophocles Oedipus Rex. Master Thesis. Salahaddin University, 2016.

2 Solomon, Robert C. (2001). From Rationalism to Existentialism: The Existentialists and Their Nineteenth Century Backgrounds. Rowman and Littlefield.

3 Sartre, Jean-Paul (2007). Existentialism Is a Humanism (original text: ‹L›existentialisme est un humanisme›, 1946). Yale University Press.

4 Cuddon, J A, Claire Preston, and J A. Cuddon. The Penguin Dictionary of Literary Terms and Literary Theory. London: Penguin Books, 1999. Print.

5 Krasner ,David . A History of Modern Drama, Volume I. PDF

6 Day, Gary. Modernist Literature, 1890-1950. Pearson Longman.



د.يعقوب مهدى بەرزنجى

# سیستمی پوچگەرایی

## (La médiocratie نظام التفاهة)[1]

عن أبي هريرة رضي الله عنه قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: ((سيأتي على الناس سنوات خداعات، يصدق فيها الكاذب ويكذب فيها الصادق، ويؤتمن فيها الخائن ويخون فيها الأمين، وينطق فيها الرويبضة))، قيل وما الرويبضة يا رسول الله ؟ .. قال: «الرجل التافه يتكلم في أمر العامة» (٢).

لەو فەرمودەيەى سەرەوەدا پێغەمبەرى ئازيز دەفەرموێت: (ساڵانێكى فريودەر بەسەر خەڵكيدا دێن؛ ڕاستگۆ بە درۆ دائەنرێت و درۆزن بە ڕاستگۆ دائەنرێت، خائين بە ئەمين دائەنرێت و ئەمين بە خائين دائەنرێت، لەو ساڵانەدا (ڕوەيبيزە قسان دەكەن، وتيان ڕوەيبيزە چيە ئەى پێغەمبەرى خودا؟ گووتى: پياوێكى هيچ و پووچ (هيچ لەبارانەبوو) قسە لە كاروبارى گشتيدا دەكات).

(دۆنۆ) لە کتێبەکەیدا دەڵێت: ئەمڕۆ لە هەموو جیهان هیچ و پوچیەتی دەسەڵاتی گرتووە بەسەر هەموو لایەنەکانی ژیان، هیچ و پوچەکان دەستیان گرتووە بەسەر دەسەڵات و سەنتەرەکانی بڕیارداندا، دوا وتەو وتەی یەکلاکەرەوە هەر بۆ ئەوانە لە هەموو بوارێکی تایبەت و گشتیدا. جا (دۆنۆ) پەنجە دەخاتە سەر ئەو مەترسیانەی کە بەهۆی ئەم بارودۆخەوە ڕوبەڕووی مرۆڤایەتی دەبێتەوە و بەجیا باسی چەند بوارێکی ژیان دەکات کە هیچ و پووچی تیایدا بە سیستەماتیک کراوە، وەکو لایەنی ئەکادیمی و سیاسیی و ئابووریی و بازرگانی و دارایی و هونەریی و میدیا.

**چوارچێوەی گشتی کتێبەکە:**

بەشێوەیەکی گشتی کتێبەکە باس لەوە دەکات کە هەموو چالاکییە مرۆییەکان لە هەموو بوارە جۆربەجۆرەکاندا زیاتر وەکو یارییەک وایە هەموو لایەنەکان تیایدا بەشدارن و هەمووشیان ئاگاداری ئەو یاریەن، بەڵام هیچیان لەمبارەیەوە ورتەیان لێوە نایات، لەم یارییەدا بەهاکان(قیم) دووردەخرێنەوە، ئەوەی بایەخدارە تەنها لێکدانەوەی بەرژەوەندییە ماددییەکانی وەکو پارە و سامانە لەگەڵ بەرژەوەندییە مەعنەوییەکانی وەکو ناوناوبانگ و پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان، هەتا وردە وردە جەستەی کۆمەڵگا تووشی گەندەڵییەکی بونیادی دەبێت، ئیتر خەڵکی هێندەی گرنگی بە کاروبارەکانی تاکەکەسی کەمبایەخی خۆیان دەدەن هێندە گرنگی بە کاروباری گشتی بایەخدار نادەن.

دیارە لەناو کۆمەڵگەدا کۆمەڵە کەسانێکی خاوەن هیمەتی بەرز هەن و دەیانەوێت بەڕێگە و پێوەرە ئەخلاقییەکان بگەن بە لوتکە، هاوکات لەبەرامبەردا کەسانێکی تر هەن بەدوای ئاسانترین ڕێگەوەن بۆ گەیشتن بە سەرکەوتن، ئەوەی یارییەکە بەڕێوە دەبات کۆمەڵەی دووەمن، چونکە سرووشتی ژیانی ئەمڕۆ ئەوانە دەخوازێت کە خۆی لە ئاسانکاریی و سادەیی و هیلاک نەبوون دەبینێتەوە، ئەوانەی کۆمەڵەی دووەم ناتوانن بگەن بە کۆمەڵەی یەکەم، بۆیە هەوڵی ئەوە دەدەن کە ئەوان دابەزێنن بۆ ئاستی خۆیان، ئەمەش بەخێرایی ڕوودەدات کاتێکت زانی کەوتوویتەتە خوارەوە بێ ئەوەی هەست بەخۆت بکەیت، چونکە هاتنە خوارەوە ئاسانترە و هەوڵی کەمتری پێویستە لە چونەسەرەوە، ئیتر بەمشێوەیە زۆرینە دێنە بەرەی دووەم، ئەوکات کاروباری گشتیی و بەرژەوەندیی و چاکەی گشتی هیچ گرنگ نییە بەلایانەوە.

**یەکەم: زمانی ئاخاوتنی پوچگەرایی**

پوچگەرایی دوو زمانی ئاخاوتنی تایبەت بەخۆی هەیە کە تاڕادەیەک پێچەوانەی یەکترن، یەکەمیان ئەوەیە کە نووسەر بە(زمانی دارین) ناوی دەبات، پێیوایە زمانێکی قەبەی ناوبۆشە، بریتییە لە دوبارەکردنەوەی هەمان شت، بەڵام بەدەربڕینی جیاواز جیاواز، تۆ وا هەست ئەکەیت شتێکی نوێ لە دووتوێی ئەو دەربڕینەدا بوونی هەبێت،

بەڵام لەڕاستیدا هیچ شتێکی نوێ بۆئەوەی هەیە لە مەعریفە زیاد ناکات، مەبەست لە بەکارهێنانی ئەم زمانە بۆ موزایەدەی زمانەوانی و بۆ ڕاکێشانی سەرنج و ڕای گشتییە، هەندێ جار کەسی قسەکەر بە تەکەلوفەوە و بە زەحمەت دەستەواژەکەی بۆ ئەوترێت. هەر لەمبارەیەوە جۆرج ئۆرێل لە ڕۆمانە بەناوبانگەکەی (١٩٨٤) و لە وتارێکیشیدا بەناونیشانی (سیاسەت و زمانی ئینگلیزی) ئاماژەی بەم جۆرە زمانە داوە و بە (نیو سپیک-Newspeak) ناوی بردووە، کە دەڵێت:» لە ناوەندی سیاسیدا سیاسییەکان وشەی قەبە و بێمانا بەکاردەهێنن».

زمانی ئاخاوتنی دووەم بەشێوەیەکە کە لە ناوەندە ئەکادیمییەکاندا دەربڕینی بابەتە زانستییەکان ئاڵۆز نیشان دەدرێت، یاخود بەپێچەوانەوە زۆر سادە دەکرێت. نوسراوە ئەکادیمییەکان هەندێ جار ڕۆدەچن لە ئاڵۆزکردن و خستنەڕووی بابەتە مەعریفییەکان بەشێوەیەکی وشک کە خەریکە وای لێدێت گەر کەسێک بە زمانێکی ساکار بنووسێت بە نوسەرێکی ڕوکاری (سطحی) سەیر دەکرێت نەک بە نوسەرێکی ڕەسەن (رصین).

بەهەمان شێوە سادەیی و ئاسانکاری زۆری لە ڕادەبەدەریش لە نوسیندا دەبێتە هۆی دابەزینی کوالێتی زانست و وادەکات مێشکی فێرخواز نەجوڵێنێت و بەشی بیرکردنەوەی بۆ نەهێڵێتەوە و هەموو شتێک بەحازری بێتە بەردەستی هەروەکو چۆن لە ئێستادا فێرخوازان بەبێ بەکارهێنانی ئامێری بژمێر ناتوانن مەسەلەیەکی لێکدانی ئاسان بزانن. ئەوانەی پرۆگرامی خوێندن دادەنێن بیانووی ئەوە دێننەوە کە پێویستە ئاسانکاری بکرێت بۆ تێگەیشتنی فێرخواز لە بواری پسپۆڕیەکەیدا، بەڵام ئەم ئاسانکارییە بەشێوەیەکە کە تەنانەت کەسێکی نەخوێنەوار و نا پسپۆڕیش لێی تێ دەگات، ئەو کاتیش ئاستی کوالێتی خوێندن زۆر دادەبەزێت.

لەڕاستیدا نمونەی مامۆستا و خوێندکار وەکو ئەوە وایە کە مامۆستا لە شوێنێکی بەرزی وەکو کەندەڵانێک بێت و خوێندکارەکانی لەلای خوارەوەی بن، لەم بارودۆخەدا مامۆستا چونکە شوێنەکەی بەرزترە لە خوێندکارەکانی بۆیە مەودای زانین و بینینی فراوانترە لە خوێندکارەکانی، جا یا ئەوەتا مامۆستا تەنها لە سەرەوە وەسفی ئەوە دەکات کە دەیبینێ بۆ خوێندکارەکانی کە لەلای خوارەوەن بەبیانووی ئاسانکاریی و سادەکردنی زانست بۆیان و زەحمەت نەدانی خۆی و ئەوان، یا ئەوەتا دەستیان دەگرێت و یەکە یەکە سەریان دەخات و پێیانەوە ماندوو دەبێت، ئەو کات خۆیان دیمەنەکە بەچاوی خۆیان دەبینن، پێشتر فێرخوازەکان لە خوار خۆیەوە بوون ئێستا هاوشانی ئەون، لەوانەیە زۆر باشتریش لە مامۆستاکەیان زانیاری لەبارەیەوە بزانن، بەڵام مامۆستای ڕاستەقینە دەخوازێت کە فێرخوازەکانی نەک هاوشێوەی خۆی بن، بەڵکو باشتر و درێژکراوەی ئەو بن. بەڵام ئەم جۆرە تێگەیشتن و بیرکردنەوەیە لە سیستمی پوچگەراییدا نابینیت.

**دووەم: بواری ئەکادیمی:**

دۆنۆ ئاماژە بەوەدەکات کە هەموو جەمسەرەکانی کۆنترۆڵکردنی ژیانی ئێستامان لەلایەن هیچ و پوچەکانەوە بە کۆنترۆڵکردنی ناوەندەکانی توێژینەوە و زانکۆکان و کۆلیجەکان دەست پێدەکات و کۆتایی دێت؛ سیستمی ئەکادیمی لە هەموو جیهاندا تەنانەت لە زانکۆ ناودار و ڕاقییەکانیش ئەمڕۆ بەدەست هیچ و پوچەکانەوەیە، لەوانەیە ئەم قسەیە خوێنەر تووشی شۆک بکات، بەڵام (دۆنۆ) جەخت لەو ڕاستییە دەکاتەوە کە بەڵێ ئەمە نەک تەنها بۆ وڵاتانی (دەوروبەر – جیهانی سێ)، بەڵکو لە وڵاتانی (سەنتەر- جیهانی یەکەم) ئەمریکای باکوور و ئەوروپاش ڕاستە.

(دۆنۆ) لەم ڕووەوە ئاماژە بە دوو گرووپ دەدات؛ یەکێکیان بە (ڕۆشنبیران) ناودەبات و ئەوی تریش بە (شارەزایان)؛ ڕۆشنبیران بریتین لە (دانا و زاناکان و توێژەران) کە وازیان هێناوە لە بوارە ئەکادیمییەکە و لێی کشاونەتەوە کە دیارە بەخۆشی خۆیان نییە، بەڵکو لەم سیستمە پوچگەراییەدا ئەوانە چیتر خوازراو نیین(غیر مرغوبین)، لە بەرامبەردا کەسانێک بەناونیشانی بریق و باقەوە شوێنیان گرتوونەتەوە کە ئەو بە (شارەزا- خبیر) ناویان دەبات و بریتین لە (پسپۆڕ و پرۆفیسۆر و دکتۆر)، ئەمە تەنها گۆڕانێکی سادە نییە لە ناوو ناونیشاندا، بەڵکو ئەمە شێواندنی ڕۆڵی ئەکادیمیا و لادانە لە پەیامەکەی و لە تاسکەکەی! چۆن؟ دۆنۆ دەڵێت ڕۆشنبیر کە بریتییە لە (دانا و زانا و توێژەر) چاوی لەسەر حەق و حەقیقەتە، شتەکان بە تەرازووی ویژدانی زانستیان دەپێون پێش حوکمدان لەسەری، بۆیە لاخۆشەویستکردن(ترغیب) و زۆرلێکردن(ترهیب) کاریگەری نابێت لەسەر بڕیارەکانیان، ئەو بڕیارەی دەیدەن بە ئازادانە و ئامانجدارانە دەیدەن بەشێوەیەک کە ویژدانی زانستی و پێگە ئەکادیمییەکەیان بخوازێت، بۆیە تەماحکردنە بەردەم کەسی دانا و زانا و توێژەری ئازاد هیچ گرنگیی و بایەخێکی نابێت، بۆیە لێرەوە ئەکادیمیا بە باشترین شێوە پەیامی خۆی و وەکو خۆی دەگەیەنێت و کاری سەرشانی ئەنجامدەدات و خزمەتی هەمووان دەکات بێ جیاوازی. بەڵام ئەم گرووپە هیچ خوازراو نیین سوود بە بازاڕ و سەرمایەدار و چینی دەسەڵاتدار  ناگەیەنن و پاڵپشتیان ناکەن.

لەبەرامبەر ئەمەدا دەبینین کەسی  بەناو شارەزا کە بریتییە لە (پسپۆڕ و پرۆفیسۆر و دکتۆر) ویژدانی خۆی دەفرۆشێت لە بەرامبەر بەرژەوەندی تەسکی خۆیدا و حەق و حەقیقەت دەکاتە قوربانی بەرژەوەندییەکانی خۆی و هاوکارەکانی، شارەزا ئامادەیە گونجاندن بکات لەپێناو بەدەستهێنانی بەرژەوەندیدا، ڕاستییە زانستییەکان بگۆڕێ، گزی و تەزویر بکات، بۆ مانەوەی خۆی و ئەوانەی دەستیان گرتووە بەسەر دەسەڵاتداو پارەداریو خاوەن هەژموونن، شارەزایان هێندەی دەستکەوتی ماددیان بەلاوە گرینگە هێندە پێگە و ڕێزی خۆیان بەلاوە گرینگ نییە، بۆیە لێرەوە ئەکادیمیا ڕووت دەکرێتەوە

لە کەسانی ڕۆشنبیر و بەکەسانی شارەزا پڕ دەکرێتەوە، چونکە ئەوان سوود بە بازاڕ و سەرمایەدار و دەسەڵاتداران دەگەیەنن و پاڵپشتیانن، ئیتر لێرەوە خوێندن و توێژینەوە زانستییەکانیش لە ناوەڕۆکی زانستی خۆیان لادەدەن، هەتا وای لێدێ پێشڕەوی بۆ خەڵکانی خوێڕیی و سەخیف و سەفیهـ دەبێت لەجیاتی داناو زانا، شوێنێک بۆ ڕاستی و ڕەوشت نامێنێتەوە. چیتر گرینگ نییە تۆ کەسێکی داهێنەر یا لێهاتوو بیت بۆئەوەی پلەکانی ئەکادیمی ببڕییت، بەڵگو ئەوە گرینگە کە بزانی چۆن یاری ئەکەیت و چۆن هونەری خۆ بردنە پێشەوە و ماستاوکردن و پشت شکاندنی ئەوانی تر بزانیت.

گرووپی یەکەم (ڕۆشنبیران) یەکەیەکە و بە زەحمەت و ڕەنجی شانی خۆیان پلەکانی خوێندن و ئەکادیمیایان بڕیوە، ئەو بڕوانامەیەی کە هێناویانە شەونخونی و هیلاک بوونە لەپێناویدا، هەوڵیانداوە خوێنەری جددیی و ورد و گشتگیر بن، هەرچەندە چیتر ئەمڕۆ ئەو توانایانە بێ ماستاوچێتی و کلکە لەقێی سودیان بۆ خاوەنەکانیان نابێت، لەکاتێکدا (شارەزایان) زۆریان شایستەی ئەو پێگەیە (منصب) نین کە بەهۆی پەیوەندییەکانیان و هێزی پارەوە بەدەستیانهێناوە، خۆ ئەگەر خاوەنی بڕوانامەی بەرزیشن هەر بەهۆی پەیوەندییەکانیان و بە پارە بەدەستیان هێناوە، هەندێکیان لە نوسینی ماستەرنامەکەی یا تێزی دکتۆراکەی هاوکاری کراوە تاڕادەی ئەوەی بەشێکی زۆری یا هەمووی بۆ نوسراوە لە بەرامبەر بڕێک پارەی باشدا، تەنانەت توێژینەوەکانیشی کە پەسەند کراون بۆ پلە بەرزکردنەوە هەر بەو میکانیزمە ڕۆیشتووە.

ئەوانە بێ ئەوەی قوڵ ببنەوە لە خوێندنەکەیان بڕوانامەی قەبە و نازناوی قەبەیان پێدراوە، ئەوانە خۆیان کەمیان پێیە و ناتوانن زۆری لێ ببەخشن بۆیە نەوەیەکی لە خۆیان کەمتر خوێنەوار ترو هیچ لەبارا نەبووتر بەرهەم دێنن، ئەو نەوەیەش وا ئەزانێ خوێندن و ئەکادیمیا هەرئەوەیە کە ئەم لە کەسێکی هیچ و پوچەوە وەریگرتووە، بۆیە هەر بەهیچ و پوچی دێتە بەرچاوی ئیتر نەوە لە دوای نەوە ئەم دەردە قوڵتر دەبێتەوە و پوچگەرایی دەبێتە شتێکی باو. هەمووان دەبن بە خاوەنی بڕوانامەیەک بۆئەوەی ببنە شارەزا، یا زۆرێک دەبنە خاوەن نازناوی زانستی بەڵام کەمێک دەبن بە خوێنەوار بۆئەوەی ببن بە ڕۆشنبیر و دانا و زانا. بەڵام ئیتر سەردەمەکەش ئەمانەی دەوێت و هەر بەمان دەڕوات بەڕێوە، بەڵێ ئەمان پیاوی ئەم ڕۆژەن.

پرسیار ئەوەیە: لە بەرژەوەندی کێ ئەم کارەساتەی بواری ئەکادیمیا بەڕێوە دەچێت؟ بۆچی سەنتەرەکانی زانست وایان پێدەکرێت؟ وەڵامەکە لای (دۆنۆ) ئەوەیە کە: هەموو ئەمانە لەپێناو خزمەتکردن بە بازاڕ دەکرێت، ئەمڕۆ جیهان دەوڵەمەند و پارەدار دەیبەن بەڕێوە، بۆیە ئەکادیمیاش دەبێت بە خزمەتگوزارێکی زەلیلی پارە و دەوڵەمەندان.

**سێیەم: بواری ئابووریی و بازرگانی**

دۆنۆ لە کتێبەکەیدا باس لە چالاکییە بازرگانییەکان دەکات کە هۆکارن بۆ داڕووخانی ڕەوشتی کۆمەڵگە لەم سەردەمەی ئێستادا، کە یاریدەدەر و پاڵپشتی سیستمی پوچگەراییین کە بە هەموو جومگەکانی ژیاندا شۆڕبببیتەوە. بۆ نموونە ئەو لەمبارەیەوە دوو سەرنجی هەیە، یەکێکیان سەبارەت بە گەڤەرنەرەنس(governance)، ئەوی تر دەربارەی پیشە (المهنة) و پێشەگەرییە (الحرفة).

ا- گەڤەرنەرەنس(governance)، لەڕووی تیۆرییەوە چەمکی گەڤەرنەرەنس لە دامەزراوە ئابوورییەکاندا جێبەجێ دەکرێت کە دەیەوێت هاوسەنگی لە نێوان ئامانجەکانی دامەزراوە لەلایەک و ئامانجەکانی کۆمەڵگە لەلایەکی تر بەدی بهێنێت، واتە ببێتە مایەی پاراستنی بەرژەوەندییەکانی هەموو ئەو کەس و لایەنانەی لە پرۆسەی بەرهەمهێناندا بەشداری دەکەن لە خاوەن دامەزراوە و بەڕێوەبەر و بازرگان و فەرمانبەر و پشکدار و کڕیار و...هتد، ئەویش لە ڕێگەی لێپرسینەوەو چاودێری چڕو پابەند بوون بە یاسا و ڕێساکان کە لایەنی چاودێر دایدەنێت. واتە ئەم چەمکە لە بنەڕەتدا بۆ ژینگەی بازرگانی دیزاینکراوە، بەتایبەت بۆ لە چوارچێوەدانی کۆمپانیا گەورەکانی بەریتانیا کە لە سەرەتای نەوەتەکان جێبەجێ کرا.

> میدیاکان وەکـو میکانیزمێك ڕۆڵی کـــاریگەریان هەیە لە سیستمی پوچگەراییدا، کاتێ کە هەواڵێك بڵاودەکاتەوە بەشێوەیەك دایدەڕێژێت گونجاوبێت لەگەڵ بۆچوون و ئاڕاستەی سیاسیی و ئایدۆلۆژی دەزگاکە.



بەڵام کە (مارگرێت تاتشر) لە بریتانیا بوو بە سەرۆک وەزەیران و حوکمی تەکنۆکراتی پیادە کرد، ئیتر ڕەنگدانەوەی چەمکی گەڤەرنەرەنس لەسەرشێوازی بەڕێوەبردنی وڵاتیش دەرکەوت، واتە لەسەر سیاسەت، بەشێوەیەک چەمکی سیاسەت گۆڕا بۆ گەڤەرنەرەنس، لێرەوە سیاسەت لە مانا و ئەرکەکەی خۆی خاڵی کرایەوە کە بریتییە لە پاراستنی حەق و ڕاستی و بەجێهێنانی ئەرک و پابەندبوون بە بەهاو بەرژەوەندی گشتیی و چاکەی گشتییەوە. چەمکەکانی (خواستی گەل، چالەکەوانی سیاسی، هاونیشتیمانی، نەخۆش) یەک لەدوای یەک گۆڕان بۆ (ڕەزامەندی کۆمەڵگە، کۆمەڵەکانی فشار، هاوبەش، کڕیار).

ئیتر وردە وردە گرنگیدان بە بەرژەوەندی گشتیی و کاروباری گشتیی و سیاسی و بەها سیاسەکان تەنها بوون بە جۆرێک لە کارگێڕی و بەڕێوەبردن، بۆیە کاروباری گشتی خاڵی بوویەوە لە ڕەوشت و بەها و نمونەی باڵا و هاونیشتیمانی بوون و





پابەندبوونی خۆویستانە، خەمی گەورەی حکومەت گۆڕینی خاوەنداریێتی کەرتە گشتییە جۆراوجۆرەکان و پرۆژەکان بوو بە ئاڕاستەی کەرتی تایبەت، بە بیانووی کەمکردنەوەی بارقورسی لەسەر شانی حکومەت و قازانجکردن و زیادکردنی داهاتی حکومەت، وەکو ئەوەی بڵێیت حکومەت تەنها بریتی بێت لە کۆمپانیایاکی بازرگانی. هەموو هەوڵێکی تەنها بۆ زیادکردنی داهاتی حکومەت و کەمکردنەوەی خەرجیەکانییەتی بێ ئەوەی ڕەنگدانەوەی لەسەر باشترکردنی دۆخی ناهەمواری ماددی خەڵک هەبێت یا خزمتگوزارییەک بەبێ بەرامبەر پێشکەش بکات.

ئەوەی جێگەی گاڵتەجاڕیە بریتییە لە بانگەشەکردن بۆ هەندێ چەمک کە تەنیا ناوەکەی دەبیسیتین و ناوەڕۆکەکەی دیارنییە، وەکو شەفافیەت و لێپرسینەوە و چاکسازیی و دەستەی دەست پاکی و...هتد. بگرە سەرەڕای دەرکەوتنی ئەم هەموو چەمکە زەقانە کەچی هیچ کات هێندەی ئێستا قەبارەی گەندەڵی لە زیادبووندا نەبووە.

٢- لەناوچوونی پیشەگەری (حرفە) ودەرکەوتنی پیشە (مهنە)

یەکێک لەو هۆکارانەی کە سیستمی پوچگەرایی قوڵتر کردۆتەوە پەیوەندی هەیە بە مەسەلەی ڕێکخستنی بازاڕ لەلایەن سیستمی سەرمایەدارییەوە، سەرمایەداری ڕێچکەی فەلسەفەی (فۆن هایک)ی گرتۆتەبەر کە پێیوایە بازاڕ لەخۆوە بە شێوەیەکی خودکارانە دەڕوات بەڕێوە بەبێ دەستێوەردانی دەوڵەت، بەڵکو ئەرکی دەڵەت تەنها لە سێ وەزیفەدا کۆدەبێتەوە ئەوانیش بریتین لە؛ پاراستنی ئاسایشی ناوخۆ و دەرەوە لەگەڵ دادوەری کردن، کە پێشی دەوترێت (وەزیفەی پاسەوانی شەوانە)، ئیتر ئەوەی دەمێنێتەوە لە کاروبار جێیدەهێڵێت بۆ میکانیزمەکانی بازاڕ، ئەڵبەتە ئەم بۆچوونە تەواو جیاوازە لە بۆچونی (جۆن کینز) کە لەگەڵ دەستێوەردانی دەوڵەتدایە بەتەواوەتی بۆ ڕێکخستنی بازاڕ.

نوسەر پێیوایە کە ئازادکردنی بازاڕ کاریگەری هەیە بەسەر سیستمی کارکردنەوە بەشێوەیەک کە چەمکی کار (labor) گۆڕانکاری بەسەردا هاتووە؛ چی دیکە پیشەگەری بوونی نەماوە بەڵکو ئەوەی هەیە تەنها پیشەیەکە بۆ پەیداکردنی بژێوی ژیان بێ ئەوەی کەسی خاوەن پیشە شارەزاییەکی ئەوتۆی لە وردەکاری ئەو کارە هەبێت کە دەیکات، هەروەک دەڵێت:» پیشەگەری ونبووە، ئەگونجێ کەسانێک چەندین ژەمی خۆراکی بەرهەم بهێنن بەهۆی ئامێرەوە لە کارگەیەکدا کە هیچ لەبارەی خواردن سازکردن نازانن لەماڵەوە، یا کەسانێک ڕێنمایی بکەن لە ڕێگەی تەلەفۆنەوە بۆ ڕاپەڕاندنی کاری کۆمپانیایەک کە خۆشیان نازانن واتەکەی چیە(٣)، یا کەسانێک کتێب و ڕۆژنامە بفرۆشن کە هەرگیز خۆیان نای خوێننەوە«.

هەربۆیە لەڕێگەی ئەم جۆرە پیشەیەوە ناتوانرێت دەوڵەمەند بیت، چونکە ناتوانیت پەی بە نهێنی بنەڕەتی کارەکە ببەیت، لەهەمانکاتدا دەوڵەمەندەکان زیاتر و زیاتر دەوڵەمەند ئەبن و فرسەتی زیاتریان بۆ ئەڕەخسێ بۆ گەشەکردن و بەرفراوان بوون.

**چوارەم: بوارە ڕۆشنبیرییەکان**

نوسەر بایەخێکی زۆر بە بوارە ڕۆشنبیرییەکان دەدات کە پێیوایە وەکو میکانیزمێکی کارا بەکاردەهێنرێن بۆ تۆخ کردنەوەی سیستمی پوچگەرایی، لێرەدا نووسەر ئاماژە بە چەند لایەنێکی ڕۆشنبیری دەدات وەکو زمانەوانی و میدیا و سۆشیال میدیا و هونەر.

**١. زمانەوانی**

لەڕووی زمانەوانییەوە هەندێ وشەی بریقەدار لەبری هەندێ وشەی دیکەی نەویستراو لای کۆمەڵگە و ڕای گشتی بەکاردەهێنرێت بۆ ئاساییکردنەوەی چەمکەکە و قبوڵکردنی لای خەڵکی بەڵام کاریگەرییە نەرێنییەکانی هەروەکو خۆیەتی(٤)؛ بۆ نمونە گۆڕینی چەمکی (حکومەتی عەلمانی) بۆ (حکومەتی مەدەنی)، گۆڕینی وشەی (سوو) بۆ(قازانج)، هەندێ جار لەوانەیە بەکارهێنانی وشە ڕاستەقینەکە بێزراو بێت، بەڵام بەم گۆڕینە ئاسایی دەبێتەوە لەکاتێکدا هەر هەمان ناوەڕۆکی هەیە، وەکو گۆڕینی وشەی (کوشتنی دوژمنان) بە (لەناوبردنی دوژمنان یا پاکردنەوەی دوژمنان).

**٢. میدیا و سۆشیاڵ میدیا**

میدیاکان وەکو میکانیزمێک ڕۆڵی کاریگەریان هەیە لە سیستمی پوچگەراییدا، میدیا کاتێ کە هەواڵێک بڵاودەکاتەوە زیاد و کەمی ئەکات، بەشێوەیەک دایدەڕێژێت کە گونجاوبێت لەگەڵ بۆچوون و ئاڕاستەی سیاسیی و ئایدۆلۆژی دەزگاکە، یا پاراستنی بەرژەوەندییە ئابوورییەکانی، گونجاو بێت لەگەڵ ڕای زۆرینە و قبوڵی گشتی هەبێت. ڕۆژنامەکان ناونیشانی بریقەدار هەڵدەبژێرن بۆ ڕاکێشانی سەرنجی خوێنەر، بەڵام کاتێ دەیخوێنیتەوە هیچ زانیارییەکی ئەوتۆی تێدانیە، هاوشێوەی سەراب لە دوورەوە ئاو ئەبینی، بەڵام کە پێی دەگەیت هیچ ئاوێک لەوێ نییە.

میدیا جۆرێکە لە پیشەسازی، هەمیشە بەدوای بەرژەوەندیی و قازانج و بازاڕگەرییەوەیە، چی بازاڕی گەرم بێت بەدوای ئەوە دەکەوێت، بۆیە دەبینی گرینگییەکی ئەوتۆ بە بابەتە چارەنووسسازەکان یا کێشە ڕاستەقینەکانی کۆمەڵگە نادات، بەڵکو بەپێچەوانەوە هەوڵی لەبیربردنەوە و وەلانانیان دەدات و سەرقاڵیان دەکات بە بابەتی ڕابواردن (ترفیه)و ژیانی تایبەتی و نهێنی و ئابڕوچوونی ناوداران، یا دەنگوباسی هونەرمەندان و وێنەی نیمچە ڕووت و شێوازی ژیانیان بڵاودەکاتەوە، هەموو ئەمانە سەرقاڵکردنی خوێنەر و بینەرە بە پوچترین باسەوە کە هیچ سوودێکی بۆیان نیە. جگەلە زیان و بەهەدەردانی کات و پارەکانیان، لەوانەیە هەندێک کەس خە م و پەژارەش دایان بگرێت کاتێ دەبینن ئەو کەساسەتییەی پێی سەرسام بوون ڕووبەڕووی قەیرانیکی دارایی یا ئەخلاقی بونەتەوە. لەوانەشە بگاتە حاڵەتی بەکارهێنانی توندوتیژی ئازاردانی بەرامبەر و بگرە خۆکوشتنیش.

تەنانەت هونەریش بە هەموو جۆرەکانییەوە (نواندن و گۆرانی و شێوەکار و

وێنەکێش و مۆسیقاژەن و...هتد) ئەو جوانییەی خۆی لەدەستداوە، وشەی نەشیاو و نمایشی جەستەو خۆبادان و بزواندنی هەستی سێکسی تیایدا زاڵە، بەناوی هونەر و نوێگەریی و بوێریی و شکاندنی ڕێچکەی کۆن، کار لەسەر لەناوبردنی بەها ئەخلاقییەکان ئەکەن، دابونەریتی باب و باپیران دەسڕنەوە، گەر وانەکەن ئەوا بینەر و بیسەریان نابێت. بەواتایەکی تر دەستکەوتی ماددیان نابێت.

سەرباری ئەمە پاڵپشتی هەرە بەهێزی سیستمی پوچگەرایی سۆشیال میدیایە، چونکە سۆشیاڵ میدیا کەسانێکی هیچ لەبارانەبوو، ناتەبا لەگەڵ نەریت و دین و بەها مرۆڤایەتییەکان لە شێوەی کەسانی سەرکەوتوو نمایش دەکات، بەڵێ سەرکەوتوو لە دەستکەوتنی پارەیەکی بێشومار، بەڵام ڕووخاو لە کەسایەتی و مەعریفە، ئەم جۆری سەرکەوتنە پێوەرە مرۆییەکانی سەرکەوتن دەخاتە ژێر گومانەوە کە بریتین لە کاری جددیی و تەواوکردنی پلەکانی خوێندن و خۆ پرچەککردن بە زانست و ئەدەبیات و هونەر و وەرزش و چاکەی گشتی و هاوڵاتیبوونی چاک و جوان ڕەفتاری ...هتد.

**پاڵپشتی هەرە بەهێزی سیستمی پوچگەرایی سۆشیال میدیایە، چونکە سۆشیاڵ میدیا کەسانێکی هیچ لەبارانەبوو، ناتەبا لەگەڵ نەریت و دین و بەها مرۆڤایەتییەکان لە شێوەی کەسانی سەرکەوتوو نمایش دەکات.**



ئەمرۆ بەهۆی زاڵبوونی مادیاتەوە چاوی کۆمەڵگە بەتایبەت گەنجان تەنها پێوەری دەستکەوتنی پارە لەبەرچاو ئەگرێ بۆ گەیشتن بە حەز و ئارەزووەکانی، کەسیش ناتوانێ نکۆڵی لەوە بکات کە کچە مۆدێل و کەسە بەناوبانگەکانی سۆشیال میدیا پارەیەکی باشیان دەست دەکەوێ بۆیە بەسەرکەوتن دەدرێت لەقەڵەم. جا لەوە کارەسات تر ئەوەیە بەهۆی میدیا و سۆشیال میدیاوە کەسانێکی هیچ لەبارا نەبوو دەبنە پێشەنگی خەڵکی و منداڵ و مێردمنداڵان لاساییان دەکەنەوە، ئەم کەسانە پشتگیری ماددی دەکرێن لەلایەنێکی گوماناوییەوە، هەیانە هەموو داهێنانەکەی تەنها بریتییە لە خۆ نمایشکردنی جلوبەرگ و جەستەی و هەیانە بە وتنی نوکتە و قسەی فشقیات و هەشیانە بە خۆبادان بەو سامانەی کە کەس نازانێ چۆن دەستی کەوتووە ناوبانگی دەرکردووە!

**٣. خوێندنەوە**

هەروەها بەهۆی سۆشیال میدیاوە خوێندنەوەی قووڵ نەماوە کەم کەس توانا و حەوسەلەی خوێندنەوەی کتێبێکی چەند سەد پەڕەیی ماوە، چونکە فێرە تەنها پەرەگرافێک یا دووان لە واڵی پێگەیەک یا کەسێک بخوێنێتەوە، دەبینین کاتێ خوێنەر چەندین بابەتی جۆراوجۆر لە ماوەیەکی کورتدا دەخوێنێتەوە کە دوورن لەیەکەوە لە ناوەڕۆک و ئامانج و بەهادا وا ئەزانێ ئەمە زانیاریی و ڕۆشنبیری گشتی پێ زیاد ئەکات، بەڵام لە کۆتایی ڕۆژەکە شەکەت دەبێت و هەست ئەکات هیچی دەستگیر نەبووە. بۆیە ئەمە بەشێکی پەیوەندی هەیە بە بە جۆری خوێنەرەوە کە ئەکرێت ئەویش بە (خوێنەری پوچگەرا) ناو ببەین یا بە (نەخوێنەواری نوێ) کە سرووشتی وەکو مێش وایە لە هەموو شتێک دەنیشێتەوە. وا هەست ئەکەن زۆرزانن، بەڵام زۆر نزیکن لە هێڵی هەژارییەوە لەڕووی مەعریفەوە، فریودراون بەو ناونیشانە بریقەدارانەی کە ڕۆژنامە و سۆشیال میدیا بڵاوی ئەکەنەوە، ئەم جۆرە خوێنەرانە هێندەی تر هێز دەدەنەبەر بە سیستمی پوچگەرایی.

لە ئێستادا دیاردەی ناونیشانی بریقەدار لە کتێبەکانیشدا بە زەقی دەبینرێن، کتێبێک دەبینیت ناونیشانەکەی ورد و بەهادارە لەڕووی زانستییەوە پێتوایە ئەمە ڕێک ئەو بابەتە زانستییەت بۆ یەکلادەکاتەوە کە تۆ بەدوایدا وێڵی، بەڵام لە ناوەڕۆکدا ناگەیت بەهیچ، بۆیە کاتێک کتێبێکی لەوجۆرەت بەرچاو دەکەوێت دڵت زۆر پێخۆشە بەڵام کاتێک دەیخوێنیتەوە سەیر دەکەیت هەڵخەڵەتاویت.، ئەمە سەرەڕای دەرکەوتنی چەندین کتێب بەناونیشانی سەرنجڕاکێش کە گەنجان دەکاتە ئامانج و هەوەسبازی تیایدا زاڵە، هەموو ئەمانە تەنها بۆئەوەی سەرنجی خوێنەر ڕابکێشێت و پڕفرۆش بێت،

نووسەر بە وردی پەنجە دەخاتە سەر بارودۆخی ئێستای گەلانی دونیا و پێیوایە هەوڵی سیستمی پوچگەرایی بریتییە لە خەریککردنی خەڵکی بە وردەکاریی کارە لابەلاو پوچەکانەوە و گرینگی پێدانیان و زەقکردنەوەیان و نیشاندانیان بە گرنگ و بایەخدار. بەڵام لێرەدا پرسیاری سەرەکی ئەوەیە  ئایا ئەوەی هەیە بریتییە لە دەرئەنجام یا خود هۆکار، هۆکاری برەوپەیداکردن و تەشەنەکردنی چیە؟  تۆی خوێنەر کاتێک ئەم وتارە دەخوێنیتەوە دڵنیام درک بە هەموو ئەو بابەتانە دەکەیت کە باسکراون و دێتە بەرچاوت لە دەوروبەر ئەو ژینگەیەی تێیدا دەژیت و لەو ناوەندەی کاری تێدا دەکەیت، بەڵام ئەوەی کە گرنگە بریتییە لە وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارە: ڕێگە چارەسەر چیە بۆ چاککردنی بارودۆخەکە و گرتنەبەری ڕاستە ڕێ؟




## پەراوێز و سەرچاوەکان

١. بۆ نوسینی ئەم وتارە بە پلەی یەکەم سوود لە کتێبی (سیستمی پوچگەرایی- La médiocratie نظام التفاهة) بینراوە، بەڵام ناتوانین بڵێین وتارەکە خوێندنەوەیەکی تەواوە بۆ ئەو کتێبە، چونکە من وەکو نوسەری وتارەکە تێزە سەرەکییەکانی کتێبەکەم وەرگرتووە و زیادەم خستۆتە سەر، چونکە پێموابوو ئەو خستنە سەرە پێویست بوو بۆ ڕوونکردنەوەی مەغزای نوسینەکە و دەرخستنی هەندێ ئامانجی کتێبەکە کە بۆی نوسراوە. کتێبەکە بیرمەند و فەیلەسوفی کەنەدی (ئالان دۆنۆ) لە ساڵی ٢٠١٥ بە زمانی فەڕەنسی نوسیویەتی، بە وەرگێڕانی زمانی عەرەبی بەردەستە کە دکتۆرە (مەشاعل عەبدولعەزیز هاجری) کردوویە بە عەرەبی و لە ساڵی ٢٠٢٠ چاپکراوە. ئالان دۆنۆ لەدایکبووی ١٩٧٠، هەڵگری بڕوانامەی دکتۆرایە و مامۆستایە لە بەشی کۆمەڵایەتی/ کۆلیجی زانستە ڕامیارییەکانی زانکۆی کیوبیک لە کەنەدا، نوسەرێکی چەپە و نوسینەکانی دژی سیستمی سەرمایەدارییە: لای خوارەوە لینکەکەی دادەنێم بۆ ئەو بەڕێزەی حەز ئەکات تەواوی کتێبەکە بخوێنێتەوە، لینکی کورتکراوە بۆ داگرتنی کتێبەکە:

https://bit.ly/3ltjYTL

٢. محمد ناصر الدين الألباني, المكتب الإسلامي – بيروت الطبعة: الثالثة، سنة الطبع ١٤٠٨هیجری ، رقم الحديث (٣٦٥٠).

٣ لەمبارەیەوە چەندین کۆمپانیای بواری بازاڕگەری هەیە لە ئەوروپا بانگەشە بۆ شمەکەکانی دەکات، یاخود وەڵامی کڕیاران دەداتەوە لە ڕێگەی چەندین فەرمانبەرەوە کە لە وڵاتی هیند دەژین بەهۆی ئینتەرنێت و تەلەفۆنکردن ئەویش بەهۆی هەرزانی دەستی کار لە وڵاتی هیند، تەنانەت کۆمپانیا هەیە لە بواری دابینکردن و بەکرێدانی تەکسیدا فەرمانبەرەکانی لە هیند دەژین لەڕێی نەخشە و جی پی ئێس کارەکەیان ڕادەپەڕێنن، بۆیە ئەم فەرمانبەرانە نە شمەکەکانیان بینیوە نە ئەورووپاش.

٤. هەروەک لە فەرمایشتی پێغەمبەر(د.خ) هاتووە کەسانێک مەی حەڵاڵ دەکەن ناوێکی تری لێدەنێن، کە دەفەرموێت: إنَّ أوَّلَ ما يُكفأُ قالَ الرَّاويُّ يعني الإسلامَ كما يُكفأُ الإناءُ يعني الخمرَ قيلَ فَكيفَ يا رسولَ اللَّهِ وقد بيَّنَ اللَّهُ فيها ما بيّن قالَ يسمُّونَها بغيرِ اسمِها فيستحلُّونَها. حديث حسن، رواه عائشة أم المؤمنين، ابن حجر العسقلاني، تخريج مشكاة المصابيح، الرقم: ٥/٨٥.




دەمەتەقێی گوڵنار لەگەڵ پڕۆفیسۆر کەریم شەریف قەرەچەتانیی

## لەمەڕ (پەرەسەندنی پووچگەرایی لە جیهاندا)

# سیستەمی پوچگەرایی نازناوی قەبە دەدات بە مرۆڤەکان، بەڵام ناوەڕۆکیان بەتاڵە



**گوڵنار: سەرەتا دەپرسین زەمینەسازیی و هۆکارەکانی گەشەی پووچگەرایی چین؟ یا ئەو پاڵنەرانە چین کە وایانکردووە پووچگەرایی وردە وردە ببێتە مۆرک و سیمای کۆمەڵگە و تاک و خێزان؟**

قەرەچەتانیی: ئەمڕۆ لە هەموو دونیادا هەمووان هەستیان بەو پووچگەرایەتییە کردووە، کۆمەڵناسێکی کەنەدیی – دانیشتووی فەڕەنسا، ئالان دۆنۆ، کتێبێکی دەرکردووە بەناوی (سیستەمی هیچوپووچ – نظام التفاهة) ئەو مەبەستی ئەوەیە بڵێت: ئێمە ئێستا لە سەردەمێکدا دەژین هەموو ئەوانەی کە حوکم دەکەن لە بواری ڕاگەیاندن و ئابووریی و کۆمەڵایەتیی و زانستدا، ناوەڕۆکەکەیان پووچەڵە. لە هەموو ئاستەکاندا، بۆ نمونە لە ئاستی سیاسیی، ئەگەر تۆ سەیری بکەیت، جاران کەسانی بەناوبانگی وەک: چەرچڵ و ماندێلا و غاندیی لە سیاسەتدا قووڵبوونەوە، خەڵکیش ئەوسا کەسانێکیان هەڵدەبژارد کە بە هەموو واتایەک سیاسیی بوونایە. بەڵام ئێستا دۆناڵد ترامپ دەبێتە سەرۆکی گەورەترین وڵات، کە ئێوە دەزانن سەرچاوەی هەموو داهات و سەرمایەی وڵاتەکەی قومارخانە و مەلها و باندی مافیایە. بۆیە کۆمەڵگەکەیان وا ئاڕاستەکردووە و وا گۆشیانکردووە، نازانن کێ هەڵبژێرن تا حوکمیان بکات؟!

**گوڵنار: ئەم سیستەمە کار لەسەر چی دەکات؟**

قەرەچەتانیی: ئەم سیستەمە لەسەر سەرمایە دەچێت بەڕێوە، ئەی سەرمایە کێ دەگرێتەوە؟ کەسێکی وەک دۆناڵد ترامپ. ئەم کابرایە لە جیاتیی ئەوەی هەموو سەرمایەکەی بریتیبێت لە ئەخلاق کە ئێمە بڕوامان پێیەتی، لە جیاتیی ئەوەی ڕەهەندی ڕووحیی و مەعنەویی بێت، بریتییە لە ڕەهەندە ماددیی و تەکنەلۆژییەکەی. ئێ ئەم ئامانجەش – ڕەهەندی ماددیی و تەکنەلۆژیی و دوورکەوتنەوە لە ڕەهەندی ڕووحیی و مەعنەویی – پێویستی بە ئامادەکردن و پێشخستنی خەڵک هەیە، دەی تۆ سەرنج بدە بزانە ڕاگەیاندنەکان چۆن هەر هەموویان لە خزمەت ئەم سیستەمە هیچوپووچەدان؟! بۆ نمونە مۆدێرنە، کامەی هیچگەرایی بێت و بەس گرنگیی بە جەستەی و ڕواڵەت و دیوی دەرەوەی بدات، ئیتر دیوی ناوەوەی پووچ و بەتاڵ بێت، ڕۆژبەڕۆژ گەشە دەکات و دەچێتە پێشەوە. تەنانەت دێن بۆی دروست دەکەن، تەنانەت دێن نمونەی مرۆڤەکان لە شکڵ و سەروسیمادا چۆنبن، بەو جۆرە شتی بۆ دروست دەکەن، کۆمەڵێک باڕبین و بووکەڵەیان دروستکردووە تا مرۆڤەکان چاویان لێبکەن و بەوشێوەیە بن. جاران لە تەواوی دونیادا و لە کوردەواریی خۆشماندا، ئافرەتێک خرپن و گۆشتن و قەڵەوبووایە، زۆر خوزراو و مەرغووب بوو، ئێستا وایان لێکردووە کە بەوجۆرە دەربکەوێ بۆئەوەی سەرمایەکەی ئەوان لە گەڕدا بێت، هەزاران سەنتەری ڕەشاقە و لەشجوانیی و سەدان داو و دەرمانیان داهێناوە بۆ ئەو مەبەستە، دەیانەوێ مرۆڤەکان بەوجۆرە هەڵسن و دانیشن، بیربکەنەوە و بخۆن، بژین و بڕۆن و بپۆشن، کە سەرەنجام بە ئاڕاستەی

سیستەمە هیچوپووچەکە بێت و گوێزەکان بخەنە سەبەتەی ئەوانەوە! ئەم سیستەمە دەستیوەرداوەتە بچووکترین شتمانەوە، دەستی بۆ سەرەتاییترین مافی ئێمە بردووە کە خواردنەکەمانە، تۆ سەرنج لەو هەموو ڕیکلامانە بدە، چ خواردنێک دەخۆیت، چی ناخۆیت، چیت پێدەکەوێ؟! جاران کوا ئەم هەموو شتە بوونی هەبوو؟! خەڵکی زوو کوا کێشەیان هەبوو بەناوی (ڤیتامین دی) و هەر ناتەواویکی تری جەستەییەوە؟ ئێستا وایان تێگەیاندووی و تەڵقینیان داداوی، کە ئەوە شتێکە تۆ هەر دەبێت بیخۆیت، وایان لێکردووی ناتوانی سوود لە تیشکی خۆرەکەش وەربگری. مەبەستم ئەوەیە سیستەمەکە قاڵب و چوارچێوەیەکی دروستکردووە و خەڵکەکە لە خۆی دەگرێ، دەبێ ئەو خەڵکەش بە جۆرێک ئاڕاستە بکەی و بە جۆرێک بژین، کە لەگەڵ سیستەمەکەدا بگونجێن.

**گوڵنار: باشە ئەم سیستەمە ئەم هەموو توانا و دەسەڵاتەی لە کوێ بوو؟**

قەرەچەتانیی: تۆ سەرنج بدە لە ڕێی ڕیکلامەوە، ئەوانەی بیانەوێ بە ئارەزووی خۆیان گەورەی دەکەن، تەنانەت سیستەمەکە خۆی دەڵێت: پێویستت بەوە نییە لە ڕاگەیاندندا مەوهیبە و بەهرەت هەبێت، بەس پێویستت بەوە هەیە لە سیستەمە هیچوپووچەکەدا ئیش بکەیت و بە شانوباڵی ئەواندا هەڵدەیت، بۆیە دەتوانن لە ماوەیەکی زۆر کەمدا بتکەن بە پێشەنگ. تەنانەت لە بواری زانکۆ و ئەکادیمییشدا، دەڵێت: جاران کە کەسەکان لە بواری ئەکادیمیدا بوون، زانا و عالم بوون، حەکیم و خەبیر بوون، دانا و لێزان بوون، بەچی ئیشیان دەگرت؟ ویژدانیان پێوەر و بنەما بوو، کۆمەڵێک پرەنسیپی ناوەکییان هەبوو ئەو پرەنسیپانە لە ناواخندا ئیشەکانیان دیاریی دەکردن. ئێستا لە بەرامبەر ئەوانەدا چییان دروستکردووە؟ لە بەرامبەر حەکیمدا پسپۆڕیان دروستکردووە، لە بەرامبەر دانا و زانادا هاتوون خەبیریان دروستکردووە، بەڵام خەبیریش نەک بۆ بەرژەوەندیی گشتیی، بەڵکە بۆ جوانکردنی ئەو سیستەمە هیچوپووچە. ئێستا سەیری بکە زۆرجار لێکۆڵینەوە و توێژینەوە دەکەن بۆئەوەی بیسەلمێنن کە فلانە دەرمان بەسوودە و باشە، بەو ئاڕاستەیەدا دەیکەن کە لە بەرژەوەندیی فلانە کۆمپانیادا بێت، تەنانەت عیلم و زانستەکەشیان خستووەتە خزمەتی سیستەمە هیچوپووچەکە و سیستەمی سەرمایەداریی.

**گوڵنار: کەواتە ئەو سیستەمە ئامانجییەتی مرۆڤێکی داماڵراو لە هۆشیاریی و عەقڵ و زانست بەرهەمبهێنێت بۆ بەرژەوەندیی خۆی و بۆ ساغکردنەوەی بەرهەمەکانی و بەدیهێنانی ئامانجە کەسییەکانی خۆی؟ ئایا هیچ پەیوەندییەک لە نێوان سیستەمە سەرمایەدارییەکە و سیستەمە هیچوپووچەکەدا هەیە؟**

قەرەچەتانیی: بەڵێ، بەڵێ زۆر وایە، پەیوەندییەکی ڕاستەوخۆ و نزیک هەیە لە نێوان ئەو دوو سیستەمەی کە ناوتهێنان. یا بە شێوەیەکی تر ئەگەر ئەم کەسە هیچوپووچانە نەبێت ئەم سیستەمە سەرمایەدارییە گەشە ناکات. تۆ زانایەک لە زانکۆ بهێنە، چونکە ویژدان و ئەخلاقی هەیە، کۆمەڵێک مەبدەء و پرەنسیپی مرۆڤیی خۆی هەیە، ناچێت ڕێکلام

و پڕوپاگەندە و توێژینەوەی دروستکراو و ساختەکراو بکات، بۆئەوەی ئەم کارگە و کۆمپانیایە قازانج بکات، کەسی ئاوا ئەو شتانە ناکات. ئینجا لەم سیستەمەدا تۆ دەبێت وردە وردە مرۆڤەکان بگۆڕی و لە جەوهەرەوە بیهێنیت بۆ ڕواڵەت. تۆ مامۆستایەکی زانکۆی، ناتوانی لێکۆڵینەوەیەکی زانستیی ساختە بنووسی یا بەسەرتدا تێپەڕببێت بۆ بەرژەوەندیی خوێندکارێک. ئێستا تەنانەت لە کوردستاندا بە سەدان پڕۆفیسۆرمان هەیە، بەڵام من پێتدەڵێم لە سەدا نەوەدوپێنجی ئەوانە هەر شیاوی ئەوەش نین مامۆستا بن، چ جای ئەوەی ببنە پڕۆفیسۆری زانکۆ! بەڵام لەم سیستەمەدا هەموو شتێک جێیدەبێتەوە، جاران هەموو لێکۆڵینەوەکان لای ئێمەی شارەزایان بوو، بەڵام ئێستا چەندان گۆڤاری فەیک و ساختە هەن لەو ئەمریکا و بەریتانیایە. چەندین کەس لای ئێمە دەچن بۆ بەریتانیا و ئەمریکا بەناوی تواناسازییەوە لەوێ دەخوێنێت، خەڵکەکەی ئەوێ کە دەزانێ ئەم خوێندکارە دەگەڕێتەوە بۆ عێراق و ڕۆژهەڵات، زۆرجار بەحس و لێکۆڵینەوەکان بەو خوێندکارە دەفرۆشن! بۆ ئەوەی کەسێکی بوودەڵە دەربچێت، کەسێکی زانستخواز و زیرەک و پەیامدار دەرنەچێت، چونکە تۆ دەچیتە زانکۆ، دەبێت خەڵک و خوێندکارەکانت بەرەو سیستەمە هیچوپووچەکە ئاڕاستە و ڕێنمایی بکەیت. سیستەمی هیچوپووچ کۆمەڵێک لەقەب و نازناوی قەبە و گەورە دەدات بە مرۆڤەکان و دەیانکات بە پڕۆفیسۆر و دکتۆر، بەڵام ناوەڕۆکێکی بۆش و بەتاڵی هەیە! جاران ئوستازی زانکۆ، حەکیم و خەبیر و دانا و زانا بوو، پڕۆفیسۆر بە واتای وشە پڕۆفیسۆر بوو، بەڵام ئەم سیستەمە سەرمایەدارییە بەس ئیشی لەسەر ئەوە کردووە کە زانست و بڕوانامەکە سووک و کرچ و کاڵ بکات. سیستەمەکە نایەوێ کەسێک، بڕوانامەیەک، ناوەندێک ئەسالەت و ڕەسالەت و ئەکادیمییەتی تێدا بێت و سەنگینییەکەی جارانی نەمێنێت. تەنانەت لە سیاسەتیشدا، لە وڵاتانی دونیا ئەوانەی حوکم دەکەن، جاری وا هەیە وایان لە خەڵکەکەش کردووە کە نەزانێ کێ هەڵبژێرێ، چونکە لە وڵاتانی دونیا و لە کوردستانی ئێمەشدا ڕەهەندە ماددییە بەرژەوەندییخوازییەکە زاڵبووە بەسەر ڕەهەندی مەعنەویی و ڕووحی و ئەخلاقییدا، زۆر بەهای مەعنەوییمان لەدەستداون. ئەگەر ئەم سیستەمە، سیستەمێکی هیچوپووچ نەبێت، چۆن لە وڵاتانی ئەورووپیی ژن شوو بە سەگ دەکات، یا هاوڕەگەزخوازیی برەوی پێدراوە؟! ئەی کوا ئەو بەهایەی کە خوای گەورە فەرموویەتی: (لقد كرمنا بنى آدم)؟! مرۆڤ زۆر گەورە و زۆر پیرۆزە، بەڵام ئەوان و ئەو سیستەمەش دەیانەوێ ئەو پیرۆزییە لە مرۆڤ بسەننەوە، چونکە تا ئەو کاتەی مرۆڤ گەورە و پیرۆز و خاوەن ئامانج بێت، نابێتە پاروویەکی چەور بۆ بەرژەوەندیی و چێژی ئەوان.

(سکینەر) زانایەکە و ئێستا لە ژیاندا نەماوە، تەبعەن زۆر شتی لەسەر ڕژێم و پرەنسیپەکانی مەدرەسەی سلووکیی هەیە، کە مەدرەسەیەکی ئەمریکییە لە دەروونزانیدا و سکینەر و واتسن دامەزرێنەرین، سکینەر دەڵێت:» ئەوەی کە دەگوترێت ئەخلاق و شەرەف، هیچ بنەمایەکی نییە، هەمووی درۆیە و دروستکراوە، من دەتوانم لە ڕێی سزا

و پاداشتەوە، کامەی پێیدەگوترێت ئەخلاقی بەرزە، ئەخلاقەکەی نەهێڵم! چۆن مشکێک لە تاقیگەدا کۆنترۆڵ دەکەم، دەتوانم بەو شێوەیەش مرۆڤەکان کۆنترۆڵ بکەم»! یانی ئەو بەها ئەخلاقیی و ویژدانیی و مەعنەوییە بەرزانەی کە ئیسلام و پەیامە ئاسمانییەکان و فەیلەسووفە گەورەکان و زاناکان و پێشەنگەکانی کۆمەڵگە گرنگی پێدەدەن، ئەو دەڵێت: «بەوجۆرە نییە و هەمووی درۆیە و ئەسڵ و ئەساسێکی نییە«! جەنابتان باش دەزانن (چۆمسکی) فەیلەسووفێکی ئەمریکیی – یەهودییە، کاتی خۆی موخابەراتی ئەمریکا لە شەستەکانی سەدەی ڕابوردوودا، ١٠ ستراتیژییەتی نووسیوە کە چۆن گەل کۆنترۆڵ بکرێ (مەبەستی هەموو گەل و نەتەوەکانە)؟! جا ئێستا ئەو میللەتانەی کە پاشکۆی ئەمریکان، ستراتیژییەت بەکاردەهێنن، یەکێک لە ستراتیژییەکان دەڵێت: «لە کەسانی قودووە و پێشەنگ بدە« چ کەسێک پێشەنگ و قودووەیە، تۆ گورزی لێبدە، بۆئەوەی کەس لاسایی نەکاتەوە، کەسانی بوودەڵە و هیچوپووچ بێنەرە پێشەوە، بۆ ئەوەی خەڵک لاسایی ئەوان بکاتەوە و دوای ئەوان بکەوێ! تەنانەت تۆ سەیر بکە، هونەری ڕەسەن و ئەسڵ نەماوە، جاران حەسەن زیرەک و ماملێ و عەلی مەردان و سەید عەلی ئەسغەری کوردستانیی پێشەنگی هونەری ئێمە بوون، کەسانێک ئەگەر دەنگیان خۆشنەبووایە گۆرانییان بۆ تەسجیل نەدەکرا، ئێستا ستۆدیۆ و ئامێری وایان بۆ دروستکردووی، کە ئەگەر دەنگیشت ناخۆشبێت، دەنگەکەت خۆش دەکات، ئەگەر هیچ سەکۆیەکیش نەبێت بۆ بڵاوبوونەوەی، دەیان تۆڕی کۆمەڵایەتییان داناوە و دەتوانی لەوێ بڵاوی بکەیتەوە، بەمە هونەر سووک دەبێت! ئێستا بەناوی گەعدە و دانیشتنی شەوانەوە، تەواو هونەری کوردییان سووککردووە. جاران کەی لە گۆرانیی و هونەردا وشەی سووک و ناشیرین بەکاردەهات؟! بەڵام ئێستا جۆرەها وشەی جنێو و جنسیی و ناقۆڵا دەخرێتە ناو هونەر و تێکستەکانەوە، بۆچی ئەمە دەکەن؟ چونکە یەکێکی تر لە پرەنسیپەکانی ئەو ١٠ ستراتیژییە دەڵێت: «مامەڵە لەگەڵ غەریزەکانیاندا بکە، هەست و عاتیفەیان بجووڵێنە، با ئینفعال و کاردانەوەیان هەبێت» مەهێڵە بە عەقڵ و ژیریی بیربکەنەوە.

ئێستا ئەگەر لە کوردستاندا عەقڵ حاکم بێت و خەڵکەکە بە عەقڵ و مەنتیقەوە بجووڵێتەوە و بیربکاتەوە، قەبووڵدەکات کە وڵاتانی تر داگیری بکەن و نەوتەکەی بفرۆشن و خۆیشی لە هەژارییدا بناڵێنێ؟! بەڵام ئێستا وایانلێکردووین، ڕەزیل و داماوبووین، بۆئەوەی چاومان لە دەست و دەمی ئەوان بێت و ببینە پاشکۆی کەسانی تر کە دژمانن! یەکێکی تر لەو ١٠ ستراتیژییە دەڵێت: «هەمیشە گەل و جەماوەر، کەمترین و نزمترین ئاستی زانستی بدەرێ، بەڵام ئەوانەی کە نوخبە و دەستەبژێرن و حوکم دەکەن، باشترین خوێندنیان بۆ فەراهەم بهێنە« یەکێکی تر لەو پرەنسیپانە دەڵێت: «وا لە خەڵک و جەماوەر بکە کە هەمیشە سزای ویژدانیان هەبێت و زەمیریان ئازاریان بدات و موحاسەبەی خۆیان بکەن و هەست بە تاوان و گوناح بکەن، پێیانوابێت ئۆباڵی دواکەوتوویی و نەبوونی بژێویی خۆیانن نەک حکومەت، بۆئەوەی خۆپیشاندان و سەربەرزکردنەوە نەگرنەبەر»!

ناکرێ لێرەدا هەموو ئەو ١٠ ستراتیژییانە بژمێرین، بەڵام بە کورتیی ئامانج و مەبەستی هەریەک لەو ١٠ ستراتیژییە بریتییە لە لێدان لە مرۆڤ، کەمکردنەوەی بەها و حورمەتی مرۆڤ. واتلێدەکات بچیت لاسایی کەسی تر بکەیتەوە لە خواردن و جلوبەرگلەبەرکردندا، بۆئەوەی هیچکات خۆت نەبیت و خۆت ون بکەیت! لەم سیستەمەدا پاش مرۆڤ، بەهای عیلم و بڕوانامەشیان نەهێشتووە، ئەوان پێتدەڵێن: بڕی بڕوانامەکان زیادبکە، بۆئەوەی نەوعییەت و قیمەتەکەی بەهای نەمێنێ، چونکە کە شت زۆر بوو، بێبەها دەبێت و دەبێتە زۆروبۆر، جاران لە شەشی ئامادەیی تەخەڕوجی دەکرد، دەبوو بە فەقێ یا بە مامۆستایەکی ئایینیی، زۆرت پێخۆشدەبوو دەستنووسەکەی بخوێنیتەوە، هێندە جوانی دەنووسی، یا واتدەزانی خۆشنووسە، کەچی ئێستا لای ئێمە لە زانکۆ تەخەڕوج دەکات، توانا و سەلیقەی ئەوەی نییە یاداشتێکی کورت بنووسێت. بۆیە ئەمە ئەگەر ئیشی لەسەر نەکرابێت، بۆچی زانست و مەعریفە ئاوا سووک بووە؟

**منداڵ ڕۆژانە سێ کاتژمێر لە خوێندنگە و ڕەوزەدایە، لەکاتێکدا حەوت کاتژمێر لە بەردەم تەلەفزیۆن و ئایپادەکەیدایە، کەچی تا ئێستا حکومەتی هەرێمی کوردستان و وەزارەتی پەروەردە ڕاگەیاندنی نییە!**

ئینجا لە بواری کۆمەڵایەتییدا، خۆتان دەزانن قییەم و بەها کۆمەڵایەتییەکان ڕۆژبەڕۆژ دادەبەزن، کەی ئێمە لە کوردستاندا کچەکوردمان هەبووە کە لە ئینتەرنێت بەمشێوەیە دەرکەوێ و ئاماژە بۆ سنگ و جەستەی خۆی بکات؟! هەموو گۆرانییەک کە باسی جنس و جەستەی ژن دەکات ڕەواجی پێبدرێت و کچەکوردیش بە جەستەیەکی نیمچەڕووتەوە ئەو گۆرانییە بخاتە پاڵ ڤیدیۆی خۆی! کوا ئەم هەموو شەڕەجنێوە هەبوو، ئەم هەموو سوکایەتییە کەی هەبوو؟ مەبەستمە بڵێم ڕۆژبەڕۆژ ئەمە دەبێت بە دیاردە. تەبعەن ئەو قوتابخانەی سلووکییەی کە پێشتر باسمکرد، دەڵێت: «هەرشتێک کە زۆر دووبارەت کردەوە، ئیتر دەبێت بە خوو و عادەت» جاران کە ناوی دز و دزیکردنیان بهێنایە، یا بە یەکێکت بگوتبا دزە و دزیی دەکات، موچڕکە بە لەشتدا دەهات، بەڵام ئێستا هێندەیان دووبارەکردەوە و هێندە وشەی باقوبریقیان بۆ داتاشی وەک: (گەندەڵیی و بەهەدەردان و خیانەت و خواردنی موڵکی گشتیی)، ئەو کاریگەرییە سلبییەی جارانی نەما و خەڵک ئێستا لای ئاسایی بووەتەوە! تەنانەت وایان لەو خەڵکە کردووە یا لەو خەڵکە وایانگەیاندووە، کە ئەگەر کەسێک دزیی و گەندەڵیی نەکات، ئەوە مانای ئەوەیە ئەو کەسە کەسێکی ئاسایی نییە، یا ترسنۆک و نەزانە، بۆیە دزیی ناکات! بەداخەوە هەموو قییەمەکان وردە وردە خەریکە دەگۆڕێت، جا تۆ دەبێت ئەم قییەمانە زیندووبکەیتەوە.

**گوڵنار: باشە کێ ئەو قییەم و ئەخلاقییاتانە زیندوودەکاتەوە؟**

قەرەچەتانیی: تەبعەن تۆ دەبێت یەکەم هەنگاو و یەکەم سێکتەر لە سیستەمی پەروەردەوە دەستپێبکەیت، لە هەموو دونیادا تەنها سیستەمی پەروەردە توانیویەتی بینای کەسایەتیی مرۆڤەکان بکات، یابان کە لە جەنگی جیهانیی دووەمدا دۆڕا، لەگەڵ ئەڵمانیا بە نمونە دەهێنینەوە، تەماشای ئەو دوو وڵاتە بکە، زۆرترین مووچە لەو دوو وڵاتەدا، مووچەی مامۆستایە، مێرکڵ پێش ئەوەی لاچێت، وەزیرەکانی لە کۆبوونەوەیەکدا پێیانگوتبوو: «مووچەی ئێمەش وەک مووچەی مامۆستا لێبکە»، ئەویش گوتبووی: جارێکی تر قسەی وا نەکەن، چۆن دەبێت وەزیر هێندەی مامۆستایەک مووچە وەربگرێت؟!» لە یابان بە هەمانشێوەیە، مامۆستا پارێزبەندیی هەیە وەک پەرلەمانتارێک، پێگە و حورمەتی هەیە، مووچەی زۆری هەیە. مەبەستم ئەوەیە بڵێم ئەو دوو وڵاتە بە پەروەردە سەرکەوتن، خۆ ئەگەر ئەم سیستەمی هیچوپووچەش خۆی بکات بەناو ئەوانیشدا و بەمشێوەیە بەربڵاوبێت، ئەوا لای ئەوانیش وردە وردە ئەم پووچگەراییە دەچێتە ناویانەوە. لە یابان ئێستا بابەتێکیان داناوە و چەند ساڵێکە بووە بە بابەتێکی ئیجباریی (زۆرەملێ)، جاران ئیختیاریی (بەویست) بوو، ئەو بابەتەش ناسراوە بە (ڕێگاکانی بەرەو ئەخلاق)، دەڵێت: ترسی ئەوەمان هەیە وردە وردە دزیی و تاوان و نائەخلاقیی و کوشتن و نەمانی ڕێزگرتن زیاد بکات لە وڵاتەکەماندا بەهۆی ئەم سەرمایەدارییەوە، بۆیە ئەو بابەتەیان داناوە بە ئامانجی کاڵنەبوونەوەی بەها باڵا ئەخلاقییەکانی خۆیان.

ئینجا لە بابەت پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانەوە خۆتان دەزانن کە چ داڕووخانێکیان بەسەردا هاتووە، لەوەش زیاتر ئەم تۆڕە کۆمەڵایەتییانەشی هاتووەتەسەر، هێندەی تر ئەو داڕووخانی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییانەشی زیاتر کردووە، لە هەر وڵاتێکی دونیا کە ئەم تۆڕە کۆمەڵایەتییانە چووەتە ناویان، ئەگەر مرۆڤەکانیان بۆ پەروەردە نەکردبێت، پێشوەختە ئامادەیان نەکردبێتن بۆئەوەی بتوانن و بزانن کە چۆن چۆنی ئەم تەکنەلۆژیایە بەکاربهێنن، خراپە و کاریگەریی سلبیی لێکەوتووەتەوە. بەڵام لە پڕ هاتە وڵاتی ئێمەوە، خۆتان دەزانن ئێمە لەناو سیستەمێکی گشتگیریی، دیکتاتۆریدا بووین، ئەوکاتە تەنها تەلەفزیۆنی کەرکوک و بەغدا بوونیان هەبوو، بەڵام لە پڕێکدا کە ئەم بەربەستە شکا و نەما، لافاو و هێرشی تەکنەلۆژیا و تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان هەڵیانکوتایە سەرمان. کرانەوەیەکی زۆر سەیر و بێ پەروەردەمان بە ڕووی تەکنەلۆژیادا بۆ هاتەپێش. من ئەوەم وەک پشیلەیەکی زۆر برسیی دەهاتە پێشچاو، کە لە پڕێکدا گۆشت و بەزێکی زۆر بخەیتە بەردەمی، ببینە چیی دەکات لە تاو ئەو حیرمان و بێبەشکردن و برسییبوون و کەبتکردنەی بەرامبەر بە گۆشتەکە! جا حاڵی ئێمەش لە بەرامبەر هاتنی لە پڕی تەکنەلۆژیا و تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان، وەک حاڵی ئەو پشیلەیە وابوو، ببینە چ کارەسات و تراژیدیایەکی بۆ ئێمە خولقاند؟ چەند خێزان سەری لێتێکچوو و شیرازەیان پسا؟ چۆن بەهای خوێندن و

زاناکان و بڕوانامە و کەسە چاکخوازەکانی نەهێشت؟ چەند ژن کوژرا و چەند دوژمنایەتیی دروستبوو بەهۆی نووکەی هەڵە و بەهۆی خراپ بەکارهێنانەوە؟! تازەترین کاردانەوە و کاریگەرییشی دۆسیەی گۆڤەند و ئەو کچانە بوو، من پێش چەند ساڵێکی زۆر لە یەکێک لە شارەکان کۆڕم هەبوو، یەکێک لە بەرپرسە ئەمنییەکان بە منی گوت: «هەموو ڕۆژێک ٢٠ – ٢٥ کچ هانامان بۆ دێنن و دەڵێن: فریامانکەون، نەمانزانیوە و هەڵە بووین ڕەسمێک، یا ڤیدیۆیەکی ڕووتمان ناردووە بۆ یەکێک و ئێستا هەڕەشەمان لێدەکات و دەڵێت: ئاوا و ئاوا نەکەیت و ئەوەم بۆ نەکەیت و ئەوە بکەیت، بڵاویدەکەمەوە! ئێمەش پێیاندەڵێین: بڕۆن دایکوباوکتان بهێنن با داوایان لە دژ تۆمار بکەین و بیانگرین. ئەو کچانەش پێماندەڵێن: بەخوا ئێمە ناوێرین دایکوباوکمان لەو کێشەیە ئاگاداربکەینەوە، چونکە بەو مەسەلەیە بزانن، ڕاستەوخۆ دەمانکوژن»! من دەڵێم بەداخەوە ئەمە واقیع و کێشەیەکە و دەبێت هەمووومان ڕووبەڕووی ببینەوە. تۆ وەرە لە شارێکدا ڕۆژی ٢٠ کەس – بە لانی کەمەوە – لێکدانی ٣٠ ڕۆژەکەی بکە، لە مانگێکدا دەکاتە ٦٠٠ کچ، دەی لە شارێکدا و لە مانگێکدا ٦٠٠ خێزان دابڕووخێ، ئیتر کۆمەڵگە چۆن بەرگە دەگرێت و چۆن داناڕووخێ؟!

**گوڵنار: دکتۆر تەنانەت لە ماوەدای ئەم چوار ساڵەشدا سنات و تیکتۆک و کلابهاوس و تۆڕە کۆمەڵایەتییەکانی تر هەم زیادبوون و هەم ئەوانەی پێشووتریش گەشە و بەرفراوانی زۆریان بە خۆیانەوە دیتووە، دەبێ ئێستا ڕێژەکە چەندە زۆر بووبێت؟**

قەرەچەتانیی: بەدڵنیاییەوە وایە، ئەی ئێوە کابرای بە ساڵاچوو نابینن لە تیکتۆکدا دەڵێت و دەڵێتەوە: «برسیمە، برسیمە»! ئەوە جاران بووایە، لە دیوەخاندا دادەنیشت و ئاشتەوایی عەشایەریی و کۆمەڵایەتیی دەکرد، چەندان خوێنی خۆش دەکرد! من خەمی مناڵەکانی و نەوەکانیمە کە لە پاشەڕۆژدا چییان لێدەردەچێت ئەگەر ئەمە باوکیان بێت؟! ئینجا مرۆڤ لە دونیای ئێمەدا دەبێت پەروەردە بکرێت، خۆ ڕاستە مناڵ کە دێتە دونیاوە، لەسەر فیترەتێکی خێر و چاکە لەدایکدەبێت، بەڵام کۆمەڵگە و دەوروبەرەکەی بەرەو شەڕی دەبات، بەداخەوە ئێستا زۆر لە دایکوباوکەکان ئاگایان لە مناڵەکانیان نەماوە، زۆر ژن دێت بۆ لای ئێمە و دەڵێت: «مێردەکەم لە ئێوارەوە تا نیوەشەو ئێمەی پشتگوێخستووە و لەگەڵ سوودانییەک و لەگەڵ کێی تردا چات دەکات و منیشی تووشی لادان و داڕووخان کردووە و تەنانەت بە منیش دەڵێت: تۆش بڕۆ وەک من خەریکی چات بەو چات بکە لەگەڵ خەڵکی تردا»! تۆ ببینە بەهۆی تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان و ئەم سیستەمە هیچپووچەوە خیانەت و ناپاکیی هاوسەریی زیادیکردووە، جیابوونەوە و توندوتیژیی خێزانیی زۆر زۆر بووە، ڕێژەی خۆکوشتن زیادیکردووە، خەڵککوشتن زیادیکردووە، پێش ئەم دیدارە، لە یەکێک لە ناحیەکانی هەرێمی کوردستان باوکێک و دوو کوڕ کوژراوە لەسەر لەفەخواردن! ئەمە تا مردن دوژمنایەتیی دەخاتە نێوان ئەو دوو خێزانەوە، جاران مرۆڤ لە تەواوی دونیادا دوژمن بە ڕووداوە سرووشتییە لەناوبەرەکان

بوو، لەو ڕووداوە سرووشتییانە دەترسا (ڕۆچوونی زەویی، گڕکان، بوومەلەرزە، لافاو، هەورەتریشقە و ئاگر، پێوەدانی مار و دووپشک و...هتر)، ئێستا مرۆڤ ئەوانەی هەر لە بیر نەماوە، لە سایەی ئەم سیستەمە هیچوپووچەدا، دوژمنی مرۆڤ، بووەتەوە بە خودی مرۆڤ خۆی! چونکە سیستەمە هیچوپووچەکە هەم ئەم فەوزایەی دەوێ، هەم ئەم جۆرە مرۆڤانەی پەروەردە کردووە و بەوجۆرە ئاڕاستەی کردوون.

لەلایەکی تریشەوە ئەم سیستەمە هیچوپووچە کە دەیەوێ وڵاتێک و پێگەیەکی سیاسیی، سیاسەتمەدارێکی هیچوپووچ حوکمی بکات، دەبینی زوڵم و زۆر لە میللەتان و لە وڵاتانی دواکەوتوو و ژێردەستە دەکرێت. کۆمەڵگە دابەشدەکات بەسەر چین و توێژی جیاجیادا، ئەو میللەتە چەوساوەش پەنا بۆ تیرۆر دەبات، پەنا بۆ خۆتەقاندنەوە و خۆخواردنەوە دەبات، پەنا بۆ سەرهەڵگرتن دەبات، یا تووشی جۆرەها نەخۆشیی دەروونیی دەبێت! ئەگەر دادپەروەریی و ئارامیی هەبێت، خەڵک بۆچی دەبێت بە تیرۆریست؟ من بەرگریی لە تیرۆریست ناکەم، بەڵام کەسێک کە دەبێت بە تیرۆریست، بەدڵنیاییەوە مافەکانی پێشێلکراوە، شکۆ و کەرامەتی ڕووشێنراوە! دەرگاکانی ژیانی لێداخراوە و ژیانی گەیشتووەتە بنبەست! مسوڵمان لە هەر وڵاتێکدا بوو، ڕێزی بگرە، مافەکانی خۆی بدەرێ، ئازادیی ڕاپەڕاندنی ئەرک و پەرستشەکانی بدەرێ، ئیهانەی مەکە و هەستی بریندار مەکە، ئیتر بۆچی دەچێتە ناو گرووپە توندڕەوەکانەوە؟ کاتی خۆی ئێمە وەک کورد و پێشمەرگە، ئەگەر سەددام ئەم هەموو زوڵم و ستەمەی نەکردایە و لەڕووی زمان و کۆمەڵایەتیی و سیاسیی و ئابوورییەوە مافەکانی کوردی پێشێل نەکردایە، خەڵک بۆچی دەچوو پەنای بۆ شاخ و کلاشینکۆف دەبرد؟ کەواتە هەموو ئەمانە زوڵم و زۆرەکە دەیکات و پاڵنەرە، ئەی زوڵم و زۆرەکە کێ دەیکات؟ مرۆڤەکان دەیکەن. ئەو مرۆڤانەش پێبزانن یا نەزانن، لە بەرژەوەندیی و خزمەتی سیستەمە هیچوپووچەکەدان! چونکە سیستەمە هیچوپوچەکە گەرای خۆی لە وڵات و ژینگەیەکدا دادەنێت کە عەدالەت و دادپەروەریی و یاسای تێدا نەبێت.

**گوڵنار: ئەم هەلومەرج و بارودۆخەی کە ئێستا جیهان بەگشتیی و کوردستانیش وەک بەشێک لە جیهان بەتایبەت هەیە، تا چەند بووەتە هۆی بێبەهابوون و سووکبوونی بڕوانامە و خوێندن و زانکۆ و زاناکانمان؟**

قەرەچەتانیی: ئەگەر کۆمەڵگە، کۆمەڵگەیەکی هۆشیار و زیرەک و خوێنەر و خاوەن بڕوانامەی کارپێکراو بووایە، هیچکات ئەم سیستەمە هیچوپووچە نەیدەتوانی بەمشێوەیە زاڵبێت و گەرای خۆی دابنێت! من برادەرێکم مامۆستای زانکۆیە، گوتی: «لە هەڵبژاردنی پێشوودا و لە یەکێک لە شارەکان، پرۆفیسۆرێک لە سیاسەتدا، کە حکومەت بەردەوام ڕاوێژ و پرسی پێکردووە، ئەم پرۆفیسۆرە بەربژێر بوو و خۆی هەڵبژاردبوو بۆ پەرلەمان، لە هەمانکاتدا گۆرانیبێژێکیش بەربژێر بوو، پرۆفیسۆرەکە دەرنەچوو و دەنگی نەهێنا،

گۆرانیبێژەکە دەرچوو و چووە پەرلەمانێکەوە تا یاسا بۆ من و تۆ و ئەو میللەتە دابڕێژێ و بنووسێ»! نەک هەر گۆرانیبێژ، بگرە ڕاگەیاندنکار و هونەرمەندێک دەرچووە بۆ پەرلەمان. باشە ئەگەر ئەم خەڵکە واعیی و هۆشیار بێت، پەرلەمان شوێنی دانانی یاسایە و دەبێت خەڵکانی یاساناس و شارەزا لەوێ وجودیان هەبێت، (لەگەڵ ڕێزم بۆ هونەرمەند و ڕاگەیاندنکار)، بەڵام ئەوانە لەوێ دەتوانن چ ڕۆڵێک بگێڕن؟! یەکێک لەو گۆرانیبێژانەی کە پەرلەمانتارە، خۆی گوتی: «من فرم بەسەر پەرلەمانەوە نییە و هاتووم ئەزموونی بکەم»! باشە تۆ چۆن دێیت چارەنووسی خەڵک دەخەیتە ئەزموون و تاقیکردنەوەوە؟! سیستەمی هیچوپووچ هەمیشە ڕواڵەتت بۆ جوان و شیرین دەکات. بۆ نمونە تۆ منداڵێکت هەیە و لە بازاڕەوە دوو یاریی بۆ دەهێنیتەوە، یارییەکیان بچووکە، بەڵام نرخەکەی نزیک بە هەزار دۆلارە، یارییەکەی تر گەورەیە، بەڵام نرخەکەی نزیک بە دە دۆلارە، کەچی منداڵەکە یارییە گەورە هەرزانەکە هەڵدەبژێرێت، بۆچی؟ چونکە منداڵ عەقڵی گەشەی نەکردووە و هەمیشە ئەو شتانە هەڵدەبژێرێت کە ڕووکەش و قەبارەی جوانتر و گەورەتربێت، سەیری ناواخن و پێکهاتەی شتەکان ناکات! کۆمەڵگەی دواکەوتووش وەک ئەو منداڵە وایە، هەمیشە چ کەسێک جلوبەرگی جوانی لەبەردا بێت، کێ ئۆتۆمبێلەکەی گرانبەها بێت، کێ دەمی گەرم و ڕەوانبێژ بێت، کێ ڤێلا و خانووی گەورەی هەبێت، ئەوەی لاگرنگە تا بیرمەند و فەیلەسووفێک! بەهای مرۆڤ دەبەستنەوە بە بە ڕواڵەتەوە.

بۆ هەڵێنجاندن و زانینی گەوهەر و جەوهەری ناخی مرۆڤەکان عەقڵت پێویستە، دەی کۆمەڵگەی دواکەوتوو ئەو عەقڵەی نییە! منداڵ کۆمەڵێک قۆناغی هەیە کە دەرک بە شتەکان دەکات، بەداخەوە کۆمەڵگەی کوردیی تا ئێستا نەگەیشتووەتە قۆناغی هەرزەکارییش. دوو مرۆڤ شەڕەبەند و شەڕەجنێو دەکەن، لە بەرنامەیەکدا سووکایەتیی بە یەکتر دەکەن، شتی فشقیات و پێکەنیناویی لە نێوان خۆیاندا بەرهەمدەهێنن، بڕۆرە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان بە ملیۆنان کەس تەماشای دەکات، بەڵام بڕۆ بزانە بەرنامەیەکی ئەکادیمیی و زانستیی چەند بینەری هەیە؟! هەر زۆر دوور بۆی نەچین، ئەم دیدارەی ئێوە بە ڤیدیۆ بڵاوییکەرەوە، بزانە چەند کەس تەماشای دەکات؟! ڕێژەیەکی زۆر کەم. ئەوەش یەکێکە لە کەموکورتییەکانی دیموکراتییەت. بۆیە تا کۆمەڵگە هۆشیار و عاقڵ نەبێت، قۆناغی منداڵیی و موراهیقیی جێنەهێڵێ، بە ڕووکەش و ڕواڵەت تێنەکەوێت، هەر ئەوە بەشمانە و دەستمان لێبشۆ، دەی سیستەمە هیچوپووچەکەش هەر ئەوەی دەوێت. ئێستا کەسێکی گەندەڵ، هیچکات کەسێکی ڕۆشنبیر و عاقڵ ناکات بە یاریدەدەر و ڕاوێژکاری خۆی، چونکە هەموو ڕۆژێک عەیب و کەموکورتییەکانی خۆی نیشاندەداتەوە، لە کوردەوارییدا دەڵێت: «مەنجەڵ گەڕا سەرقاپی خۆی دۆزییەوە»، هەمیشە لای ئێمە وەزیر و کاربەدەستی گەندەڵ، دەبێت هەموو ئەوانەی دەورووپشتی خۆی گەندەڵ و خراپەکار بن! وەزیرێک داوای کردبوو بچم بۆلای و منیش چووم بۆ وەزارەتەکەی، نیوکاتژمێرێک

لە ئۆفیسەکەی دانیشتین، پێیانگوتین: «داوای لێبوردنمان هەیە، ئەوە ڕاوێژکارەکانی لایە« منیش وام گومانبرد کە ڕاوێژکارەکان هاتوون و ڕاوێژ و پلانی گونجاو دەدەن بە جەنابی وەزیر. پاشتر کە چوومە ژوورەوە بۆ لای، وەزیر داوای لێبوردنی لێکردم و گوتی: «بەخوا کۆمەڵێک کێشەمان هەیە و ڕاوێژکارەکانم هێناوە لەوساوە شتەکانیان پێدەڵێم»! منیش گوتم: جەنابی وەزیر! یانی جەنابت شت دەڵێیت بە ڕاوێژکارەکانت؟! گوتی: «ئەرەوەڵا»! منیش گوتم: ئاخر ئەو ئیشی ڕاوێژکارە، دەبێ ئەو شت بە تۆ بڵێت. ئەویش گوتی:» بەخوا ئەمانە هەر بۆ پارە لێرە دامەزرێنراون»! لەبەرئەوە ئەگەر ئەمە سیستەمێکی هیچوپووچ نەبێت، چۆن ئەمە قەبووڵدەکات؟! ئەگەر ئەمە سیستەمی هیچوپووچ نەبێت، لە کوێی دونیادا کوێر دەستی ڕێبەر و ڕێزانی گرتووە بۆئەوەی ڕێ وننەکات و نەکەوێت؟! من منااڵبووم، باوکم شەوانە چیرۆکی کچی (شای پەریان)ی بۆ باس دەکردم، بۆ تەمەنی من زۆر خۆشبوو، لە یەکێک لە مەوقیفەکاندا دەبوو یەکێک لە کوڕەکان بگاتە کچی شا و بچێتە ناو کۆشکەکەوە، کۆمەڵێک شتی نەگونجاو و نامەعقول دەبینێت، بۆ نمونە ئەسپە و ئێسقانی لەبەردەمدا دانراوە، شێرە و گیای سەوز دەخوات، پشیلەیە و لە ئاودا مەلە دەکات... تادواتر. تۆ دەبێت هەموو ئەمانە بگۆڕی و ڕاستیان بکەیتەوە، ئەمە سیستەمە هیچوپووچەکەیە. ئەمەش تەنها و تەنها بە پەروەردە دەکرێت. چونکە تۆ دەبێت ویژدانێکی زیندوو دروستبکەیت، مرۆڤ ویژدانی لێپرسینەوەی لەگەڵ بکات، تۆ ناتوانی بەسەر هەموو مرۆڤێکەوە پۆلیسێک دابنێیت، ئەی پۆلیسەکەش مرۆڤە، ئەی کێ بەسەر پۆلیسەکەوە دادەنێیت؟ بەڵام ئەگەر مرۆڤت دروستکرد، ئیتر پێویستت بە لێپرسینەوە و چاودێریی نابێت!

**گوڵنار: نەبوونی مەرجەع و پێشەنگی نمونەیی لە کۆمەڵگەدا، چ زیانێک بە تاک و خێزان و کۆمەڵگە دەگەیەنێت؟ هەروەها بوون و ئامادەیی مەرجەع لەم سیستەمە پووچگەراییەدا چ کاریگەرییەکی دەبێت؟**

قەرەچەتانیی: زانا و فەیلەسووفەکان لەسەر سرووشتی مرۆڤ زۆریان قسە کردووە، هەندێک دەڵێن: «سرووشتی مرۆڤ خێرە« ئەمە بۆچوونی جان جاک ڕۆسۆ و میستان لۆزی و ڕۆجەرز و ماسلۆ و زۆری تریشە، کە پێیانوایە مرۆڤ لە ڕەگەزی مەلائیکەیە. دەڵێن: «بەڵام کۆمەڵگە بەرەو شەڕی دەبات»، بۆچوونێکی تر هەیە پێچەوانەی ئەوانە، فرۆید و تۆماس هۆبز و زۆری تریش، ئەوان دەڵێن: «مرۆڤ گورگە و لە پێستی مەڕدایە«، فرۆید دەڵێت: «ئێمە چۆن پێویستمان بە نانخواردنە، ئاوەهاش پێویستمان بە کوشتن هەیە و غەریزەی دوژمنکارانەمان هەیە«، لە نێوان ئەم دوو بۆچوونەشدا، بۆچوونێکی تر هەیە کە زۆربەی ئایینەکان لەسەر ئەو بۆچوونە کۆکن، ئەویش ئەوەیە کە مرۆڤ بێلایەنە و نە ئەوەیە لایەنی شەڕ بێت بە تەواویی و نە ئەوەیە لایەنی خێر بێت بە ڕەهایی. لە ئاییندا ئێمە شەیتانمان هەیە، کە نمونەیە بۆ شەڕ، مەلائیکەتیشمان هەیە کە

هێما و نمونەیە بۆ خێر، کە مەلائیکەتیش خێرە ئازایەتیی خۆی نییە، هەموو غەریزەکانی لێسەندراوەتەوە، شەیتانیش هەمووی شەڕە. ئێمە لە نێوان هەردوو ئاڕاستەکەداین، لە قوڕ دروستکراوین، ئەوەش پەیوەندیی بە ڕەهەندی جەستەیی و غەریزەکانمانەوە هەیە لەمەدا لە شەیتانەوە نزیکین، ئەگەر لایەنی ڕووحییەکەشمان بگری، کە خوای گەورە لە ڕووحی خۆی کردووە بە بەرماندا، ئەوکاتە لە جیهانی مەلائیکەتەوە نزیکدەبینەوە. پاش ئەمانە، ئەوە ژینگەکەیە بڕیار دەدات کە ئایا ئەو مرۆڤە تۆوی خێرەکەی تێدا سەوز ببێت یا تۆوی شەڕەکە، دایەنگە و ڕەوزە و کۆلان و خێزان و کۆمەڵگە ڕۆڵی سەرەکیی دەگێڕن لەم دیاریکردنەدا. ئەوانەی کە ئێستا لە زینداندان و کەسێکیان کوشتووە، هەر لە سەرەتاوە تۆوی شەڕەکە تێیدا سەوزبووە و تۆوی خێرەکەی تێدا نوستووە.

**گوڵنار: کەوایە لەم سیستەمە هیچپووچەدا قەزیەی ئاسایشی قەومیی و دۆزی سەربەخۆیی کورد زیاتر گران دەکات؟**

قەرەچەتانیی: بەڵێ بەو جۆرەیە، جاران کورد بەسەر دوو میرنشیندا دابەش ببوو، بەڵام ئێستا لەناو سلێمانیدا چەندان بیرکردنەوە و ناوچە و شێوەزاری جیا هەن، ئێستا عەشایەر دروستبووەتەوە و هەرکەسە و خۆی بە ئەندامی عەشیرەتێک دەزانێت. بۆیە من پێموایە هەرچەندە هەموومان کوردین، بەڵام پێمخۆشە بگەینە قۆناغێک کە هاوڵاتیبوون بنەمای ژیانکردن بێت، چونکە ئەگەر قەومییەت زاڵبێت، دەبێ لەگەڵ عەرەبدا یەکبکوژین، یا لەگەڵ تورک و فارسدا، ئایا دەکرێت تا مردن ئێمە لە یەکتر بکوژین؟ بەڵام ئەگەر لەسەر بنەمای مرۆڤبوون و هاوڵاتیبوون بێت، ئەوسا هەموومان دەتوانین مامەڵە لەگەڵ یەکتردا بکەین. چونکە هەموومان یەک دایکوباوک و یەک ئامانج و یەک مردنمان هەیە، کۆمەڵێک پەیامی مرۆڤایەتییانە هەیە کە نەتەوەیەکگرتووەکانیش لەسەری ڕێککەوتوون، خوای گەورە باسیکردوون و ئێمە لەسەر هەموو ئەمانە هاوبەشین، بەڵام ئێمە ئەمانەمان هەموو شێواندووە، کورتمانکردووەتەوە بۆ نەتەوە، لە نەتەوەوە بۆ عەشیرەت، لە عەشیرەتیشدا بۆ تیرە و هۆز و بەرەباب دابەشبووە! حیزبەکانیش ئەمەیان دەوێ، تا کۆمەڵگە زیاتر پەرت پەرت بێت، ئەوان زیاتر دەتوانن بەکاریانبهێنن بۆ بەرژەوەندیی خۆیان، بەڵام ئەگەر کۆمەڵگە و جەماوەر یەکگرتووبوون، ئەوە نایکات. حیزب هەمیشە لەناو جەماوەرە پەرت پەرتبووەکەشدا، نەزانەکان پێشدەخات و پێتدەڵێت: «گوێ لە زاناکان مەگرە، چونکە ئەگەر زاناکان لە عەشیرەتێکیشدا بن، هەر شتی لۆژیکیی دەڵێن».

**گوڵنار: ئایا میدیا و سۆشیالمیدیا نەبوونەتە هۆی دروستبوونی پاڵەوانی کارتۆنیی؟**

قەرەچەتانیی: لە سەداسەد وایە و سیستەمە هیچپووچەکەش پێویستی بەو پاڵەوانە کارتۆنییانە هەیە، ئەم سیستەمە هیچپووچە نابێت کەسێکی زانا سەرخات، چونکە ئەو زانایە لەگەڵ ئەو سیستەمەدا ناگونجێ و جێی نابێتەوە، دەبێت کەسێک سەربخات کە بیکات بە لێزان، بەڵام لێزانیی لە چییدا؟ لە فرتوفێڵ و جوانکاریی و دیکۆردا، لەوەدا کە شتی

ناشیرینت بۆ جوان بکات. بۆیە ئەم سیستەمە هیچوپووچە پێویستی بەوەیە لە ڕاگەیاندن و سۆشیالمیدیاکاندا کەسانی بوودەڵە پەروەردە بکات و نمایشیان بکات، بۆئەوەی جەماوەر لاسایی ئەم کەسە بوودەڵانە بکاتەوە. تۆ ئەگەر گرنگیی و بایەخ بە پەروەردە بدەیت و مامۆستا گەورە بکەیت، ئێ خەڵکەکەش ڕاستەوخۆ دوای ئەو دەکەوێت، بەڵام وەرە گۆرانیبێژێکی تافیهـ، وەرە بەناو شاعیرێکی هەزەلیی کە باسی جەستە و قسەی قۆڕ بکات، یا خاوەن بڕوانامەیەکی بەرز کە ناوەوەی بوودەڵە و بۆشە، دێت ئیشەکانت بۆ دەبات بەڕێوە و جەماوەریش دوای دەکەوێت و ئەوە ڕەوشەکەیە کە دەیبینین!

بۆیە خودی سیستەمەکە پێویستی بەو جۆرە کەسانە هەیە، سیستەمەکەش دەبێت بەم ڕاگەیاندنە چەواشەکارە نابەرپرسە بچێت بەڕێوە، چونکە ڕاگەیاندنی ئامانجدار و پەیامدار ئامانجەکانی سیستەمی هیچوپووچ نابات بەڕێوە و برەویان پێنادا. ئەگەر سیستەمی هیچوپووچ نەبێت، لە کوێی دونیادا بووە یاریزانێک کلێنسە لیکاوییە، چڵماوییەکەی ملیۆنێک دۆلار زیاتر بکات؟! بۆیە سیستەمی گەورە و ئامانجدار مرۆڤ دەکاتە سەنتەر و چەقی خۆی، گرنگی بە مرۆڤەکان دەدات، بەڵام لە سیستەمی هیچوپووچدا بێقیمەتترین شت مرۆڤەکانن، لە دونیای سەرمایەدارییدا ماددە چەق و سەنتەرە و دەبێ مرۆڤەکان لە خزمەت و گەڕاندابن بە دەوری ئەو چەق و سەنتەرەدا! لە سیستەمی ئابوورییشدا هەروای لێهاتووە، هەرچی پارەی دونیا هەیە لە دەستی چەندان کەسێکدا خڕبووەتەوە! داهاتی لە سەدا نەوەدونۆی جیهان لای لە سەدا یەکی خەڵک کۆبووەتەوە، ئێ ئەوە ئەگەر سیستەمی هیچوپووچ نەبێت، چۆن قەبووڵدەکرێت؟ ئەی بۆچی خوای گەورە دەفەرمووێت: زەکات بدەن بۆ ئەوەی زۆر لە یەکتر دوورنەکەونەوە و جیاوازییە چینایەتییەکان تۆخنەبنەوە؟ ئەم سیستەمە زۆر جیهانییە و کوردستان وەک پاشکۆی وڵاتانی ئەوروپا وایە، چونکە سیستەمەکە لە خزمەتی سیستەمی سەرمایەدارییەکەدایە.

**گوڵنار: چۆن دەکرێت ڕووبەڕووی ئەم شەپۆلی بێبەهاکردن و پووچگەراییە ببینەوە؟ ڕێگا و میکانیزمەکانی چین؟**

قەرەچەتانیی: چارەسەر بەس لە پەروەردە و فێرکردندایە، کە دەڵێین: پرۆسەی پەروەردە و فێرکردن، ئێستا کە کێشەی سیاسییمان هەیە، لەبەرئەوەیە کە پەروەردەی سیاسیمان نییە، من هەمووجار دەمگوت (دواتریش بەشێک لە سیاسییەکان ئەم قسانەی ئێمەیان دووبارە دەکردەوە) کورد لە کوردستاندا هیچ قەیرانێکمان نییە، قەیرانی عەقڵ نەبێت! من بیست ساڵ پێش ئێستا ئەم قسەیەم کردووە، ئەگەر قەیرانی عەقڵمان نەبووایە، بەو سەرمایەیەی کە هەمانە، چەندیشمان لێبدزن، دەمانتوانی وڵات ببەین بەڕێوە، ئێمە ئەگەر لە دوای ڕاپەڕینەوە وەزارەتی پەروەردەکەمان پرۆگرامێکی باشی هەبووایە و حکومەت پشتگیریی بکردایە و مووچە و میزانییەی بۆ دابینبکردایە، ئێستا نەوەیەکمان پەروەردەکردبوو کە تەمەنی ٣٠ ساڵ بوو، بەڵام بەداخەوە من گەیشتوومەتە ئەو

قەناعەتەی کە ساڵانی ١٩٩١ – ١٩٩٣ تاکەکانمان باشتربوون تا ئێستا، کەی ڕەوایە تۆ سی ساڵ حکومدارییت کردبێت و وەزارەتی پەروەردە لەژێر دەستی خۆتدا بێت، مرۆڤەکان بە جۆرێک پەروەردە بکەیت کە جارانیان لە ئێستایان باشتر بووبێت؟! ئەمە گەورەترین کێشەیە لە پەروەردەدا هەمانە. بۆیە من دەڵێم: ئەگەر ئیرادەیەکی خێر و گەورە هەبێت، چارەسەر تەنها ئەوەیە و هیچی تر نییە، کەسێک هەبێت وەکو مەرجەع کورد لەسەری ڕێککەوێ و ئەویش لە حیزبایەتیی دوورکەوێتەوە و هەمووی بە یەکچاو سەیر بکات، پاشان بێت حکومەتێکی کوردیی دڵسۆز پێکبهێنێت، با وەزیرەکانیش هەموویان سیاسیی بن و بۆ خۆیان، بەڵام کەسانی لێزان و شارەزا بکاتە وەکیل وەزیر و مودیرعام، پاشتر سوود لە وڵاتانی پێشکەوتوو وەربگرێت، بێیت سەرلەنوێ بینای کەسایەتیی کورد بکەیتەوە، چونکە بمانەوێ و نەمانەوێ ئێستا بینای کەسایەتیی تاکی کورد شێواوە، چونکە پارەی دونیامان هەبێت و ئاڵامان هەبێت، فلسێک ناژێ، چونکە مرۆڤەکانمان نەخۆشن و بێئیرادەن. ئێستا هەموومان دوژمنی یەکترین، قینلەدڵین، هەموومان هەست بە کەمیی دەکەین. دەبێ دووبارە ئەم مرۆڤانە بنیادبنێینەوە، ئایا ئەم کەسە مەرجەعە، کورد لەسەری ڕێکدەکەوێ؟ من گومانم هەیە! ئایا ئەو حکومەتەی کە دروستدەبێت، حکومەتی هەموو کورد و کوردستان دەبێت، یا تەنها حکومەتی حیزبەکان دەبێت؟ مناڵ ڕۆژانە سێ کاتژمێر لە خوێندنگە و ڕەوزەدایە، لەکاتێکدا حەوت کاتژمێر لە بەردەم تەلەفزیۆن و ئایپادەکەیدایە، کەچی تا ئێستا حکومەتی هەرێمی کوردستان و وەزارەتی پەروەردە ڕاگەیاندنی نییە! بۆیە من دەڵێم و دووبارەی دەکەمەوە تاکە ڕێگا و میکانیزمی چارەسەر و بەخۆداچوونەوەمان بریتییە لە: «پەروەردە و پەروەردە و پەروەردە»!





هێمن عەبدولقادر
ب.سەنتەری ڕاوێژکاری خێزانی

# زیانەکانی هەڵوەشاندنەوەی خێزان و ڕووکردنە تاکگەرایی

لە بەرەبەیانی مێژووەوە هەتا ئەمڕۆ گیروگاز و بگرەو بەردەیەکی زۆر هەیە لەسەر شێوازەکانی دروستبوونی خێزان و جۆرەکانی خێزان و کێشەکانی ناو خێزان. لەڕاستیدا دەبێت نەترسین لەوەی کە بڵێین بەئەندازەی ستایشکردنی دامەزراوەی خێزان، ڕەخنە و سەرزەنشتکردنیش هەیە لەو دامەزراوەیە. لەبەرئەوەی کە خێزان بچوکترین یەکەی کۆمەڵایەتییە، تیایدا تاکەکەس لە منداڵییەوە فێری سەرجەم نمایش و هۆگریی و خۆگریی و چاوەڕوانییەکان دەبێت، هەموو ڕێسا و دەستورە دەوڵەتییەکان تیایدا جێبەجێ دەکرێت لە (ئاسایش، ئابووری، تەندرووستی، دەروونی و یاسایی و.. هتد)، بۆیە دەکرێت بڵێین ئەم دامەزراوەیە هەم قابیلی گەشەکردن و پەرەپێدانە، هەم قابیلی پوکانەوە و داخوران.

نوسەری ئیسرائیلی (یوڤال نوح هەراری) لە یەکێک لە وتارەکانیدا بەناونیشانی (مرۆڤ چۆن جیهان بەڕێوەدەبات) باسی ئەوە دەکات هەرگیز مرۆڤ بە تاکگەرایی نەیدەتوانی ئەهرامەکان دروستبکات، یاخود بچێتە سەر مانگ، بەڵکو ئەوە کاری دەستە جەمعیی و کۆبونەوەیەکی گرنگی مرۆڤەکانن لەژێر چەتری (هەرەوەزی)دا. ئەو زیاتر دەڕوات و دەڵێت: حەفتا هەزار ساڵ پێش ئێستا باوانی ئێمە زیندەوەری بێبایەخ بوون، تاکە شتێک کە لەسەر مرۆڤی بەر لە مێژوو بیزانین ئەوەیە کە هیچ کاریگەرییەکیان لەسەر ئەم هەسارەیە نەبووە، جیاوازییەکی ئەوتۆیان لەگەڵ هەر زیندەوەرێکی تر نەبووە لەڕووی کاریگەری لەسەر ئەم هەسارەیە، بەپێچەوانەی ئێستاوە کە تەواویی هەسارەکە لەژێر کۆنترۆڵی مرۆڤدایە. پرسیارەکە ئەوەیە مرۆڤ چۆن لە زیندەوەرێکی بێباکی کەم بایەخی گۆشەگیر لە ئەفریکاوە، گەیشتووە بەمرۆ کە دەست بۆ هەسارەکانی تر دەبات؟ وەڵامەکەی ئەوەیە کە شتێکی تایبەت لە مرۆڤدا هەیە کە لە هیچ کام لە زیندەوەرەکانی تردا نیە، یان زۆر لاواز و سنوردارە.

ئەو دەڵێت: ئەگەر مرۆڤێک و مەیمونێکی جۆری شەمپانزی بخرێتە دورگەیەکەوە، بە هەموو ئەگەرێکی چاوەڕوانکراوەوە، مانەوە بۆ شەمپانزیەکە دەبێت و باشتر و زیاتر دەتوانێت لەگەڵ ژینگەکەدا خۆی بگونجێنێت و دەستی بە پێداویستییەکانی مانەوە بگات. ئەمە کێشەیەکی تاکە کەسی نییە، لەڕاستیدا جیاوازی نێوان گشت مرۆڤەکان لەگەڵ ئاژەڵ و زیندەوەرەکانی تردا، لەئاستی تاکایەتیدا نییە، بەڵکو لە ئاستی کۆمەڵایەتیدایە. مرۆڤەکان توانیویانە ئەم هەسارەیە کۆنترۆڵ بکەن لەبەرئەوەی توانیویانە هاوکاری یەک بکەن، ڕەنگە خەڵکی بپرسن (هەنگ و دۆلفین و هەندێک لە شیردەرەکانی تریش) کاری هەرەوەزیی و پێکەوەیی دەکەن، بەڵام بە ئەندازەی مرۆڤەکان نەیانتوانیوە هەنگاو بنێن، هۆکارەکەی بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە توانای پێکەوە کارکردنی ئەوان سنوردارە و ناتوانن لە هەموو کاتێک و لەگەڵ هەموو جۆرێکدا کار بکەن. لێرەوە کەمێک بەرچاومان ڕووندەبێتەوە، هەر لە سەردەمانی کۆنەوە بگرە، لە گشت قۆناغەکانی گەشەکردنی مرۆڤایەتیدا، مرۆڤ نەیتوانیوە بازی گەورە بدات، یاخود بەسەر زۆرێک لە کێشە تەندرووستی و کۆمەڵایەتیی و سەربازییەکاندا سەربکەوێت، ئەو کاتانەی بەتەنها و گرووپی بچووک بچووک ژیاون زیاتر ڕووبەڕووی مەترسیی و لەناوچوون بونەتەوە، بەپێچەوانەوە ئەو کاتانەی، کە کۆبونەتەوە و کاری هەرەوەزیی و پێکەوەیی و شێوە فیدراسیۆن و کۆمەڵەی جۆراوجۆریان دروستکردووە زووتر و باشتر گەیشتوون بە ئامانجەکانیان.

لەڕاستیدا ئەم بۆچونانە زیاتر بۆچونی (ئابووری – ڕامیاری)ین، لە هەناوی گەشەسەندنی زانستی تردا، بەر ڕاو بۆچوونی جۆراوجۆر و جیاوازیش دەکەوین کە بەتەواویی پێچەوانەی ئەو بۆچونەی یەکەم دەوەستێتەوە.ئەگەرچی زۆرینەی ئاینەکان دەتوانرێت بوترێت لەسەر بنەمای خێزان ڕۆنراوە، خێزان بەردی بناغەی زۆرینەی

ئاینەکانە، بەڵام (خێزان زۆرجاریش بناغەی هەموو ناتەواوییەکی عەسەبییە، هەروەها بنەمای نەژاد و جەنگەکان)یشە.

دروستکردنی قوتابخانەکان، بەرەنجامی شکستی خێزان یاخود زیادبوونی برێکی زۆر لە توندوتیژی لەناو خێزانەکانەوە دروست بوو. بەمانایەکی تر وەک ئۆشۆ دەڵێت: دەبێت بە فۆرمێکی نوێ لە خێزان تێبگەین، هەنوکە تەمەنی سود و بەکەڵکهاتنەکەی، یاخود زەرووەرەتەکەی، خەریکە تەواو دەبێت، لەڕاستیدا ئێمە پرۆگرام کراوین لەسەر ئەوەی کە خێزان هاوبەشیکردنێکی گەورەیە لە جیهاندا، بەڵام ڕاستەقینەکە جیاوازە.

برێک جار خێزان بەندینخانەیە، دەیەوێت کۆنترۆڵی لەسەر منداڵان و ژنان بەتایبەتی بهێڵێتەوە، خێزان گرووپێکی بەرتەسکی خەڵکە و ئەوان ئەم بەندیخانەیان پیرۆز کردووە. هەندێک لەوانەی دژی دامەزراوەی خێزان دەوەستنەوە ئارگۆمێنتیان بۆ ئەو کارە ئەوەیە کە خێزان ڕێگرە لە (گەشەی ڕۆحی) ئەگەر لە سەردەمێکدا ئەم بابەتە جێگەی تێڕامان و قسە لەسەرکردن نەبووبێت و برێک لە ڕاستی تێدا بووبێت، بە دەلیلی ئەوەی زۆرینەی زانا و گەورەکانی مێژووی مرۆڤایەتی، تەنهاییان هەڵبژاردووە بۆ داهێنان و تێڕامانەکانیان، بە مانایەکی تر پێمان دەڵێن، کە زۆرینەی ئەو مرۆڤانە لەدەست خێزان و ئەو فۆرمە لە خێزان هەڵهاتوون کە پڕە لە قەرەباڵخیی و کێشە، ئەگەرنا لەدەست جیهان ڕایان نەکردووە، چونکە هەموو شوێنێکی ئەم دنیایە بەشێکە لە جیهان و دواتریش گەڕاونەتەوە ناو خێزان و کەسوکارەکانیان.

کەواتە ئەگەر لە سەردەمی کۆندا (تێڕامان و تەنهایی و گۆشەنشینی و خەڵوەت) وەک جۆرێک لە سەر پەرژان و دەلاقەی بیرکردنەوە بینرابێت، ئەی لە ئەمڕۆدا کە سیستەمی سەرمایەداریی و بەجیهانیبوون و مۆدێرنە، شەشدەر (سەروخوار، ڕاست و چەپ، پێش و پاش)ی لە مرۆڤ گرتووە و تەنانەت لەژێر دەریا و لەناو ئەشکەوت و لەسەر لوتکەی (ئەڤرێست)یش لێیناگەڕێ و تێکەڵی ئەو قەرەباڵخییەی دەکاتەوە، چۆن چۆنی دەتوانین ڕاڤەی نوێ بۆ ئەو دۆخە بکەین؟ لەلایەک کاری هەرەوەزیی و پێکەوەیی گرەنتی گەشەسەندن و بازدانی مرۆڤایەتییە و لەلایەکی تریشەوە هەڵهاتن و تەنهایی هۆکارێک بووە بۆ ئامادەسازیی زیاتر؟ هەرچی هەرەوەزیی و پێکەوەیی و زاڵبوون بەسەر درم و گرفتە گەورەکانی جیهان هەیە بەرەنجامی کاری گەورەی (خێزان و کۆمەڵگا و دەوڵەتان)ە، باشترین نموونەش کاری پێکەوەیی دەوڵەتانی دنیا بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی کۆرۆنا ڤایرەس بوو، هەرچی بیرکردنەوە و داهێنانە گرنگەکانیشە، برێکجار بەرهەمی تاکگەرایی و تاکەکەسی بووە، چونکە تاک هەمیشە لە قەرەباڵخیدا شتگەلێکی زۆر لەدەستدەدات.

ئەمانە و چەندین پرسیاری تر کە دەکرێت داهاتوو وەڵام بە زۆریان بداتەوە، چونکە هەر جۆرە وەڵامێک لە ئێستادا ناتوانێت هەمووان ڕازی بکات. بەڵام تاکە شتێک کە دەتوانێت هەمووان ڕازی بکات، سەرەڕای هەموو ڕەخنە و تێبینیەک کە لەسەری هەیە (خێزان)ە،




مرۆڤ وەک هەر زیندەوەرێکی تر جگەلەوەی بەرەنجامی کۆمەڵێک هاوکێشەی، ئالگۆریتم (بایۆکیمیای)یە، کە خۆنەویستانە بەدوای وەڵامدانەوەی پێداویستییە بنچینەییەکانی ژیاندا دەڕوات، بەڵام بەدوای کۆمەڵە شتێکی تریشدا دەڕوات، کە هیچی کەمتر نییە لە پێداویستییە بنچینەییەکانی وەک (ئاو، هەوا، سێکس، خواردن). کە ئەویش (ئاسایشی کۆمەڵایەتی)ە، ڕێز و پێزانینی ئەوانی ترە، هاندان و پشتگیریکردنە، دەستلەپشدان و دەستگرتن و دڵنەوایی کردنە، هاوبەشیکردنە لە خۆشیی و ناخۆشییەکاندا. ڕەنگە بۆ بەشێکی زۆری زیندەوەرەکانی سەر ئەم هەسارەیە تەنها ئەوەندە بەس بێت کە ساڵی جارێک جووتبوون ڕووبدات بەمەبەستی خستنەوەی وەچە، بەڵام ئەمە لای مرۆڤ بڕێک زیاترە، ئەو ڕێوڕەسم و مەرج و مەرجکاری داناوە، لەناو ئەم ڕێورەسمانەدا، هێڵی باریک و نەبینراو، شتی بچووک و درک پێنەکراو هەیە، کە مانای زیاتر دەبەخشێ بە مرۆڤ.

بۆئەوەی لە پانۆرامای وێنە گەورەکە تێبگەین، بۆئەوەی بزانین خێزان چۆن لەو هاوکاریی و هەرەوەزییەوە بەرە و فەردانیەت و تاکگەرایی دەڕوات، بۆئەوەی تێبگەین لەوەی کە چوار پێنج ماڵ و خێزان لە خانوویەکدا بوون، کەچی ئێستا تەنانەت یەک خێزان لە ماڵێکدا ناتوانن جێیان بێتەوە و ڕۆژ بەڕۆژ ئامارەکانی جیابوونەوە زیاتر دەبن.

زیادبوونی ژمارەی شوقەی تەنها و ئۆتۆمبێلی تایبەت و کۆمەڵگەی نیشتەجێبوونی دابڕاو بەجۆرێک کە هەر تاکێک لە ماڵێکدا ئۆتۆمبێلی خۆی و سیمکارتی خۆی و شوقەی خۆی هەبێت، جگەلەوەی کە حوکمی سەپاندنی سیستەمی سەرمایەداری بێت، حوکمی هەنگاونانە بەرەو تاکگەرایی کە بەجۆرێک لە جۆرەکان دووبارە یەکانگیر دەبێتەوە لەگەڵ بەرهەمەکانی جیهانگیری و مۆدێرنە. ئەو پەیمانە کۆمەڵایەتییەی کە (جۆن لۆک) و (تۆماس هۆبز) و (ژان ژاک ڕۆسۆ) باسی دەکەن، تەنها بەمەبەستی ڕێکخستنی سیستەمی سیاسیی و کارگێڕی نییە، بەڵکو بۆ تەواویی هەموو سیستەمەکان ئەگونجێ، ناشتوانین لەم دۆخە تێبگەین هەتا گشت ئەو شتانە نەخوێنینەوە کە تایبەتە بەم مێژووی دروستبوونە.

مرۆڤ لە جەنگەڵدا هیچ یاسا و ڕێسایەکی نوسراوی نەبوو، ئەو بەتەوایی ئازاد بوو کەس نەبووە پێی بڵێ چی ڕاستە و چی ناڕاست، چی یاساییە و چی نایاسایی، بەڵام هیچ زەمانەتێکی پاراستن و مانەوەی نەبوو، بۆیە سەدان ساڵ بوونی مرۆڤ لەسەر ئەم هەسارەیە هیچی لە ژیانی هەسارەکە نەگۆڕیوە تا ئەو کاتەی کە پەیمانەکان دەبەستن و مرۆڤ لە جەنگەڵ دێنە دەرەوە (گەرچی ئەمەش ڕەخنەی لەسەرە)، بەڵام قۆناغێکی گەورەی بازدان بووە بۆ نیشتەجێبوون و زۆربوون.

مرۆڤ لە تەنهایی و گۆشەگیری ناو ئەشکەوت و جەنگەڵەکان هاتە دەرەوە، بەکورتی دەستبەرداری بەشێک لە مافەکانی خۆی بوو لەپێناو پاراستن و ئاسایشی خۆیی و خێزان و منداڵەکانی، وردە وردە یاساکان نوسرانەوە، دادگا و سەرباز و پایەکانی دەسەڵات بەهێزکران، زیندان و قەرەوڵ دروستکران، مەراسیمە کۆمەڵایەتییەکانی وەک ژنهێنان و

شوکردن و منداڵ خستنەوە لە پێداویستی مانەوەوە، گۆڕا بۆ پێداویستی تر، بۆ کەیف و سەفا، بۆ شەوە ئاهەنگ و بازدان و لادان، کردنەوەی یانەی شەوانەکان و بازرگانی کردن بە مرۆڤ بەگشتی و ژن و منداڵ بەتایبەتی، ئەوەی کە لە جەنگەڵی پێش پەیمانی کۆمەڵایەتیدا مرۆڤ بەزەبری بازوو، یان بۆ پێداویستی بەدەستی دەهێنا، لە پاش پەیمانی کۆمەڵایەتی بەزەبری یاسا و بەهاکان، بەدەستی دەهێنا. بۆیە مرۆڤ کەوتەوە یادی ئەو ڕۆژانەی کە بەتەنها لە جەنگەڵدا دەژیا، ژیانێکی بڕێک خراپ و ترسناک، پڕ لە شەڕ و شۆڕ و دڕندە و تاریکی، بەڵام بڕێکی زۆر ئازاد و تەنها، لێرەوە بیرۆکەی شۆڕش و ئازادی بۆ یەکەمجار سەریهەڵدا، مرۆڤ کەوتە بیرکردنەوە دەربارەی هەڵهاتن و ڕووخاندن.

ڕووخاندنی هەموو ئەو دیوارانەی کە مرۆڤ بەدەوری خۆیدا دروستی کردوون، دیواری (یاسا، بەهاکان، سیستەمە ڕامیارییەکان، دیواری خێزان و... هتد)، هەوڵیدا دوبارە پەلاماری ئەمانە بداتەوە و تێکیان بشکێنێ و بگەڕێتەوە بۆ ئەو ڕۆژانەی کە تەنها و تەریک لە سوچی دارستانێکدا دەژیا. لێرەوە چیرۆکەکە بە بەردەوامی خۆی دووبارە دەکاتەوە، چیرۆکی دروستکردن و ڕووخاندن، چیرۆکی کۆتوبەند و هەوڵدان بۆ ئازادی، چیرۆکی وابەستەیی و پابەندبوون، لەگەڵ گەڕان بەدوای  ئازادی و سەربەستی. بۆیە تاکگەرایی و تەنها کەوتنی خێزانیش، بەدەر نییە لەم چیرۆکەی کە (پەیمانی کۆمەڵایەتی) بۆی نوسیوینەتەوە بەفۆرمێکی بچووکتر.

تۆماس هۆبز بەڕێوەبردنی خەڵک لەلایەن دەوڵەتەوە بە زەرورەت دەزانێ، هۆبز بڕوای وایە بوونی هێز و دەسەڵات گرنگە کە بتوانێت خەڵکی لە ئەنجامدانی ئاژاوەگێڕیی و کردەوەی خراپ بوەستێنێت و ڕێگریان لێبکات، ئەگەرنا کۆمەڵگە دەبێت بە دارستانگەلێک کە تێیدا مرۆڤ بەرامبەر بە براکەی خۆی لە گورگێک زیاتر هیچ نییە. هەندێک پێیانوایە ئەو هەڵوەستەیەی هۆبز لەبارەی دەسەڵاتەوە، لەگەڵ تاکگەراییدا ناگونجێت، چونکە لە بنەمادا ئەم بەڕێوەبردنە لەپێناو بەرژەوەندیی تاک و دابینکردنی ئاسایش بۆ هەمووان و یەکسانی لە نێوان مافەکاندا دروستبووە. لێرەوە چیرۆکی بەڕێوبردنی خێزان و هەموو ئەو شتانەی کە بەسەریدا دێن و ڕوودەدەن هەمان چیرۆکەکەی پەیمانی کۆمەڵایەتییە، لەوانە (ناچاریی و قسەی خەڵک و ڕێکخستنی عورف و بەهاکان و ڕێزگرتن لەو شتانەی کە کۆمەڵگا لەسەری ڕێککەوتوون)، بۆیە مرۆڤ بڕێکجار ناتوانێت بۆ هەتا هەتایە لەژێر قەهری ئەم سەپێنراوانەدا بەرگە بگرێت ناچار هەوڵدەدات دووبارە مانیفێستی هەموو ئەوانە بکاتەوە.

بێرک خەمە  پێیوابووە کە تاک سەرەڕای هەبوونی کۆمەڵێک مافی سرووشتی تایبەت بەخۆی، بەستراوەتەوە بە کۆمەڵێک بابەتی دیکەوە کە لەلایەن خێزانەکەیەوە بۆی ماوەتەوە. بەهۆی ئەم بۆمانەوەیە ئێمە بە ناچاری کۆمەڵێک هاوسۆزیی و ئەرکمان بۆ دروستبووە بەرامبەر بە هەندێک شت. هەر هاوسۆزیی و ئەرکێکیش کە لەناو کۆمەڵگادا بۆ تاکێک دروست ببێت، درێژکراوەی هەمان ئەو هاوسۆزیی و ئەرکانەیە کە تاک پێشتر





لەناو خێزاندا بۆی ماوەتەوە و پەیوەست بووە پێیانەوە.

ملنەدانی مرۆڤ بۆ هەموو ئەو ڕێسا و یاسایانەی کە بەسەریدا سەپێنراون و شەڕکردن بۆ لێسەندنەوەی ئەو دەسەڵاتە لە خێزان و گەڕاندنەوەی بۆ تاک لە سیما و خەسڵەتە هەرە سەرەکییەکانی مرۆڤی ئەم سەردەمەن. ئەگەرچی لە هەندێک ڕووەوە سوودی هەبووە، بەڵام تاکگەرایی زیانی زۆری بە مرۆڤی سەردەم گەیاندووە، لە سادەترینیانەوە کە بریتییە لە تەنیابوونی تاک و لاوازبوونی تەونی کۆمەڵایەتیی و بەشداریی تاک لە کایە کۆمەڵایەتییەکاندا، تا دەگاتە زیاتر بڵاوبوونەوەی نەخۆشییە دەروونییەکانی وەک خەمۆکیی و خۆکوژیی و کەسێتیی دژەکۆمەڵ و تاوان و هتد.

پاش نەمانی کۆرۆناش، ڕەنگە تا سەردەمێکی تر مرۆڤەکان سڵ لە جەستەی یەکتریی و هەناسەی یەکتریی و نزیکی یەکتری بکەنەوە. ئەمەش بەپێچەوانەی دەرەنجامگیریی ئەوانەیە کە دەڵێن کۆرۆنا کۆیکردووینەتەوە و کۆماندەکاتەوە. ڕەنگە نۆرمی ژیان لە ڕووی کۆمەڵایەتییەوە زیاتر و زیاتر بەرەو تاکگەرایی هەنگاو بنێت. کەواتە تاکگەرایی بڕێک جار مەبەستدارە و بڕێک جاریش بێ مەبەستە و لە دەرەوەی ئیرادەی خێزان و کۆمەڵگادایە، (هەڵبەت لێرەدا ئیشی ئێمە وەک توێژەر ئەوە نییە لە قازانجی یەکێکیان بنوسین دژی ئەوی تریان، بەڵکو دەبێت ڕاستەقینە چۆنە بەوشێوەیە لێی بتوێژینەوە).

هەرچەندە دەرکەوتنی کۆرۆنا ڤایرەس بەشێوەیەک لە شێوەکان تێکەڵی کۆمەڵێک دەستەواژەی سیاسی و ئابووریمان دەکات، بەڵام ئەوەی لەڕووی کۆمەڵایەتییەوە بۆ ئێمە گرنگە، کە کۆرۆنا بۆ خۆی نزیکترین و بەهێزترین ئارگۆمێنتی ئەو پاڵپشتییەیە کە جیهان بەرەو تاکگەرایی هەنگاو دەنێت بەجۆرێک، ئەو هەموو نائارامیی و قەرەباڵخیی و ژاوەژاوەی کە پێمان وابوو بەرهەمی جیهانگیرین و بەردەوام ڕووبەڕووی لۆمەکردن و ڕەخنە دەکرایەوە، کۆرۆنا ڕاڤە و لێکدانەوەی نوێی بۆ هێنایەوە کایە، بەجۆرێک کە خێزانەکانی لەیەکتری دابڕی، کە تەنانەت دایک و باوک و کوڕ و کچ سەردانەکانیان بۆ لای یەکتری سنوردار کردبوو تا دەگاتە، وەستانی ملیۆنان گەشت و داخستنی هەزاران یاریگا و کارگە و کۆبونەوەی سالانە. کەواتە (ئاین، کولتور، بەهاکان و... هتد) چەندێک پەیوەندیان بە وابەستەیی و لێکترازانی ئەم باسەوە هەیە، ئەوەندەش شتە نوێ نەزانراوەکان کە لە داهاتوودا دێن ئەگەری ئەوەیان هەیە مرۆڤایەتی بەرەو تاکگەرایی زیاتر بەرێت.

**جیهانگیریی و تەکنەلۆژیا و پەرتبوونی زیاتری خێزان**

ڕەنگە لەم نوسینە کورتەدا بواری ئەوە نەبێت پێناسەی چەمکەکان و دیتێڵێکی مێژوویی بۆ ناونیشانەکە بکەین، پێشینان دەڵێن (گوێز بەژماردن مایەکەی دیارە)، ڕەنگە هیچ شتێک وەک ئامار و داتا نەتوانن ئاستی مەترسی ئەم بابەتە ڕوونبکەنەوە، بۆیە لێرەدا چەند زانیارییەک دەخەینە ڕوو:

- پێگەی تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان بەگشتی و لەنێویشیاندا فەیسبوک و ئینستا و تیکتۆک

و مەسینجەر و وەتسئاپ و... هتد، بەهۆکارە هەرە خێرا و لەپێشینەکان دادەنرێت بۆ جیابوونەوەی خێزانی و دیاردەی تەڵاق.

ڕۆژنامەی (ئیندیپدێنت) لەسەر زاری کۆمەڵەی پارێزەرانی ئیتالیا و ئەکادیمیای پارێزەرانی ئەمریکا بڵاویکردۆتەوە کە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان بەگشتی هۆکارێکی خێران بۆ جیابوونەوەی هاوسەران، بەجۆرێک تەنها لە ئەمریکا٢٠٪ حاڵەتەکانی تەڵاق و جیابوونەوە، هۆکارەکەی ڕاستەوخۆ دەگەڕێتەوە بۆ بەکارهێنانی فەیسبووک. لە ٤٠٪ی حاڵەتەکانی جیابوونەوە و خیانەتی هاوسەرگیری لە ئیتالیا دەگەڕێتەوە بۆ ئەو ئاسانکارییانەی کە تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان لە پەیوەندیگرتندا بەردەستی خستووە، بەتایبەتی مەسینجەر و وەتسئاپ. هەروەها پێگەی (دیفۆرس ئۆنلاین) لە ساڵی ٢٠١١ ڕایگەیاند، کە یەک لەسەر سێی حاڵەتەکانی جیابوونەوەی هاوسەران لە بەریتانیا هۆکارەکەی بەهۆی تۆڕەکۆمەڵایەتییەکانەوەیە. لەلایەکی ترەوە بەشی ئاراستەکردنی خێزانی لە ئیمارات ڕایگەیاند کە (٥٠٠٠) دۆسییەی دادگا کە لە بواری توندوتیژی خێزانی تۆمارکراوە، زیاتر لە ٦٠٪ بەهۆی تۆڕەکۆمەڵایەتییەکانەوە بووە.

لە هەرێمی کوردستان لە هەر ٤ پرۆسەی هاوسەرگیری یەکێکیان بە جیابوونەوە کۆتایی دێت و لە پارێزگای سلێمانیش لەهەر ٣ پرۆسەی هاوسەرگیرییەک یەکێکیان بە جیابوونەوە کۆتایی دێت. بەڕێوەبەرایەتیی پلان و ئاماری ئەنجوومەنی دادوەریی هەرێمی کوردستان ئاماری مامەڵەی ئەنجامدراوی دادگاکانی بۆ ساڵی ٢٠١٩ بڵاوکردەوە، لە کۆی(٣٢٤٣٢) پرۆسەی هاوسەرگیری(٨٣٨١) پرۆسەیان بە جیابوونەوە کۆتاییان هاتووە بەڕێژەی (٢٥,٨٪) بەمشێوەیە:

- پارێزگای هەولێر لە (١١١٤٤) پرۆسەی هاوسەرگیری (٣١١٥) پرۆسەیان بە جیابوونەوە کۆتایی دێت بەڕێژەی (٢٨٪).

پارێزگای سلێمانی لە (١١٠٣٣) پرۆسەی هاوسەرگیری (٣٤٤٨) پرۆسەیان بە جیابوونەوە کۆتایی دێت بەڕێژەی (٣١,٣٪).

پارێزگای دهۆک لە (٨٣٢٢) پرۆسەی هاوسەرگیری (١١٢٩) پرۆسەیان بە جیابوونەوە کۆتایی دێت بەڕێژەی (١٣,٦٪) .

- گەرمیان لە (١٩٣٣) پرۆسەی هاوسەرگیری (٦٨٩) پرۆسەیان بە جیابوونەوە کۆتایی دێت بەڕێژەی (٢٨٪).

بەپێی ئاماری پێنج مانگی ئەمساڵ جگە لە شارەکانی هەرێمی کوردستان، زۆرترین حاڵەتی جیابونەوە لە عێراقدا لە بەغدای پایتەخت بووە کە (١٢٣٧٣) حاڵەت بووە، لەکاتێکدا (٣٣٩٤٠) پرۆسەی هاوسەرگیری هەر لە بەغدا و لە دادگاکان تۆمارکراوە، پارێزگای موسەنناش کەمترین حاڵەتی جیابونەوەی تێدا تۆمارکراوە کە ٤١٨ حاڵەت بووە. کە بەشی هەرە گەورەی ئەم ئامارانە هۆکارەکەی (تۆڕەکۆمەڵایەتی)یەکانە کە ڕێگاکانی تاکگەرایی ئاسان و نزیککردۆتەوە و درز و کەلێنەکانی خێزانی گەورەتر و فراوانتر کردووە.

د.کریستن نۆرتمان دەڵێت: تەکنەلۆژیا بە جۆرێک کاریگەری خراپی دروستکردووە کە لە نێوان (٥) خێزاندا، یەکێکیان تووشی لێکترازان و هەڵوەشاندنەوە دەبێت، چونکە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان ڕێگا خۆشکەرن بۆ دروستبوونی پەیوەندی نوێی نادروست کە دواجار خیانەتی هاوسەرگیری لێدەکەوێتەوە. لەگەڵ ئەوەشدا بەکارهێنانی ماڵپەڕە وروژێنەرەکان کە ساڵانە زۆرترین سەردانکەریان هەیە کاریگەرییەکی لە ڕادەبەدەر خراپ لەسەر خێزانەکان دروست دەکات. هەروەها چەند زیانێکی دیکەی تۆڕە کۆمەڵایەتییەکانی دیکەی بۆ ئاشکرا کردوین کە تێیدا ئاماژە بەمانە کراوە:

■ کەمبوونەوەی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان و یەکتر بینین. ■ خەڵکی پەیوەندی ڕووبەڕوویان بیر دەچێتەوە و کاتەکانیان تەنیا بەرامبەر شاشە بەسەر دەبەن. ■ دانیشتنی زۆر و کات بەسەربردن لەگەڵ تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان دەبێتە هۆی توشبوون بە قەڵەوی. ■ هۆکارێکی بەهێزە بۆ ئالودەبوون و بەهەدەردانی کاتی زۆر.

**خشتەی ئامارەکانی (هێڵی گەرمی ١١٩)**

بەڕێوەبەرایەتی گشتی بەرەنگاربوونەوەی توندوتیژی دژی ئافرەتان/ بەشی ئامار
بەڕێوەبەرایەتی بەرەنگاربونەوەی توندوتیژی دژی ئافرەتان/ سلێمانی
فۆرمی ئاماری پەیوەندییەکانی هێڵی گەرم
کۆی ئاماری (٣)، ساڵ (٢٠١٩-٢٠٢٠-٢٠٢١)
کۆی پەیوەندی وەرگیراو (١٥١٦٦)

**١. ئاماری پەیوەندییەکان:**

| پەیوەندییەکان | ژمارە |
|---|---|
| پێدانی ڕێنمایی و ڕاوێژ | ١٢٣٦٣ |
| هەواڵەکردن بۆ سەنتەری ڕاوێژکاری | ٥٣٧ |
| هەواڵەکردن بۆ نوسینگەکان | ١٨١٠ |
| هەواڵەکردن بۆ تیم مۆبایل | ٤٥٦ |
| کۆی گشتی | ١٥١٦٦ |

**٢/ ڕەگەزی پەیوەندییەکان:**

| ڕەگەز | مێ | نێر | کۆی گشتی |
|---|---|---|---|
| ژمارە | ١٣٢٣٥ | ١٩٣١ | ١٥١٦٦ |

**٣/ ڕەگەزنامەی پەیوەندییەکان**

| ڕەگەزنامە | کورد | عەرەب | تورکمان | بیانی | کۆی گشتی |
|---|---|---|---|---|---|
| ژمارە | ١٤٨٥٥ | ٣٠٤ | - | ٧ | ١٥١٦٦ |

### ٤/ شوێنی پەیوەندییەکان

| شوێن | ناوشار | قەزا | ناحیە | گوند | کەمپ | کۆی گشتی |
|---|---|---|---|---|---|---|
| ژمارە | ١٣٦٥٦ | ٩٨٥ | ٣٩٥ | ١٢٩ | ١ | ١٥١٦٦ |

### ٤/ ئاماری جۆری کێشەکان

| پەیوەندییەکان | ژمارە |
|---|---|
| توندوتیژی خێزانی | ٥٠٩٩ |
| بەکارهێنانی مادەی هۆشبەر | ٢ |
| بڵاوکردنەوەی وێنە لە تۆری کۆمەڵایەتی | ٥٣٧٣ |
| هەڕەشەی کوشتن | ١٥٤ |
| جیابوونەوە | ٦٦ |
| زامدارکردن | ٤٥ |
| شەڕکردن | ١٩٢ |
| بەزۆر بەشودان | ٢٤ |
| ڕێگەگرتن لە هاوسەرگیری | ٥٢ |
| زۆر لێکردن بۆ لەشفرۆشی | ٢٢ |
| زەوت کردنی منداڵ | ٦٤ |
| خەڵەتاندن | ٤٧١ |
| هێنانی ژنی دووەم | ٣١ |
| ناپاکی هاوسەرگیری | ٢٨٥ |
| کێشەی میرات | ٢٧ |
| بێبەشکردن لە سەرمایە و دەرفەت یان خزمەتگوزاری | ٤٧ |
| سوکایەتی پێکردن | ٤٢٢ |
| جنێودان | ٤٠٣ |
| بێزارکردنی جەستەی | ٥٩ |
| لێدان | ٤٨٢ |
| لە ماڵ دەرکردن | ١٤١ |
| سواڵ پێکردن | ١١ |
| خواردنەوەی مەشرووب | ١٢٤ |
| بێزارکردن بە تەلەفۆن | ٤٨١ |
| هەوڵی کوشتن | ٢٢ |
| هەوڵی خۆکوشتن | ٨٠ |
| هەڕەشەکردن | ٢٧٥ |
| ونبوون | ١٣٢ |
| گێچەڵ و دەستدرێژی سێکسی | ٩٩ |
| تۆمەت دروستکردن | ١٦٩ |
| بەندکردن لە ماڵەوە | ١٧ |
| بازرگانیکردن | ٥٥ |
| بەزۆر جیاکردنەوە | ٣٠ |
| خراپی باری ئابووری | ١٧٠ |
| خراپی باری دەروونی | ٤٠ |
| کۆی گشتی | ١٥١٦٦ |




**ڕاڤەی ئامارەکانی هێڵی گەرمی ١١٩ ی پارێزگای سلێمانی**

١. تەنها لە شاری سلێمانیدا زیاتر لە (١٥٠٠٠) پەیوەندنی تەلەفۆنی لە ماوەی سێ ساڵدا ئەنجامدراوە تایبەت بەگرفت و کێشە خێزانییەکان.

٢. لە کۆی ئەو ژمارەیە (٥٣٧٣) پەیوەندییان تایبەتە بە هە{ەشە و بڵاوکردنەوەی وێنە و ڤیدیۆ لە تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان وەک لێکەوتەکانی تاکگەرایی و جیهانگیری.

**ئاماری توندوتیژییەکانی دژی ئافرەتان و خێزان لە هەرێمی کوردستان کۆی (١٢) مانگی ساڵی (٢٠١٩)**

| شوێن | کوشتن | خۆکوشتن | خۆسوتان | سکالا | سێکسی |
|---|---|---|---|---|---|
| هەولێر | ١٦ | ٢٩ | ٣٥ | 44٩٤ | ٥٤ |
| دهۆک | ٧ | ١٧ | ٢٧ | 2449 | ٢٧ |
| سلێمانی | ١٢ | ١٦ | ٢٣ | ٣١٢٧ | ٤٩ |
| گەرمیان | ١ | ٠ | ٠ | 989 | ٩ |
| ڕاپەڕین | ٣ | ٣ | ١٠ | 579 | ١٥ |
| سۆران | ٢ | ٤ | ٨ | 269 | ١ |
| کۆی گشتی | ٤١ | ٦٩ | ١٠٣ | 11٩٠٧ | ١٥٥ |

**ڕاڤەی ئامار**

ژمارەی ئەو کێشە جۆربەجۆر و دۆسییەیانەی توندوتیژی خێزانی کە لە نوسینگەکانی بەڕێوبەرایەتی بەرەنگاربوونەوەی توندوتیژی دژی ئافرەتان و خێزان، وەک پەڕاوی لێکۆڵینەوە تۆمارکراون و خراونەتە بەردەستی دادگا زیاتر لە (١١٠٠٠) پەڕاوی لێکۆڵینەوەی خێزانی لە هەرێمی کوردستاندا هەبووە تەنها لە ساڵی (٢٠١٩)دا.

**ئاماری لیژنەی ئاشتەوایی (١ ال ١١/ ٢٠٢٠)**

| ئەنجامی دۆسیەکان | ژمارە |
|---|---|
| ئاشتبوونەوە | ٢٣ |
| ئاشتنەبوونەوە | ٢٨٧ |
| ئامادە نەبوون | ١٣٤ |
| دواخستن | ١٢٣ |
| کۆی گشتی | ٥٤٩ |

**ڕاڤەی ئامار/**

تەنها لە ماوەی یانزە مانگدا لە ساڵی (٢٠٢٠)دا زیاتر لە (٥٠٠) دۆسیە لەلایەن دادگای لێکۆڵینەوەی توندوتیژی خێزانی ڕەوانەی (لیژنەی ئاشتەوایی خێزانی) کراوە، کە پێکدێن لە ژمارەیەک شارەزای دادی لە بوارەکانی (یاسایی، دەروونی، کۆمەڵایەتی) بەمەبەستی ئەوەی ئاشتەوایی لەو دۆسیانەدا بکرێت، کە لە مادەی (٥)ی یاسای ژمارە (٨)ی ساڵی (٢٠١١) (یاسای بەرەنگاربوونەوەی توندوتیژی خێزانی لە هەرێمی کوردستان) ئاماژەی پێدراوە.

بەڵام بەداخەوە ئاستی شلەژانی خێزانی گەیشتووەتە شوێنێک زۆرجار زۆر بەزەحمەت دەتوانرێت ئاشتەوایی لە نێوان خێزانەکاندا بکرێت.

**قسەی کۆتایی سەبارەت بەم بابەتە:**

١. ئەگەر ئاووهەوا و ژینگە و یاساکانی سرووشت بتوانن کاریگەرییان لەسەر شاخ و ڕووبار و دەریا و تۆپۆگرافیا بەگشتی هەبێت، کەواتە ژینگەی کۆمەڵایەتیی و سیاسیی و پێشکەوتنە ئابووریی و تەکنەلۆژییەکان زۆر خێراتر کاریگەرییەکانی خۆیان لەسەر مرۆڤایەتی بەگشتی و خێزان بەتایبەتی جێدەهێڵن.

٢. شریتی هێڵکاری خێزان وەک شریتی هێڵکاری گشت کایەکانی تر بەردەوام تووشی هەڵکشان و داکشان دەبێت لە سەردەمێکەوە بۆ سەردەمێکی تر، دەڕواتە سەرەوە و لە شوێنێکدا دیسان دێتەوە خوارێ، هەروەک چۆن جەنگ و ئاشتی، کاریگەری لەسەر بۆرسەی ئابووری هەیە، هەر بەوچەشنە زۆر شتی تر هەن کاریگەرییان لەسەر بەها و بۆرسەی کۆمەڵایەتی و خێزانییەکانیش هەیە.

٣. وەک چۆن لە سرووشتدا (شیری دایک) جێگرەوەی نییە، هەر بەوچەشنە خێزانیش جێگرەوەی نییە، هەروەک چۆن هەندێک پێدراوی سرووشتی تایبەت لە شیری دایکدا هەن، هەر بەوچەشنە هەندێک پێدراوی کۆمەڵایەتی – دەروونی هەن تەنها لە خیزاندا دەست دەکەوێت.

٤. ئەو خزمەتگوزارییانەی کە لە دەرەوەی دامەزراوەی خێزان پێشکەش دەکرێت، ئەکرێت زۆر باشتر و گونجاوتر بێت، لە هۆتێلێکدا نوستن و جلشتن و خۆشتن و زۆرشتیشت دەست دەکەوێت، هەتا ئەوکاتەی پارە بدەیت، یان دەوڵەت لە ڕێگەی دامەزراوەی جیاجیاوە پارەکەی بدات، بەڵام هەرکات ئەو یارمەتییە بڕدرا خزمەتگوزارییەکانیش دەبڕدرێن یاخود لاواز دەبن، تەنها خێزانە کە بێ بەرامبەر هەموو شتێک دەبەخشێت.

٥. فۆرم و شێوازەکانی خێزان بە بەردەوامی گۆڕانی بەسەردا دێت وەک ئەو ڕووبارەی ڕێڕەوی خۆی دەگۆڕێ، وەک ئەو سرووشتەی کە سەرچاوەی داهات دەبەخشێ و کەم دەکات و زیاد دەکات، بۆیە گۆڕانی خێزان و فۆرمەکەی مەترسیدارنین بەو ئەندازەیە، بەڵکو بازدانی نائاکاریی و پێچەوانەیی مەترسییە.

٦. ناتوانین لەم باسە وردتر تێبگەین ئەگەر تێگەیشتنێکی وردترمان نەبێت بۆ بابەتەکە لەڕووی مرۆڤناسی (ئەنترۆپۆلۆژیا)وە، واتا هەموو ئەو هۆکارانەی کە تا ئێستا شیکاری تاکگەرایی و کێشە خێزانییەکانمان پێکردووە، بەتەنها ناتوانن ئەنجام و هۆکاری ئەو دۆخە بدەن بەدەستەوە هەتا، لەڕووی مرۆڤ ناسییەوە، لە خودی مرۆڤ و ڕەفتار و بیرکردنەوەکانی تێنەگەین، کە ئەمڕۆ دەیان قوتابخانەی شیکاریی و لێکدانەوەی ڕەفتاریی و دەرونشیکاریی و ڕەمەکی، لێکدانەوە بۆ سرووشتی ئاڵۆزی مرۆڤ دەکەن، بە کورتی واتا بابەتەکە تەنها پەیوەست نییە بە جیهانگیریی و ئابووریی و ڕامیارییەوە، بەڵکو

سروشت و دەروونی مرۆڤ و ڕەفتاری مرۆڤ ئەو لایەنانەن کە تائێستاش کەمترین زانیاری لەبەردەستدان.

٧. کۆمەڵناسی عێراقی عەلی وەردی دەڵێ:-کۆمەڵگای مرۆڤایەتی قەت لە کێشە خاڵی نابێت، ئەو کێشانە هێمای ژیان و دروشمی جوڵەی بەردەوامی مرۆڤن، چونکە کێشە مرۆڤ هاندەدات بۆ چارەسەرکردنی، بەوەش مرۆڤەکان دابەش دەبن و ململانێ دەکەن، لێرەوە مرۆڤ تێدەگات کە بەشێکی زیندوو مانەوەی پەیوەندی بە ململانێوە هەیە، هەرچی خەونی توباوییە لە هێنانەدی کۆمەڵگایەک کە هیچ جۆرە شەڕەشەق و کێشەیەکی تێدا نەبێت، ئەوە تەنیا بۆ دنیای فریشتەکان بەکەڵک دێت نەک ئەم جیهانەی کە ئێمەی تێدا دەژین.

٨. ئەگەر خودای گەورە بیوستبایە، هەموو خەڵکی دنیای دەکردە یەک کۆمەڵ و یەک خێزان و یەک نەتەوە و یەک ئاین، بەڵام لەبەر هەر حیکمەتێک کە خۆی دەیزانێت ئەو کارەی نەکرد، لێگەڕا کە کۆمەڵگا و خێزان و نەتەوەکان مانا و فۆرمی جیاواز جیاواز وەربگرن.

{وَلَوْ شَاءَ رَبُّكَ لَجَعَلَ النَّاسَ أُمَّةً وَاحِدَةً وَلَا يَزَالُونَ مُخْتَلِفِينَ} هود-١١٨

٩. ئەگەر شۆڕشی پیشەسازی لە قۆناغێک لە قۆناغەکاندا دەستکاری بەشێکی گەورەی ژیان و ژیاری مرۆڤایەتی کردبێ و سەرجەم کۆمەڵناس و دەروونناس و مرۆڤناس و ئابووریناسەکانی خستبێتە سەر کەڵکەڵەی لێکدانەوەی ڕاڤەی نوێ، ئەوا ئەمڕۆ تەکنەلۆژیا ئەمەندە بەخێرایی دەستکاری ژیانی مرۆڤ دەکات ڕەنگە فریای لێکدانەوەی دیاردەیەک نەکەوین، سەتان دیاردەی تر بکاتە بابەتی ڕۆژ.


### سەرچاوەکان

١- تەفسیری ڕامان، ئەحمەد کاکە مەحمود، چاپی شەشەم، ٢٠٢٠.
٢- د.محمد خیر شەعال: ئامادە سازی بۆ ژیانی هاوسەری، و.ڕێدار ڕەوف.
٣- یوڤاڵ نوح هەراری: هۆمۆدیۆس، و.عەلی نادر.
٤- د.علی وردی: واعیزەکانی سوڵتان، و.عەبدوڵڵا جەبار، چاپی دووەم، ٢٠٠٦.
٥- ڤۆڵڤگانگ سۆفسکی: توندوتیژی وەک ئەزموون، گۆڤاری ڕەهەند.
٦- ئۆشۆ: پیاو، و.بەرهەم ناودەشتی، چاپی دووەم، ٢٠١٥.
https://www.britannica.com/topic/individualism-٧
-https://www.cato-unbound.org/2015/08/03/lauren-k-hall/family-٨
foundation-moderate-social-individualism
-social media, dictionary.cambridge.org, Retrieved 16-12-2020. Edited-٩
١٠- علی محمد: وسائل التواصل االجتماعي وأثرها على المجتمع، ٢٠٢٠/٢/٢٥، ص ١٩.



د.یەحیا عومەر ڕێشاوی

# کاتێك سۆشیال میدیا فوو دەکاتە سیاسەتمدارێك

# دۆناڵد ترامپ وەك نموونە

دەستپێك

هەمیشە کایەی میدیایی لەلایەن سیاسییەکانەوە بۆ بەرژوەندی خۆیان بەکارهێنراوە و فەزای میدیایی کراوەتە ئامرازێك بۆ جێبەجێکردنی ئەجێندای سیاسییەکان، لە شۆڕشی فەرەنسییەوە بۆ جەنگە جیهانییەکان، لە جەنگی ساردی نێوان ولایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا و یەکێتی سۆڤیەتی جارانەوە بۆ بەهاری عەرەبیی و دەیان ڕووداوی سیاسی دیکە، هەمیشە میدیا لەناو جەرگەی سیاسەتدا گەمەی کردووە و هەندێك جار بووەتە ئامرازێك بۆ فووتێکردنە دەسەڵاتێکی سیاسی یاخود حزبێکی سیاسی یاخود کەسایەتییەکی سیاسی، بە دیوێکی دیکەشدا هەر خودی میدیا پەردەی لەسەر دەمامکەکان هەڵداوە و ڕووی ڕاستەقینەی حزبی سیاسیی و دەسەڵاتی سیاسیی و کارەکتەری سیاسی دەرخستووە و ئەرکی چاودێریی دەسەڵاتە سیاسییەکانی جێبەجێ کردووە.

جگەلەوەی بەسەرنجدان لە ڕەوشی میدیای جیهانیی و لە پاڵ تێکەڵبوونی بەکایەی سیاسی، قۆرخکارییەکی گەورە لە بواری میدیادا دروست بووە و ڕۆژ بە ڕۆژ ئیمپراتۆریەتە میدیاییەکان لەسەر ئاستی جیهان دروست دەبن و دەستبەسەر کایەی میدیاییدا دەگرن، لە ئێستادا زۆرینەی کۆمپانیا زەبەلاحەکانی بواری میدیا لەسەر ئاستی جیهان دەکەونە باکووری گۆی زەویی و بەتایبەت لە ولایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، سەرچاوەی تۆڕی جیهانیی ئینتەرنێت و تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان هەر لەو وڵاتەن و ئەمەش ڕەنگە ببێتە مەترسییەک بۆ سەر ئازادی ڕادەبرین لە جیهاندا و هەڕەشەیەک بۆ قۆرخکاریی میدیایی.

لەم ڕوانگەیەوە، ئەگەرچی مێژووی کاری سیاسی لە ولایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا تێکەڵ و لێوانلێوە بە مومارەسەی کاری سیاسی، ئەگەرچی بانگەشەی سیاسی هەڵبژاردنەکان و ئیدارەدانی کاری سیاسی ئەو وڵاتە یەکسانە بە بەکارهێنانی کارای فەزای میدیایی و ئەگەرچی سوپایەک لە میدیاکاران لە پشت مومارەسەی کاری سیاسییەوەن و سەرکردە سیاسییەکانی ئەمریکا بە ڕێژەی جۆراوجۆر سوودیان لە کایەی میدیایی وەرگرتووە بۆ جێبەجێکردنی ئەجێنداکانیان، بەڵام پێناچێت هیچ سیاسەتمەدارێکی ئەمریکیی بە ئەندازەی سەرۆکی پێشووی ئەمریکا (دۆناڵد ترامپ) خۆی خزاندبێتە نێو کایەی میدیاییەوە و تیشکی میدیایی لەسەر بووبێت و خۆی وەک میدیاکار و چالەکەوانێکی تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان نمایش کردبێت!

### سەرۆکی وڵات یاخود چالاکوانی تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان

دۆناڵد ترامپ چل و پێنجەمین سەرۆکی ئەمریکا لە ساڵانی (٢٠١٧ – ٢٠٢١)، مشتومرێکی گەورەی لەو ماوە کورتەی سەرۆکایەتی خۆیدا دروست کرد و مەیدانی بەشێکی زۆر لەو مشتومڕە سەکۆی میدیا و بەتایبەت تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان بوو، لە کاندیدبوونی، لە بانگەشەی هەڵبژاردنی، لە دەستپێکی حوکمڕانییەکەی، لە ئان و ساتی مومارەسەی دەسەڵاتەکانی وەک سەرۆک و دواجاریش کۆتایی قۆناغی سەرۆکایەتییە سەیر و سەمەرەکەی، لە سەرجەم ئەو قۆناغانەدا بەردەوام میدیا و تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان حزورێکی بەرچاو و شێتانەیان لە ئیدارەدانی حکومەتەکەیدا هەبووە، بە جۆرێک نەتدەزانی ئایا ئەم کارەکتەرە سیاسییە سەرۆکایەتی گەورەترین و بەهێزترین وڵاتی دونیا دەکات، یاخود نمایشکار و میدیاکار و چالەکەوانی تۆڕەکۆمەڵایەتییەکانە؟!

وەک هەردوو نووسەر مەریوان وریا قانع و ئاراس فەتاح دەنووسن: لە هیچ شوێنێکدا پەیوەندیی نێوان ئەم میدیا کۆمەڵایەتییە تازانە و ڕووداوە سیاسییە گەورەکان بەو ڕاستەوخۆییە دیار نییە، وەک لە سەردەمی سەرۆکایەتیی (دۆناڵد ترامپ)دا لە ئەمریکا، ئەو یەکەمین سیاسیی مێژووە کە سۆشیالمیدیا جومگەیەکی سەرەکیی هەڵمەتی هەڵبژاردنەکەی و دیاردەیەکی گرنگی حوکمڕانیی و سەرۆکایەتییەکەی بوو لەو چوار

ساڵەدا. ئەم پیاوە بەدرێژایی ماوەی سەرۆکایەتییەکەی ڕۆژانە لانیکەم ١٨ تویتی نووسیوە و بە جیهاندا بڵاویکردۆتەوە، کە بەسەریەکەوە زیاد لە ٢٥٠٠٠ تویتە. لە سەرەتای سەرۆکایەتییەکەیدا ڕۆژانە نزیکەی ٩ تویتی ناردووە، بەڵام لە مانگی ئۆکتۆبەری ٢٠١٩ دا ئەم ژمارەیە بەرزدەبێتەوە بۆ ٢٧١ تویت لە یەک هەفتەدا !، ترامپ لەسەر تویتەر ٨٨ ملیۆن فۆلۆوەر و لەسەر فەیسبووک ٣٥ ملیۆن و لەسەر ئینستەگرامیش ٢٤ ملیۆن و لەسەر یوتیوبیش ٢,٧ ملیۆن فۆلۆوەری هەبووە.

وێرای بەکارهێنانی چالاکانەی تویتەر، ترامپ لێزانانە تۆڕی کۆمەڵایەتی فەیسبووکی بەکارهێنانەوە و بودجەیەکی زەبەلاحی بۆ تەرخانکردووە و هەندێک لە چاودێران پێیانوایە ترامپ نزیکەی ١٢٥ ملیۆن دۆلاری لە بانگەشەی هەڵبژاردندا تەنها لە تۆڕی کۆمەڵایەتی فەیسبووکدا خەرجکردووە و ئەوەش ژمارەیەکە کە هیچ کاندید و سەرکردەیەکی ئەمریکی پێش خۆی پێی نەگەیشتووە.

دۆناڵد ترامپ شێواز و ستایلی مامەڵەی فەرمییانەی سەرکردە سیاسییەکانی ئەمریکای گۆڕی لە بەکارهێنانی میدیا وەک ئامرازێک و ڕایەڵێک بۆ گەیاندنی پەیام و ڕێنمایی و بڕیارەکانیان، بۆ بوون بە ئامرازێکی میدیایی هەمیشە ئامادە!، ئەو بە تویتەکانی و بە پۆست و بۆچوونە سەیرەکانی و بە موتابەعەی بەردەوامی بۆ فەزای تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان، ئیحراجیەکی گەورەی بۆ کەناڵە ئاسمانیی و ڕادیۆ و ڕۆژنامە بەوبانگەکانی ولایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا و جیهان دروست کردبوو، تەنانەت بە گاڵتە جاڕییەوە ئاماژەی بەو کەنالانە دەدا و لە کۆنگرە ڕۆژنامەییەکاندا سوکایەتی پێ دەکردن، سەکۆی تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان کەسایەتی (دۆناڵد ترامپ)ی لە سەرکردەیەکی سیاسییەوە گۆڕی بوو بۆ دەزگایەکی میدیایی هەرائامێز و پڕ لە مشتومڕ، فەزای تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان و تویتەر بە تایبەتتر لە هەموو ئەوانی تر فووی کردبووە ئەم سەرکردە سیاسییە و بەرزبوونەوەی ژمارەی فۆلۆوەرەکانی بۆ نزیک لە ١٠٠ ملیۆن کەس بەتەواوی شاگەشگەی کردبوو، تەنانەت تویتەکانی کردبووە سەرچاوەی دارایی و تویتەکانی وەک پشک لە بازاڕ و بۆرسە ئابوورییەکانی جیهاندا مامەڵەی لەگەڵدا دەکرا و قازانجی خەیاڵی لێ دەکردن و بەهای هەر تویتێکی گەیشتە نزیکەی ١١٧ هەزار دۆلار! ئەو بەم شێوازە مامەڵەی لەگەڵ تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان بە ئاشکرا بە کەناڵە میدیاییە فەرمیەکانی وڵاتەکەی و جیهانی دەوت، کە من خۆم بتوانم لەگەڵ جەماوەرەکەم و هاوڵاتیانی ئەمریکا گفتوگۆ بکەم و پەیام و بڕیارەکانیان ئاڕاستە بکەم، ئیتر بۆچی ئێوە زەحمەت بکێشن و سەرئێشەتان بۆ دروست بکەم؟!




**مامەڵەی سەیر و سەمەرە لەگەڵ ڤایرۆسی** (کۆڤید ١٩)

بە هەڵبژاردنی دۆناڵد ترامپ بە سەرۆکی ولایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، ئیدارەی ئەمریکیی و دۆناڵد ترامپ و جیهان کەوتنە نێو تاقکیردنەوەیەکی سەختەوە، ئەویش بە بڵاوبوونەوەی زۆر خێرای ڤایرۆسی (کۆڤید ١٩)، یاخود ئەوەی بە پەتای (کۆرۆنا) ناوبانگی دەرکرد، سەرەتای پەتاکە لە (چین)ەوە سەریهەڵدا و دواتر بە جیهاندا شێتانە بڵاوبوویەوە، زۆربەی وڵاتان دوچاری ڕاڕایی و شپرزەیی مامەڵە کردن لەگەڵ ئەم پەتا جیهانییە بوون، بەڵام واپێشبینی دەکرا کە ئەو وڵاتانەی ئەزموون و مێژوویەکی تۆکمەیان لەگەڵ ئەم جۆرە پێشهانەدا هەیە باشتر بتوانن مامەڵە بکەن و زووتر بەسەر قەیران و کێشەکەدا زاڵ ببن، بەڵام شپرزەیی و ڕاراییەکە تاڕادەیەکی زۆر هەمووانی گرتەوە.

دۆناڵد ترامپ وەک چۆن لەسەر هەمووشت پۆست و لێدوانی هەبوو، خێرا لە ڕێگەی تۆڕەکۆمەڵایەتییەکانەوە کەوتە گاڵتەپێکردن و سوکایەتی بە ئیدارەدانی حکومەتی چین بۆ پەتاکە، بێئاگا لەوەی لە پاش چەند مانگێک وڵاتەکەی دەبێتە یەکەم وڵات لەسەر ئاستی جیهان لە ژمارەی قوربانیانی دەست ئەم پەتا جیهانییە و حکومەتەکەی خۆی لە بەرامبەر ئەم ڤایرۆسەدا دەستەوسان دەوەستێت، تەنانەت دواتر بنەمای بانگەشە و هەڵمەتی خۆکاندیدکردنی (جۆ بایدن) ڕەخنەگرتن بوو لە شێوازی مامەڵەی ترامپ و ئیدارەکەی لەگەڵ پەتاکە و بە ئیدارەدانێکی لاوازی ناوزەند دەکرد.

بەڵام دۆناڵد ترامپ دەیویست لە ڕێگەی فەزای تۆڕەکۆمەڵایەتییەکانەوە، بڵاوبونەوەی ئەم ڤایرۆسە و پەتاکە بکاتە سەکۆیەک بۆ تەسفییەی حسابات لەگەڵ نەیارانەکانی لە ناوخۆ و دەرەوەی وڵات و بە تویتەکانی لە تۆڕی کۆمەڵایەتی تویتەر و بە پۆستەکانی لە تۆڕی کۆمەڵایەتی فەیسبوک و سەکۆکانی دیکەی تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان، لەسەر بڵاوبوونەوە و تەشەنەکردنی پەتاکە دەیویست سۆزی هەوادارانی بۆ خۆی ڕاکێشێت و شەڕی خۆی  بەسەر نەیارانیدا لە پارتی دیموکراتەکان بباتەوە.

ترامپ هەندێ جار خۆی لەبیر دەچوویەوە کە سەرۆکی وڵاتە و خۆی لێ دەبوویە پزیشک و لە ڕێگەی تۆڕەکۆمەڵایەتییەکانەوە تەشخیسی نەخۆشییەکەی دەکرد و تەنانەت چارەسەریشی بۆ دەدۆزییەوە.

دەکرێت شێوازی مامەڵەی سەیری دۆناڵد ترامپ لەگەڵ پەتاکە لەم چەند خاڵەدا کورت بکەینەوە:

-بڵاو کردنەوەی چۆنێتی خۆپارێزیی و مامەڵە لەگەڵ پەتاکە لە ڕێگەی ئەکاونتی تایبەتی خۆی، نەک لە ڕێگەی دەزگا فەرمییەکانەوە.

-ناوزەندکردنی ڤایرۆسەکە بە (ڤایرۆسی چینی)، دیسان لە ڕێگەی تویتێکەوە لە ئەکاونتی تایبەتی خۆی.

-بڵاوکردنەوەی ڕێنمایی تەندروستیی! بە ئامۆژگاریکردنی هاوڵاتیان بە بەکارهێنانی

مەوادی پاکژکەرەوە بۆ خۆپارێزیی و چارەسەری پەتاکە!

-ڤایرۆسەکە لە تاقیگەکانی شاری (ووهان) ی چینییەوە دزەی پێکراوە و وەک جەنگێک دژ بە ولایەتی یەکگرتوەکانی ئەمریکا.

-باوەڕ نەبوون بە کەرەنتینە کردن و ڕێنماییە تەندروستییەکان.

-پێشنیازی ترامپ بەناردنی توشبووانی کۆرۆنا بۆ زیندانیی گوانتانامۆ! یاخود کەرەنتینە کردنیان لە یەکێک لە بیابەنە دوورەکان! و بڵاوکردنەوەی ئەم پێشنیازەی لەڕێگەی تۆڕەکۆمەڵایەتییەکانەوە.

**هاواریان لێ بەرز بوویەوە!**

شێوازی مامەڵەی دۆناڵد ترامپ لەگەڵ تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان و بەتایبەت (تویتەر)، هەرایەکی گەورەی لەنێو ناوخۆی ولایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا دروستکرد، کاتێک بەرپرسان و هاوڵاتیانی ئەمریکا، لەبری ئەوەی دەبوو لەڕێگەی وتەبێژی فەرمیی و دەزگا پەیوەندیدارەکان و کەناڵە باوەڕپێکراوەکانەوە، پێشهات و بڕیارەکانی دانان و لابردن و ڕێکەوتن و ڕێنماییەکانی دەوڵەت بۆ پەتای کۆرۆنا و ململانێکیان لەگەڵ چین و ئێران ببینن و ببیستن، دەیانبینی کاتژمێر حەوتی بەیانی و پاشتر بەدرێژایی ڕۆژەکە! ئەم سەرکردە سەرکێشە هەموو ئەوانەی تێپەڕاندووە و لەڕێگەی چەند وشەیەکی تویتەرەکەیەوە کۆتایی بەهەموو شت هێناوە! بەم ڕەفتارە نامۆیانەی ترامپ هەمووانی شپرزە کرد، ئەو تەنها سەغڵەتیی بۆ ئیدارەی ئەمریکی و کۆنگرێس و سیاسەتی دەرەوی ئەمریکا دروست نەکرد، بەڵکو کۆمپانیا زەبەلاحەکانی وەک (تویتەر و فەسبووک و یوتوب)ی خستە نێو گێژاوێکەوە و نەیاندەزانی چۆن ڕووبەڕووی ئەم شێوازە مامەڵەی دۆناڵد ترامپ ببنەوە؟!

لەنێو ناوەندە سیاسیی و چاودێرییەکاندا داواکاری بەرزبوویەوە بۆ سنوردانان بۆ ئەم ڕەفتارەی ترامپ و تەنانەت داواکردن بە داخستنی ئەکاونت و پەیجەکانی، لە وڵاتێکی تەواو ئازادی وەک ولایەتەیەکگرتووەکانی ئەمریکا ئاسان نییە سانسۆر بخرێتە سەر دەربڕین و تێڕوانین و دیدگای کەسێک و هاوڵاتییەکی ئاسایی، نەخاسمە ئەو هاوڵاتییە کەسی یەکەم و سەرۆکی وڵات بێت، بەڵام ئەوەی بە تەعبیری عەرەبی (پشتی وشترەکەی شکاند)، هێرشی هەواداران و لایەنگرانی دۆناڵد ترامپ بوو بۆ سەر کۆنگریسی ئەمریکا و دروستبوونی مەترسییەکی گەورە لەسەر سیستمی دیموکراتی و ئاسایشی نەتەوەی ئەمریکا، ئەوە بوو لە پاش ئەو هێرش و شالاوە  بۆ سەر هەستیارترین دەزگای ئەمنیی و سیاسی ئەمریکا (کە یەکەم جارە لە مێژووی ئەمریکا ڕوودەوای لەو شێوەیە ڕوودبدات)، سەرجەم ئەکاونت و پەیجە تایبەتییەکانی داخران و تەنانەت لە تۆڕی کۆمەڵایەتی تویتەر سەرجەم فۆڵۆوەرەکانی خرانە سەر ئەکاونتی سەرۆکی نوێی ئەمریکا (جۆ بایدن)!

تەنانەت خودی ئەم داخستنەش جارێکی تر بوویەوە بە هەراو مشتومڕی نێوان چاودێرانی




سیاسیی و میدیایی و یاسایی لە ولایەتەیەکگرتووەکانی ئەمریکا، بەجۆرێک هەندێک پێانوابوو کە ئەم جۆرە بڕیارانە هەڕەشەیە بۆ سەر ئازادی ڕادەربڕین و پێدانی دەسەڵاتێکە بە کۆمپانیاکانی پەیوەندیکردن لە سەروو دەسەڵاتی خۆیانەوە و ئەمە بیانوو دەداتە دەست ئەو کۆمپانیایانە کە هەرکات ویستیان و ئارەزوویان کرد سانسۆر دەخەنە سەر سەکۆی دەربڕینی کەسێک، ئەمەش بەتەواوی دوورە لە بنەماکانی دیموکراسیەت و ئازادی دەربڕین، کە ولایەتەیەککگرتوەکانی ئەمریکای لەسەر بونیادنراوە، لە بەرامبەر ئەو تێڕوانینە بەشێکی زۆر لە چاودێران بە هەنگاوێکی گرنکیان داناوە و پێیانوایە ئەوە بڕیارە دروستەکەیە و ئەگەر ئەو بڕیارە نەدرایە ئەوا دەسەڵاتی سیاسیی و دیموکراسیەت و ئاسایشی ئەمریکا لە بەردەم هەڕەشەیەکی گەورەدا دەبوون، تەنانەت نەتەوە یەکگرتووەکانیش لە ڕێگەی وتەبێژەکەی (ستیڤان دوچاریک)ەوە هەڵوێستی خۆی لەمبارەیەوە بە پشتگیریی دەربڕیی و بە بڕیارێکی دروستی تۆڕەکۆمەڵایەتییەکانی دانا و بەوپێیە نابێت میدیا و تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان ببنە سەرچاوەیەک بۆ نانەوەی دووبەرەکیی و هاندانی توندوتیژی.

ئەگەرچی هەموو ئەم هەرایانە ئەم سەرکردە سەرکێشەی نەوەستاند و جارێکی تر لە ڕێگەری تۆڕی کۆمەڵایەتی(GAB)وە هاتەوە بە ڕووناکی میدیایی و هێرشی توندی کردە سەر تۆڕەکۆمەڵایەتییەکانی وەک فەیسبووک و تویتەر و ئەوانی دیکە.

## دەرەنجام

لەم شرۆڤەوە دەگەینە ئەم دەرەنجامانە:

یەک: دۆناڵد ترامپ وەک سەرکردەیەکی سیاسیی و سەرۆکی بەهێزترین وڵاتانی جیهان، بەباشی دەرکی بە گرنگی و بایەخی تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان کردووە و هەم کات هەم بودجەیەکی گەورەی بۆ تەرخانکردووە.

دوو: فەزای تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان لەلایەن (دۆناڵد ترامپ)ەوە بەشێوەیەکی زۆر سەیر و جیاواز لە هەموو سەرکردەکانی جیهان و ولایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا بەکارهێنراوە و بەشێکی زۆر لە دەرکەوتن و ئەو هەرایەی لەسەر ئاستی جیهان لەسەر دروست بوو، بەهۆی سەکۆی تۆڕەکۆمەڵایەتییەکانەوە بوو.

سێ: ئەم تەرزە لە بەکارهێنانی فەزای تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان، بوویە مایەی سەغڵەتیی بۆ کەناڵە میدیاییە تەقلیدییەکانی وەک ئاژانسەکانی هەواڵ و کەناڵە ئاسمانییەکان و ڕۆژنامە بەناوبانگەکانی ئەمریکا و جیهان.

چوار: ژمارەی فۆڵۆوەر و لایک و تویت و کۆمێنت و هەوادارانی (دۆناڵد ترامپ) نەبوونە فریادڕەسی، بەڵکو هەر خودی ئەو فەزا گریمانەییە بوویە سەرەخۆرەی و دواجار دوچاری شکستێکی گەورە هات، لە بەرامبەر ڕکابەرە سەرسەختەکەی (جۆ بایدن).

پێنج: ڕاستە فەزای تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان فەزایەکی کراوەیە و سەکۆیەکی گرنگی

دەربڕینی سەرنج و تێڕوانین و ئازادی ڕادەربڕینە، بەڵام کاتێک ئەم فەزایە دەبێتە مەترسی بۆ سەر بەرژەوەندی گشتی و ئاسایش وڵاتێک، سنوری بۆ دادەنرێت و ڕێگەی لێ دەگیرێت.

شەش: کۆمپانیاکانی تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان هەژموونێکی سیاسییانەی گەورەیان هەیە و دەتوانن ڕێگە بگرن لە سەرکردەی بەهێزترین وڵاتی جیهان لە بەشداریکردن لەو فەزا ئەلیکترۆنییە گریمانەییە.

حەوت: بەم شێوازە مامەڵەی دۆناڵد ترامپ ئەوەی تۆختر کردەوە، کە فەزای تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان سەکۆی یەکەمی جوڵەی سیاسییە لەسەر ئاستی جیهان و بەشێکی زۆر لە کێشمەکێشم و ململانێ سیاسییەکان گوازراونەتەوە بۆ نێو ئەم گۆڕەپانە میدیاییە.

هەشت: لەپاڵ مەترسی ڕێکخراوە تیرۆریستییەکان و هێرشی وڵاتێک بۆ سەر وڵاتێکی دیکە، دەکرێ فەزای تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان ببێتە مەترسی بۆ سەر ئاسایشی نەتەوەیی وڵاتێک و پێویستە مامەڵەی خێرای لەگەڵدا بکرێت و بڕیاری یەکلاکەرەوەی بۆ بدرێت.

نۆ: ولایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا وڵاتێکی دەزگاییە، کاتێک سەرکردەیەکی سیاسی ئەرکە سەرەکییەکەی خۆی لەبیر دەکات و دەزگا فەرمییەکانی تێدەپەڕێنێت، سزا دەدرێت و لەخاڵێکدا دەوەستێنرێت.

دە: وەک چۆن تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان کارەکتەری سیاسی دروست دەکات و فووی تێ دەکات و دەیکاتە ئەستێرە و ناوبانگی بۆ دروست دەکات، بەهەمان شێو هەر خودی ئەو فەزایە زەبری خۆی لەم کەسایەتییە دەدات و دەبێتە فاکتەری شکست و خۆرئاوابوونی.

## سەرچاوەکان


١- https://ar.wikipedia.org/wiki/ دونالد ترامب على مواقع التواصل الاجتماعي.

٢-https://www.aljazeera.net/news/humanrights/ هل يحق لشبكات التواصل الاجتماعي  حظر دونالد ترامب؟

٣-سۆشیال میدیا: لە کایەیەکی کۆمەڵایەتییەوە بۆ دەسەڵاتێکی سیاسیی / مەریوان وریا قانع- ئاراس فەتاح، سایتی درەو میدیا - https://drawmedia.net/page_detail?smart-id=٧٦٥٩

٤-ڤیدیۆ واڵێک سەبارەت بەکارهێنانی تویتەر لەلایەن دۆناڵد ترامب لە سایتی NRT.

٥-سایتی ئاژانسی ئەنادۆل، نەتەوەیەکگرتووەکان پشتگیری داخستنی ئەکاونتەکانی دۆناڵد ترامپ دەکات، https://www.aa.com.tr/ar/

٦-السيناريو الكابوس.. عندما أراد ترامب إرسال مرچی كوفيد إلى غوانتانامو، https://www.aljazeera.net/news/



ئەحمەد قادر عەلی

# بیردۆزی میدیایی بەشداری دیموکراسییانە و کەسێتی خەیاڵی لە میدیای نوێدا

دەستپێک

ئەو گۆڕانکارییانەی کە لە ماوەی ٢٠ ساڵی ڕابردوودا لە بواری تەکنەلۆژیای ئامرازەکانی پەیوەندیکردنەوە هاتووەتە ئاراوە لەلایەک گۆڕانکاری گەورەی لە ڕەوتی میدیای جیهانیدا دروستکردووە، لەلایەکی دیکەوە مانای تازەی بە چەمکەکانی تاکگەرایی و کۆمەڵگە بەخشیوە. لەکاتێکدا گفتوگۆکان دەربارەی کاریگەری میدیای کلتووری (ڕادیۆ، ڕۆژنامە و بەتایبەت تەلەفزیۆن) گەرم و گوڕە، واخەریکە میدیای نوێ (کۆی ئەو بڵاوکراوانەی کە بەشێوەی ئەلیکترۆنی بڵاودەکرێنەوە و چاپ ناکرێن) جێگە بەو میدیا کلتوورییە لێژ دەکات، بەتایبەت تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان وەک بەشێک لە میدیای نوێ لە سەرجەم بوارەکانی وەک سیاسی، کاری حیزبی و بانگەشەی هەڵبژاردن، پەیوەندی کۆمەڵایەتی و بواری ئابووری و بازرگانیدا شوێنپێی بە میدیای کلتووری لەقکردووە.

## گەشەی کۆمەڵگە و تەکنەلۆژیای پەیوەندیکردن

بەدرێژایی مێژوو هەر شارستانییەتێک خاوەنی کۆمەڵێک تایبەتمەندییە کە لەڕووی سیاسیی و کلتووریی و تەکنەلۆژیی و پەیوەندیکردنەوە لە شارستانییەتەکانی دیکە جیایدەکاتەوە. لە سەردەمی ڕاو و شکاردا ئامرازەکانی ڕاوکردن و لە قۆناغی کشتوکاڵیدا ئامرازە کشتوکاڵییەکان ڕەواجیان هەبووە، دواتریش لە سەردەمی پیشەسازیدا پاش دۆزینەوە و داهێنانە پیشەسازییەکان و بەرهەمهێنانی تەکنەلۆژیای پەیوەندیکردن ئیدی مرۆڤ گەیشتە قۆناغی پۆست پیشەسازیی و وایلێهاتووە ئێستا نوسینەکانیش لە ڕێگەی تەکنەلۆژیای ژمارەییەوە بە کۆد و هێما نیشان دەدرێت.

> **دروستکردنی جیهانێکی خەیاڵی لەناو تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان خولیا و مەبەستی بەشێکی زۆر لە بەکارهێنەرانی ئەو تۆڕانەیە بەتایبەت لەلایەن گەنجانەوە.**

ئێستا جیهان لە سەردەمێکدایە پێی دەگوترێت سەردەمی زانیاری و هێزی نەرم (Soft Power): «هێزی نەرم – Soft Power» وەک چەمکێک لەم ساڵانەی دواییدا بە فراوانی کەوتە بەر باس و لێکۆڵینەوە. Joseph S. Nye کە خاوەنی چەمکەکەیە بەم جۆرە پێناسەی دەکات؛ هێزی بەرهەمە نامادییەکانی هەر وڵات و کۆمەڵگەیەکە، کە خەڵکی وڵاتانی دیکە سەرسام بکات و وایان لێ بکات بەدواداچوون بۆ ئەو کۆمەڵگەیە بکەن و سەردانی بکەن.

دواجار تەکنەلۆژیای ئامرازەکانی پەیوەندیکردن و تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان بەپێچەوانەی بیردۆزەکەی مارشاڵ ماکلۆهان Marshall Mcluhan (گوندی جیهانی) کە پێیوایە، جیهان لە سایەی ئامرازەکانی پەیوەندیکردنەوە بووە بە گوندێکی جیهانی بچکۆلە. ئێستا مرۆڤ خۆی بە ئاسانی دەتوانێت لە ڕێگەی مۆبایلە زیرەکەکەی دەستییەوە کون و قوژبنی ئەم جیهانە مەزن و فراوانە تەی بکات، بۆ ئەمەش تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان باشترین هاوکار و ڕێبەر دەبن. لەگەڵ ئەوەشدا دروستکردنی جیهانێکی خەیاڵی لەناو تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان خولیا و مەبەستی بەشێکی زۆر لە بەکارهێنەرانی ئەو تۆڕانەیە بەتایبەت لەلایەن گەنجانەوە.

گۆڕانکارییە تەکنەلۆژییەکانی ئەم چەند ساڵە تێڕوانینی وەرگریان بۆ میدیا گۆڕیوە و ئیدی هاوڵاتی تەنها وەک وەرگر دانانیشێت پەیامەکانی سەرەوە وەربگرێت و بڵێت «ڕاست دەفەرموون قوربان»، بەڵکو ئێستا تاک بۆ خۆی نێرەرە، ڕۆژنامەوانی هاوڵاتییە و تەنانەت دەتوانێت خاوەن دەزگای ڕاگەیاندن بێت لە سیستەمی میدیای نوێ و تۆڕەکۆمەڵایەتییەکاندا.

## میدیای نوێ و تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان

ئەمڕۆ ئێمە لە بەردەم لێشاوێکی نوێی میدیایداین کە پێی دەگوترێت میدیای نوێ و تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان. ئەم جۆرە میدیایە لە یەک کاتدا هەلی بەدەستهێنان و بڵاوکردنەوەی زانیاری بۆ تاکەکان فەراهەم دەکات، لێرەدا تاکەکان بەدەر لە وشە و نوسین دەتوانن بە هێما و ئاماژە گوزارشت لە هەستەکانیان بکەن، لەهەمانکاتدا دەتوانن کاردانەوەکانیان بۆ پەیامی کەسانی دیکە بە ئاسانی بنێرن. لێرەوە دروستکردنی جیهانی خەیاڵی و تەنانەت هەوڵدان بۆ نیشاندانی کەسێتی تاک لەو جیهانە خەیاڵییەدا وەک بەشێک لە کەسێتی ڕاستەقینەی کەسەکە بووە بە ئامانجی سەرەکی بەشێک لە بەشداربووانی تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان بەتایبەت گەنجان. لەلایەکی دیکەوە هەر لەم سیستەمە نوێیەی میدیا و پەیوەندیکردندا چەمکی «سپێتی تاریک» هاتۆتە کایەوە: بەو مانایەی (هەموو شتێک ئاشکرا و ڕوون دەردەکەوێت، بەڵام لەڕاستیدا لە پشتی ئەو ڕووداوانەوە چەندین چیرۆک هەن کە هیچ کەس ئامادە نییە بۆ نزیکترین کەسی خۆیشی باس بکات).

هەرچەندە میدیای نوێ وەک چەمکێک لە سەرچاوەکان و بواری ڕاگەیاندندا بەکاردەهێنرێت، بەڵام لەلایەن بەشێک لە زانایانەوە تا ئێستا وەک چەمکێک و میدیایەکی جیاواز لە میدیای کلتووری قەبوڵ ناکرێت. بەهۆی ئەوەی چەمکی میدیا تا ئێستا لە لاهەستی (لاشعور) خەڵدا تەنها بۆ میدیای کلتووری دەزگا ڕاگەیاندنە زەبەلاحەکان بەکارهێنراوە ئاساییە ئەگەر لەم سەرەتاوە چەمکی میدیای نوێ بەو واتا فراوانەی کە مەودایەکی زۆری میدیا دەگرێتەوە وەرنەگیرێت و هەستی پێنەکرێت. لەلایەکی دیکەوە میدیای نوێ بە جۆرێک لە جۆرەکان تەواوی میدیا کلتورییەکانی دیکە لە هەناوی خۆیدا هەڵدەگرێت، بەو واتایەی کە لە ڕووپەڕی سایتێکدا لە ئینتەرنێت نوسخەی چاپکراوی ڕۆژنامە، لینکی پەخشی ڕادیۆ و تەلەفزیۆن بۆ وەرگران دانراوە، واتە دواجار میدیای کلتووریش دەبن بە بەشێک لە میدیای نوێ، ئەمە جگەلەوەی کە دەزگا میدیاییە کلتوورییە زەبەلاحەکان ئێستا چەند لە خەمی بەرهەمهێنانی میدیاییدا بن بە مانا کلتوورییەکەی هێندەش لە خەمی ئەوەدان چۆن خوێنەر، بیسەر و بینەر بۆ ئەو پەیامانەیان لە ڕێگەی میدیای نوێ و تۆڕەکۆمەڵایەتییەکانەوە بەدەست بخەن. تەنانەت بەشێک لە تەلەفزیۆنە جیهانییەکان بەشی «ڕۆژنامەوانی هاوڵاتی»یان لە سیاتی کەناڵەکەیاندا کردۆتەوە و سود لەو گرتانەیش وەردەگرن کە لەلایەن هاوڵاتییەوە بۆیان دەنێردرێت و وەک بەشێک لە پەخشی کەناڵەکەیان بڵاوی دەکەنەوە.

میدیای نوێ لە ڕۆژگاری ئەمڕۆدا بریتییە لە سایتە ئینتەرنێتییەکان، تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان، نامەکانی مۆبایل و ئامرازە تەکنەلۆژییەکانی دیکەی پەیوەندیکردن. مەبەست لە میدیای نوێ جیاواز لە میدیای کلتووری میدیایەکی ژمارەییە، تاکەکان لە یەک کاتدا وەرگر و نێرەری پەیامەکانن واتە کاریگەری دوو لایەنە تێیدا ڕوودەدات، خێرایی لە ناردن و وەرگرتنی پەیام

و کاردانەوەکاندا، خاوەن مەودایەکی فراوانە لەڕووی ژمارەی نێرەر و وەرگر و کات و شوێنی بڵاوکردنەوە و وەرگرتنی پەیامەکانەوە، لە هەموو ئەمانەش گرنگتر بەردەستبوونی ئەم میدیایەیە لە هەر کات و شوێنێکدا ئەگەر تۆڕی ئینتەرنێت لەو کات و شوێنەدا هەبێت.

لەگەڵ گەشەسەندنی تەکنەلۆژیای ڕاگەیاندن و فراوانبوونی بواری میدیا هەوڵی زانایانی بوارەکە بۆ ڕاڤەی کاریگەرییەکانی پەیامە میدیاییەکان و هەڵوێستی وەرگران دەستپێکردووە و بەردەوام بووە. لە سەدەی بیستەمدا بەگشتی قسە و باس لەسەر سیستەمەکانی ڕاگەیاندن بووە کە بە گشتی چوار سیستەمی سەرەکی هەبوون. ئەوانیش سیستەمی دەسەڵاتداری تاکڕەوی، سیستەمی سۆڤیەتی حیزبی، سیستەمی ئازادی و فرەیی، سیستەمی بەرپرسیارێتی کۆمەڵایەتی. لە یەکەم و دووهەمدا تاڕادەیەکی زۆر کاریگەری ڕاگەیاندن ڕوونە و پایەمە میدیاییەکان لە خزمەتی حیزب و دەسەڵاتدا دەبن. بەڵام لە دوو سیستەمەکەی دیکەدا بەهۆی بوونی ئازادییەوە کاریگەرییەکانی ڕاگەیاندن ڕێژەیی و گۆڕاو دەبن. هەر لەم چوارچێوەیەشدا چەندین بیردۆزی میدیایی دەربارەی کاریگەری پەیامەکانی دەزگا ڕاگەیاندن هاتنە کایەوە، لەوانەش بیردۆزەکانی (بیردۆزی لاسوێل، کاریگەری ڕاستەوخۆ، بیردۆزی گولە، دەرزی ژێر پێست، کاریگەری دوو قۆناغ، چاندن و پەروەردەکردن، بەکارهێنان و تێربوون، گێژاوی بێدەنگی و گوندی جیهانی و ...هتد). بەڵام هەموو ئەو بیردۆزانە باسیان لە کاریگەری دەزگا ڕاگەیاندنە کلتوورییەکان کردووە، ئەمەش بەهۆی ئەوەی لەو سەردەمەی ئەو بیردۆزانە دانراون تەنها (ڕۆژنامە، ڕادیۆ و تەلەفزیۆن) هەبوون.

لە سەردەمی ئێستا و دوای گەشەی فراوان و بەردەوامی ئامرازەکانی ڕاگەیاندن و پەیوەندیکردن و پاشان فەراهەمبوونی ئینتەرنێت و لەگەڵیشیدا سایتە ئەلیکترۆنی و تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان. ئیدی قسەکردن لەسەر میدیای نوێ وەک جێگرەوەی میدیای کلتووری بووەتە ڕۆژەڤی دەزگاکانی لێکۆڵینەوە لە جیهاندا. لەم ڕوانگەیەشەوە قسەکردن لەسەر کاریگەری ئەو پەیامانەی لە میدیای نوێ و بەتایبەتیش تۆڕەکۆمەڵایەتییەکاندا بڵاودەکرێنەوە پشکی شێریان بەرکەوتووە. بەتایبەتی لەکاتی بانگەشەی هەڵبژاردنەکان و ڕیکلامی بازرگانیدا هێندەی پشت بە تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان دەبەسترێت زۆر لەوە کەمتر پشت بە میدیای کلتووری و بانگەشە و ڕیکلامی چاپکراو دەبەسترێت. ئەمەش لەبەرئەوەی لەلایەک زۆرێک لە دەنگدەر و وەرگرانی پەیامەکان تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان بەهاردەهێنن و لەلایەکی دیکە ئەو «جیهانە خەیاڵییەی» کە هەرکەسێک تامەزرۆیەتی و هەوڵی فەراهەمکردنی دەدات بۆ خۆی لە تۆڕەکۆمەڵایەتییەکاندا زۆر بە ئاسانی بۆ وەرگر و دەنگدەر دروستدەکرێت و کاندیدی هەڵبژاردن یاخود بەرهەمی ڕیکلامبۆکراو جیهانێکی تەواو خەیاڵی بۆ دەنگدەر یاخود بەکاربەر دروستدەکەن، کە مەگەر هەر لە خەیاڵی مرۆڤدا یاخود لەو بەهەشتەی کە خودا بۆ مسوڵمانان بەڵێنی پێداون بەردەست ببێت.

لە بیرمان نەچێت کە دەزگا میدیاییە کلتوورییەکان تەنها بابەتە گرنگە سیاسی، کلتووری، کۆمەڵایەتی، ئابووریی و تەرفیهییەکانیان بڵاودەکردەوە، ئەمەش بەهۆی کەمی کات و شوێن لەو دەزگایانەدا. بەڵام لە میدیای نوێ و بەتایبەت تۆڕەکۆمەڵایەتییەکاندا هەموو بابەتێک بڵاودەکرێتەوە بەوردەکاری زۆریشەوە. تەنانەت بەشیک لە تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان تەنها بۆ کاتبەسەربردنی ٢٤ کاتژمێرییە نێرە و وەرگر کە لە یەک کاتدا تاک دەتوانێت هەردووکیان بێت پەیوەندییە کەسییەکانی خۆیان بۆ خەڵکی دیکەش بەیان دەکەن و وەک بەشێک لە ڕاگەیاندن ئەژماری دەکەن. بە بڕوای زانای پەیوەندی ڕاگەیاندن دەنیس ماک کوایل Denis Mc Quail کە خاوەنی بیردۆزی ئامرازی گەشەسەندنە لە میدیادا «سەرچاوە مرۆییەکان و تەکنەلۆژیا و ئابووری لەو وڵاتانەی کە لە قۆناغی گەشەکردندان جیاوازە لە وڵاتە گەشەسەندووەکان». لەبەر ئەمە ماک کوایل پێیوایە «ئامانجی سەرەکی میدیا و میدیای نوێ لەو کۆمەڵگایانەی کە لە قۆناغی گەشەسەندندان بریتییە لە گەشەپێدانی کۆمەڵایەتی».

### بیردۆزی میدیایی بەشداریکردنی دیموکراسی

گرنگترین بیردۆزێکی میدیایی کە بووەتە سەرچاوە بۆ شیکاریی و گەشەی میدیای نوێ بریتییە لە بیردۆزی میدیایی بەشداریکردنی دیموکراسی، بنەڕەت و ناوەڕۆکی بیرۆزەکە لەسەر میدیای نوێ وەستاوە و جەختی لەسەر دەکاتەوە. ئەم بیردۆزە وەک درێژکراوەی بیردۆزی لیبراڵی لە میدیادا وەک کاردانەوەیەک لە بەرامبەر دەستبەسەرداگرتنی ئامراز و دەزگاکانی ڕاگەیاندن لەلایەن چەند کەس و گرووپێکی دیاریکراوەوە و بە ناوەندیکردنی دەزگاکانی ڕاگەیاندن لەپێناو پاراستنی ئەخلاقیاتی کاری ڕۆژنامەوانی و بەرپرسیارێتی کۆمەڵایەتی و ڕێگا خۆشکردن بۆ بیرۆکراتیەت سەریهەڵدا. ئەم بیردۆزە پشت دەبەستێ بە بەشداریکردنی ئاسۆیی تاکەکانی کۆمەڵگە بە شێوەیەکی یەکسان لە بەڕێوەبردنی کۆمەڵگە و دەوڵەتدا لە بەرامبەر بەڕێوەبردنی سەر بۆ خواری دەوڵەت و کۆمەڵگە. بەشداریکردنی تاکەکانی کۆمەڵگە با لە نزمترین ئاستەکانیشدا بن لە بەڕێوەبردنی کۆمەڵگەدا وەک بنەمایەکی سەرەکی ئەم بیردۆزە دادەنرێت.

دەستبەسەرداگرتنی ئامراز و دەزگاکانی ڕاگەیاندن لەلایەن چەند کەس و گرووپێکی دیاریکراوەوە و بە ناوەندیکردنی دەزگاکانی ڕاگەیاندن لەپێناو پاراستنی ئەخلاقیاتی کاری ڕۆژنامەوانی و بەرپرسیارێتی کۆمەڵایەتی و ڕێگا خۆشکردن بۆ بیرۆکراتیەت هۆکاری سەرەکی دەرکەوتنی بیردۆزی میدیایی بەشداریکردنی دیموکراسییە. لەبەر ئەمە بیردۆزەکە پێیوایە کە ئامرازەکانی ڕاگەیاندن و تۆڕەکۆمەڵایەتییەکانیش وەک بەشێک لە میدیای نوێ پێویستە لەژێر کۆنترۆڵی خوێنەر، بیسەر، بینەر، وەرگر و بەکارهێنەرانی ئامرازەکانی ڕاگەیاندن و تۆڕەکۆمەڵایەتیەکاندا بن و هەلی یەکسان بۆ بەشداریکردنی

هەمووان لە میدیا و تۆڕە کۆمەڵایەتییەکاندا برەخسێنرێت. بەم جۆرە وەک چۆن ڕێگا خۆشدەکرێت بۆ بەشداری تاکەکان لە بەڕێوەبردنی کۆمەڵگە و دەوڵەتدا بەشێوەیەکی یەکسان بە سیستەمی ئاسۆیی، بە هەمانجۆر ئامرازەکانی پەیوەندی ڕاگەیاندن و تۆڕەکۆمەڵایەتییەکانیش دەبنە مەیدانێک بۆ دروستکردنی کاریگەری تاک و گرووپەکان.

پێویستە ئامرازە نوێیەکانی ڕاگەیاندن و تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان بەجۆرێک بەرهەم بهێنرێن و ڕێکبخرێن کە هەلی بەشداریکردنی گرووپە بچووکەکان و سود و بەرژەوەندی گشتی کۆمەڵگەی تێدا فەراهەم بکرێت. بیردۆزی میدیایی بەشداری دیموکراسیانە کە مافی بەدەستهێنانی زانیاری لەلایەن هاوڵاتیانەوە وەک بنەما ڕەچاوکردووە، بیردۆزی بەرپرسیاریتی کۆمەڵایەتی و ئامرازەکانی ڕاگەیاندنی گشتی بەوە تۆمەتبار دەکات کە لەپێناوی پاراستنی ئادابی گشتی و دۆخی ئاسایی کۆمەڵگەدا بە ڕێکخستنێکی ناوەندی (مەرکەزی) توند لەلایەن نوخبەیەکی دایریکراو و دەستڕۆشتووەوە بەڕێوەدەبرێت، هەر لەبەرئەمەشە پێیوایە ئامرازەکانی ڕاگەیاندن لە سایەی بیردۆزی بەرپرسیارێتی کۆمەڵایەتیدا نەیانتوانیوە ئەو خزمەتە پیشەکەش بکەن کە لێیان چاوەڕوان دەکرا.

> **میدیای نوێ جیاواز لە میدیای کلتووری میدیایەکی ژمارەییە، تاکەکان لە یەک کاتدا وەرگر و نێرەری پەیامەکانن واتە کاریگەری دوو لایەنە تێیدا ڕوودەدات.**

ئەم بیردۆزە بە هەموو جۆرێک دژی بە دامەزراوەییکردن و پرۆفیشناڵی و بێلایەنی و هێشتنەوەی دامەزراوە میدیاییە گشتییەکانە لەژێر دەستی دەوڵەتدا، واتە بەمانای وشە دەیەوێت کار لەسەر پەرەپێدانی چەمکی «ڕۆژنامەوانی هاوڵاتی Citizen Journalism» بکات و پەرە بە فرەیی لە کاری میدیا و ڕاگەیاندندا بدات. لەم چوارچێوەیەدا ئەم بیردۆزە بەدەوری چەمکەکانی ئازادی، جیهانێکی خەیاڵی و یەکسانیدا دەخولێتەوە. بەگوێرەی ئەم بیردۆزە دەبێت هەر ئامرازێکی ڕاگەیاندن هەلی بەشداریکردنی یەکسان بۆ سەرجەم وەرگر و بەکاربەرانی برەخسێنێت و بەتەواوی لەگەڵ ژیانی کۆمەڵایەتی خەڵکدا ئاوێتەی یەکدی ببن. لێرەدا مەبەست لە ئامرازەکانی ڕاگەیاندن زیاتر میدیای نوێ و تۆڕەکۆمەڵایەتییەکانە. ئەوەی لە ڕەنگدانەوەی پراکتیزەبوونی ئەم بیردۆزەدا دەردەکەوێت بریتین لە یەکسانی و ئازادی و نەبوونی چاودێریی و تاکگەرایی کە لە ئەنجامی پێشکەوتنی تەکنەلۆژیا و بەرهەمهێنانی ئامرازە نوێیە میدیاییەکانەوە هاتۆتە ئاراوە.

## بیردۆزی میدیایی بەشداری دیموکراسییانە و «جیهانی خەیاڵی»

ئەوەی تێبینی دەکرێت لەم بیردۆزەدا لەگەڵ ئەوەی باس لە کاریگەری تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان دەکرێت وەک نوێترین تەکنەلۆژیای سەردەم، لەگەڵ ئەوەشدا باس لە ڕۆڵ و کاریگەری تاک دەکات لە بەڕێوەبردنی کۆمەڵگە پاشان دەوڵەت و حکومەتدا و بە هەموو جۆرێک دژی ڕۆڵ و کاریگەری میدیا دەوڵەت و کۆمەڵگەیە بەسەر تاکەکانەوە. کەواتە بەشێکی بیردۆزەکە باس لە بەڕێوەبردنی کۆمەڵگە دەکات، کە ئەم بەشەیان زیاترە پەیوەستە بە کۆمەڵگە خۆرهەڵاتییەکان و بەتایبەت کۆمەڵگەی کوردییەوە وەک «کۆمەڵگەیەکی سوننەتی دواکەوتوو کە زیاتر سەرۆک عەشیرەت و خێڵەکان ڕۆڵ دەبینن لە بەڕێوەبردنی کۆمەڵگەدا و سیستەمی بەڕێوەبردن سیستەمێکە لەسەرەوە بۆ خوارەوەیە بڕیارەکان لە سەرۆک عەشیرەتەوە وەک «فەرموویەک-فەرموودەیەک» دەردەکرێت و دەبێت تاکەکانی ئەو کۆمەڵگە/عەشیرەتە پێوەی پابەند بن. بەڵام لەم بیردۆزەدا ئەو شێوازی بەڕێوەبردنە ڕەتکراوەتەوە و ڕۆڵی سەرەکی بە تاکەکان دراوە لە بەڕێوەبردنی کۆمەڵگە/خێڵ و عەشیرەتدا کە دواجار ئەوە تۆڕەکۆمەڵایەتییەکانن ئەو ڕۆڵەی تاک بەرجەستە دەکەن. بەڵام ئایا تا چەند ئەو تاکانە دەتوانن کەسێتییەکی ڕاستەقینە بۆ خۆیان دروستبکەن و دووربکەونەوە لە جیهانی خەیاڵی جێگەی پرسیارە.

ئەگەر تەماشای زانیارییە کەسییەکانی بەشێک لە بەکارهێنەرانی تۆڕەکۆمەڵایەتییەکانی کۆمەڵگەی کوردی بکەین بۆمان ڕووندەبێتەوە کە لەڕاستیدا جگە لە جیهانێکی خەیاڵی هیچی دیکە نییە، بەتایبەت کاتێک وێنەی سەرەکی یاخود وێنەی پشتەوەی لاپەڕەی گەنجێک لە تۆڕەکۆمەڵایەتییەکاندا سەیر دەکەیت واتێدەگەیت کە سەرۆک عەشیرەت بێت و لە سەرەوە بۆ خوارەوە «فەرموو-دە» دەربکات، بەڵام کە دێتە سەر ڕاستی بابەتەکان دەبینین ئەو کەسە تەنانەت توانای بەڕێوەبردنی خودی خۆیشی نییە.

بابەتێکی دیکە بڵاوکردنەوەی ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز، فەرموودەی پێغەمبەر (د.خ) و وتەی زانا و کەسایەتییە ناودارەکانی جیهانە لەگەڵ وێنەی کەسیدا لە تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان. هەرچەندە زۆرێک لە بەکارهێنەران ئاماژە بەناوی ئەو کەسە دەدەن کە ئەو وتەیەی فەرمووە، بەڵام لەڕاستیدا هەم لەلایەن بڵاوکەرەوەی وتەکە لەسەر وێنەکەی خۆیی و هەمیش لەلایەن «هاوڕێکانییەوە!» دۆخێک دروستدەکرێت کە وا دەزانرێت ئەو گوتەیە کەسی بڵاوکەرەوە لە تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان خودی خۆی «فەرموویەتی»، یاخود ئەو ئایەتە تازە بە تازە بۆ ئەو کەسە دابەزیوە. ئەمەش دیسان لە سایەی بیردۆزی بەشداریکردنی دیموکراسی و «ئازادی ڕادەربڕینی ڕەهاوە» دۆخێکی تەواو خەیاڵی بۆ تاکەکانی کۆمەڵگە بەتایبەتی گەنجان دروستکردووە، هەریەکەیان «لەبەر خاتری دڵی یەکدی» و «بۆئەوەی بەرامبەرەکەشی لایک و کۆمێنت بۆ پۆستێکی ئەو بکات» لە

جیهانێکی خەیاڵی تۆڕەکۆمەڵایەتییەکاندا یەکتریان کردووە بە سۆپەرمان، پیاوچاک، زانا، داهێنەر، پێغەمبەر و ئەگەر هەیە لە ئایندەشدا یەکدی بکەن بە خودایەک بۆ یەکدی.

هەروەک بەشێک لە جیهانی خەیاڵی «خۆزگە» لە تۆڕەکۆمەڵایەتییەکاندا زۆر بڵاوە و لە ژیانی ڕاستەقینەدا هەوڵی بۆ نادرێت. بەواتایەکی دیکە «خۆزگە» بەگشتی بۆ ئەو شتانە دەخوازرێت کە بەدینەهاتوون و لە ڕابردوودا بەجێماون، یاخود «خۆزگە» بۆ بەدیهاتنی ئاواتێکە لە ئایندەدا کە لە مەحاڵەوە نزیکە. لێرەشدا تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان مەیدانێکیان ڕەخساندووە کە بەکارهێنەرانی ئەو تۆڕانە و بەتایبەت گەنجان ماوەیەکی زۆر خۆزگە بە ئایندە دەخوازن، بەڵام کاتێک بێهیوا دەبن لەو جیهانە خەیاڵییەی کە لە تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان بۆ خۆیانیان دروستکردبوو و «هاوڕێ گیان، بەوەفا، شیرین و.....» ناو تۆڕە کۆمەڵایەتییەکانیشیای سابوونیان لەژێرپێی دەداو لە کۆمێنتدا پێیانوابوو «هەوڵی بۆ بدەیت خۆزگەکەت بەدیدێت، هیچ شتێک لەم جیهانەدا مەحاڵ نییە، تۆ زۆر مەزنی، ئەو خۆزگەیە زۆر لەوە بچووکترە کە تۆ نەتوانی بەدەستی بهێنیت» هێندەی تر فووی تێدەکەن و دواتریش هیوابڕاو دەبێت، ئیدی ڕووداوەکاتەوە ڕابردوو و ماوەیەکیش خۆی سەرقاڵ دەکات بەو «خۆزگانەی» کە بە خەندە و پێکەنینەوە «هیوای پێ دەخواستن» لە ئایندەدا بێتەدی ئێستا بە خەمبارییەوە هەناسەی سارد بۆ نەهاتنەدی ئەو ئاواتانە دەخوازێت، خاوەن و بەڕێوەبەرانی تۆڕەکۆمەڵایەتییەکانیش بە هەموو توانایەکیانەوە ئاسانکاری دەکەن بۆ ئەو بەکارهێنەرە تاوەکو بە ئاسانترین شێوە بتوانێت ئەو هەستی «بێهیوایی و پەژارە و خەمەی» لە تۆڕەکۆمەڵایەتییەکانەوە بڵاوبکاتەوە. ئەمەیە جیهانێکی خەیاڵی کە تەنانەت ناتوانرێت پێشی بگوترێت «تەنها مرەکەبە لەسەر کاغەز!»

خاڵێکی دیکە بریتییە لە بوون بە پاڵەوانی زمانەوانی و دەروونی لە تۆڕەکۆمەڵایەتییەکاندا، بەوواتایەی بەکارهێنەر بە کەمترین کات و خێراترین شێوە و زۆر بە ئاسانی لە ڕێگەی بەکارهێنانی هێما و ئاماژەکانی «ئیمۆجی» تۆڕەکۆمەڵایەتییەکانەوە سەرجەمی هەستەکانی بۆ هاوڕێکانی دەردەبڕێت، بە هەمانجۆر هاوڕێکانیشی خێرا لەو هێما و ئاماژانە تێدەگەن، ئەمەش بەهۆی بەکارهێنانی بەردەوامی ئەو هێما و ئاماژانە لە تۆڕەکۆمەڵایەتییەکاندا کە ئەزموونێکی باشیان تێدا پەیداکردووە. بەڵام لە ژیانی ڕاستەقینەدا ئەو کەسانە تا چەند دەتوانن ئەو هەستانەیان بەتایبەت بە زمان و وشە دەرببڕن جێگای هەڵوەستە لەسەرکردنە و پێویستە توێژینەوەی قوڵی لەسەر ئەنجامبدرێت. هەر ئەمەش دەبێتە هۆی پووکانەوەی تواناکانی مرۆڤ لە گوزارشتکردن لە دۆخی دەروونی خۆیی و دەربڕینی هەستەکانی و تێگەیاندنی بەرامبەرەکانی لەو دۆخەی تێیدایە.

هێما و ئاماژە لە سەردەمی ئێستادا کاتێک بەکاردەهێنرێت کە بەهۆی سەرقاڵییەوە

ئەو کەسە هێندە کاتی نەبێت بتوانێت بە نوسین یان بە دەنگ و قسەکردن گوزارشت لەو هەستانەی خۆی بکات. یاخود لە سەردەمی کۆندا پێش داهینانی نوسین و دۆزینەوەی پیتی چاپ و گەشەی تەکنەلۆژیای پەیوەندیکردن و گواستنەوەی زانیارییەکان، مرۆڤەکان هێما و ئاماژە و ئاگر و دوکەڵیان بۆ ئاگادارکردنەوە و ناردنی پەیام بۆ یەکدی بەکارهێناوە کە لەو سەردەمەدا مانای ئەوپەڕی پێشکەوتنی شێوازی پەیوەندیکردن بووە، بەڵام لەکاتی ئێستادا جێگای خۆیەتی بپرسین: ئایا ئەو هێما و ئاماژانەی لەلایەن بەکارهێنەرانی تۆڕەکۆمەڵایەتییەکانەوە بەهاردەهێنرێن تا چەند بەشێوەیەکی زانستی و تەندروست بەکاردەهێنرین و مانا و مەبەستی تەواو دەدەن بەدەستەوە؟! یاخود بەکارهێنەرانی ئەو هێما و ئاماژانە هێندە سەرقاڵن بە ئیش و کارەوە کە نەتوانن بە نووسین و قسە گوزارشت لە هەستەکانیان بکەن؟! یان بەهۆی تەمبەڵی و پاڵدانەوەوە تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان ئاخنراوە لەو هێما و ئاماژانە؟!

**دەرەنجام**

لەکۆتاییدا دەردەکەوێت کە سەنتەر لە بیردۆزی میدیایی بەشداری دیموکراسیدا ئامرازەکانی ڕاگەیاندن نییە، بەڵکو لەم بیردۆزەدا خوێنەر، بیسەر، بینەر، وەرگر یاخود هاوڵاتی سەنتەرە. لەم ڕوانگەیەوە ئەم بیردۆزە کە بەشداریکردنی خەڵکی لە بەڕێوەبردندا وەک پایەی سەرەکی داناوە پێیوایە کە دەبێت بەشێوەیەکی یەکسان دەرفەتی دەستڕاگەیشتن بە ئامرازەکانی ڕاگەیاندن بۆ سەرجەم هاوڵاتیان فەراهەم بکرێت هەم بۆ وەرگرتنی پەیامەکان و هەمیش بۆ ناردنی پەیامەکان، بەم جۆرەش کاریگەری گرووپە کۆمەڵایەتییەکان زیاتر دەبێت لە کۆمەڵگەدا.

ئەو دەرفەتەش کە ئەم بیردۆزە پێشنیازی دەکات تەنها لە ڕێگەی تۆڕەکۆمەڵایەتییەکانەوە دەتوانرێت فەراهەم بکرێت. بەپێچەوانەوە ڕێگرییەکانی وەک کۆنترۆڵی دەوڵەت بۆ دەزگاکانی ڕاگەیاندن، گرفتی دارایی، نەبوونی شارەزایی و ئەزموون ڕێگرن لەوەی سەرجەمی هاوڵاتیان بتوانن پەیامەکانی خۆیان لە ڕێگەی ئامرازە تەکنەلۆژییە کلتورییەکانەوە (ڕۆژنامە، ڕادیۆ و تەلەفزیۆن)ەوە بگەیەنن بە خەڵکی دیکە.

هەر بەوجۆرەش ئەگەر تەماشایەکی میدیای نوێ و تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان بکەین دەبینین ئەو تایبەتمەندییانەی کە لە بیردۆزی میدیایی بەشداری دیموکراسیدا هەیە لە فرەیی و پەرش و بڵاوی لە بەرامبەر دامەزراوەییدا، تاککەرایی و کاریگەری دوولایەنە لە بەرامبەر گرووپ و کۆمەڵدا، یەکسانی هەلی دەستڕاگەیشتن بە زانیاری هەمان ئەو تایبەتمەندییانەی میدیای نوێ و تۆڕەکۆمەڵایەتییەکانە. لەبەرئەوە نزیکترین بیردۆز کە

بتوانێت میدیای نوێ و تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان شیکار و ئاڕاستە بکات بیردۆزی میدیایی بەشداری دیموکراسییە.

کەواتە ئەوەی لە ئێستا لە هەر سێ بوارەکەدا باڵادەستە کۆمەڵگە بۆ تاکگەرایی و لێرەشەوە بۆ دروستکردنی جیهانێکی خەیاڵی هاندەدات کە مەحاڵە فەراهەم بکرێت. یەکەمیان تەکنەلۆژیای پەیوەندی لە ڕێگەی بەرهەمهێنانی بەردەوامی ئامراز و تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان بەدەستهێنان و بەکارهێنانی ئەو ئامراز و تۆڕانەیان بەتەواوی ئاسان کردووە و ئاسانتریشی دەکەن. دووهەمیان زانایان و لێکۆڵەرانی بواری میدیا و پەیوەندیکردن جەخت لەسەر بەشداری دیموکراسییانەی تاک لە بەڕێوەبردن و تاکگەرایی و ئازادی ڕەها لە میدیا و تۆڕەکۆمەڵایەتییەکاندا دەکەنەوە. سێهەمیشیان بەکارهێنەرانی میدیای نوێ و تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان بەتایبەت گەنجان سورن لەسەر بەکارهێنانی تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان بەبێ بوونی هیچ سانسۆرێکی دەوڵەت و کۆمەڵگە و خێزان و ڕەچاوکردنی بەها باڵاکانی کۆمەڵگە. ئیدی لێرەوە هەمووان لە هەوڵی بەدیهێنانی جیهانێکی خەیاڵی وەک بەهەشتدان و کۆتایی کۆمەڵگەش لە خەیاڵ و پووچگەراییەوە دەردەچێت.

### سەرچاوەکان


1. Amet Anıl Müngen, Çoklu çevrimiçi sosyal medya ağlarda aynı kişiye ayıt hesapları bulma yaklaşımları, Doktora Tezi, Fırat Üniversitesi, Fen Bilimler Enstitüsü, Bilgisayar Mühendisliği Anabilim Dalı, Elazığ, 2020.

2. Burak Emre Gürsoy, Effect of social network sites on romantic relationships, master›s thesis, Middle East Technical University, Social Sciences Faculty, Ankara, 2020.

3. Dilara Kübra Baokır, Sosyal ağlar ve tüketim ekonomisi, Doktora tezi, Aydın Adnan Menderes Üniversitesi, Sosyal Bilimler Enstitüsü, Sosyoloji Anabilim Dalı, Aydın, 2020.

4. Mehtap Çullu, Kullanımlar ve doyumlar yaklaşımı bağlamında sosyal ağlardaki bireylerin farkındalık düzeyleri, Yüksek lisans tezi, Marmara Üniversitesi, Sosyal Bilimler Enstitüsü, Halkla İlişkiler Anabilim Dalı, İstanbul, 2020.

5. Mustafa Aydemir, Yeni medyanın İPTV ve sosyal ağları, Doktora tezi, Ege Üniversitesi, Sosyal Bilimler Enstitüsü, Radyo sinema ve televizyon anabilim dalı, İzmir, 2020.

6. Doç. Dr. Mehmet Sezai Türk, Katılımcı Demokratik Medya Kuramı Çerçevesinde Yeni Medyayı Anlamak, İctmedia Dergisi, Sayı: 56, İstanbul, Mart 2016.

7. Nye, Joseph S., (2003) Amerikan gücünün paradoksu, Çeviren: Gürol KOCA, Babil kitabevi, İstanbul.

بیرەوەرییەکانی
مەولود باوەمراد

بەشی هەشتەم





پاش نزیکەی پێنج ساڵ مانەوە لە ئێران لە مانگی ١١ی ١٩٩١ لە ئۆردوگای کامیارانەوە بەماڵەوە گەڕامەوە بۆ کوردستان.

وابڕیاربوو شەو ماڵەکە بارکەین و بەیانی زوو بەڕێکەوین بەرەو سنوری باشماخ، کەسێک هاتە ماڵەوە وتی: کاک مولود من برای فلان کەسم، یەک دووکارتۆنێکی دەرمانی بەیتەریم پێیە بەڵکو لەگەڵ کەلوپەلەکەی خۆتان بیگەیەنمەوە کوردستان، وتم بیهێنە ئەگەر جێی بوویەوە باشە دەیبەین، وتم بیدەین بەکێ؟ وتی خۆشم دێم؟ وتم جێنابێتەوە لەپێشەوە من خێزانم لەگەڵە! وتی: مشکلە نیە لەناو لۆریەکە لای کەلوپەکە جێگەی خۆم دەکەمەوە؟ بەهەرحاڵ بارەکەی زۆربوو، خۆی لەناو بارەکەدا جێگە کردەوە و خێمەی بەسەرا درا و بەحەبل توند داپێچرا، لە بازگەکەی سنە/مەریوان سەیارەکەیان خستەلاوە بۆ پشکنین، کابرای سایەق تەنها حەبلەکانی لێکردەوە، کابرای پاسدار کە سەرکەوت خێمە لابات بۆ تەفتیش سەیری کرد یەکێک لەناو لۆرییەوە ڕاستبوویەوە بەسەری خێمەکەی بەرزکردەوە، کابرای پاسدار داچڵەکا، وتی چیەکەی لێرە؟ چۆن جێگەت بووەتەوە؟ ئەویش کە فارسی دەزانی حەپەساو سرتەی لێنەهات! پاسدارەکە یەکەم شت دەستی بۆ کارتۆنە دەرمانەکان برد و داوای هاوکاریی لە دوو کەسی تر کرد، وتی: دەرمانی قاچاخی پێیە وەرن، ئیتر لە تەواوی کەلوپەلی ناو لۆریەکە کەوتنە گومان، هەموویان بەتوڕەییەوە لەسەر لۆرییەکەوە هەڵدایە خوارەوە، خێزانم هەر لەبەر خۆیەوە پرتە و بۆڵەی دەهات، ئەوە بۆ واشتەکان دەخەنەخوارەوە شوشەوات و دەفری مەلامینی تیایە! هەندێکی باشی شکابوو، من و سایەقەکە دووبارە لۆرییەکەمان بارکردەوە، پاسدارەکان دەرمان و خاوەنەکەیان گلدایەوە، شەو لە دەشتێکی نزیک پێنجوێن لەژێر خێمەکانی گۆخڵان کە نەتەوەیەکگرتووەکان بۆ ماڵە گەڕاوەکانیان لە ئێرانەوە هەڵدابوو لەگەڵ ماڵی کاک حاجی قاسم و براکانی یەکمانگرتەوە و بەیانی بەرەو هەڵەبجە ڕێکەوتین.

***ناوەندی چاپ و بڵاوکردنەوە**

دوای چەند ڕۆژێک لە گەڕانەوەم، کەوتمە سۆراخی دامەزراندنی دەزگایەکی پەخش و چاپی کتێب لە شاری سلێمانی، بەرپرسانی جەماعەت پێیان وتم: لە بازاڕی ڕاپەڕین نزیک مزگەوتی گەورە دوکانمان هەیە، یەک دوکان بوو کردمانە دووان و هەموو پێویستییەکانی مۆڵەتم بەناوی خۆمەوە و بەهاوکاری کاک (بەرزان حەمەئەمین تریفەیی) تەواوکرد و ناونرا(ناوەندی ڕۆشنبیر بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە) و دواتر کاک (حەمەعەلی مەلا ئەحمەد) تەوێڵەییش بوویە هاوکارمان، و لە ڕۆژی ١/٦/ ١٩٩٢دا کە قەدەر وابوو ڕێکەوتی ڕۆژی دامەزراندنی سوپای عێراق بێت، بە ئامادەبوونی چەند برایەک ناوەندەکە کرایەوە، و دواتر چەند لق و نوێنەرایەتی لە شارەکانی تر کردەوە، لەوان ڕانیە و دەربەندیخان و کەلار و هەڵەبجەی شەهید، سەرباری هاوکاریی ئەو کتێبخانانەی برایانی سەر بە جەماعەت لە شارەکانی وەک دهۆک و شارەکانی تر هەیانبوون.

بە بڕیاری جەماعەت و لەسەر داوای کاک موخلیص یونس چەندین کارتۆن کتێبکم

گەیاندە هەولێر بۆ دامەزراندنی کتێبخانەیەک لەو شارە بەهەمان ناوەوە، بەڵام پاش دروستبوونی ناکۆکییەکانی نێوان کاک موخلیص و جەماعەت، خۆی کتێبخانەیەکی تایبەت بەخۆی دامەزراند و پەیوەندی لەگەڵ ئێمە پچڕا. لەگەڵ کرانەوەی کتێبخانەکەدا ماڵم گواستەوە سلێمانی، پاش ماوەیەک لە گەڕەکی شێخان خانوویەکی موتەوازعم کڕی، هەموو کات و جوهد و پەرۆشی و بیرکردنەوەی خۆم لەسەر کتێبخانەکە چڕکردەوە، ناوەندەکە ناوبانگێکی باشی پەیداکرد، تاگەیشتینە ئەوەی خۆمان وەک ناوەند کتێبی چەند بەرگی چاپ بکەین. جەردی کۆتایی ساڵانە پێشکەش بە جەماعەت دەکرا، لە کۆتایی ئەو ساڵی دامەزراندنەدا بۆمان دەرکەوت کە (٧٠٠٠٠) حەفتا هەزار کتێبمان بڵاوکردووەتەوە.

ئەم ناوەندە لەو سەرەتا و سەردەمەدا، کە تازە بەتازە خەڵکی کوردستان لەژێر وێرانەی هەژموونی بەعس سەری دەرهێنابوو، لەملاشەوە تەوژمی شۆڕشگێڕی چەپی نەتەوەیی و عەلمانی بەگشتی لە دەڤەرەکەدا بەهێز و چەکدار بوون، ڕۆڵێکی بەرچاوی هەبوو لە بڵاوکردنەوەی ڕۆشنبیریی و هۆشیاری دەربارەی ئیسلام بەگشتی و بزاڤی ئیسلامیی میانەڕەو بەتایبەتی، لە ڕێگەی ئەو ژمارە زۆرەی کتێب وناملیکە بڵاومان دەکردنەوە، لە پاش شەڕی نێوان بزوتنەوەی ئیسلامیی و یەکێتی چەندجار کاک (بەرزان حەمەئەمین) وەک بەڕێوەبەری ناوەندەکە بانگ دەکردە ئاسایش بۆ لێکۆڵینەوە و بیانووگرتنی داخستنی، ئەمە سەرباری چەند جار هەڕەشەی تەقاندنەوە و سوتاندنی لەلایەن هەندێ گرووپی کۆمۆنیستی فەلەوە. ناوەندەکە تائێستەش وەک کتێبخانەیەکی بچووک، بەهەمان ناوەوە و لە هەمان جێگەدا، مۆڵەتی بەناوی بەندەوەیە و ماوەی ٢٩ ساڵە بەردەوامە.

#### ناوێکی نوێی بێئاکام

مامۆستا سەڵاحەدین لە تشرینی دووەمی ١٩٩١ بەیەکجاری بەماڵەوە گەڕایەوە کوردستان و لە گەڕەکی ئازادی شاری سلێمانی نیشتەجێ بوو، لە هەمان ماوەیەدا مامۆستا صدیقیش گەڕابوویەوە، وەک پێشتر ئاماژەم بۆ کرد، بەندی یەکەمی ڕێکەوتنی ڕۆژی ١٩٨٨/٩/١١، کە باس لە پابەندبوونی هەردوولا دەکات بە قیادەی شەرعی ئیخوانی عێراقەوە پاش گۆڕان و گەڕانەوە بۆ عێراق، ئەم دۆخەی لە ئێستای هەرێمدا هاتووەتە پێش، بەهۆی ڕاپەڕین و کۆڕەو و بڕیاڕی ٦٨٨ی نەتەوەیەکگرتووەکانەوە جیاوازە، هەرێم بووەتە پارچەیەکی دابڕاوی نیمچە سەربەخۆی جیا لە عێراق؟ ئەوەشمان خستەڕوو کە قیادەی ئیخوانی عێراق لە دەرەوە مامۆستا سەڵاحیان ڕاسپاردبوو کە وەک بەرپرسی ئیخوانی کوردستان بگەڕێتەوە بۆ عێراق. ئەم گۆڕانکارییە گەورە و چاوەڕوان نەکراوەی ناوچەکە-لانیکەم بۆ ئیسلامییەکان کێشەی دابەشبوونی ئەم دووهێڵەی بە یەکلانەکراوەیی هێنایەوە ناو کوردستان و خولێکی نوێی مشتومڕی پۆلبەندی دەستی پێکردەوە. لەم ماوەیەدا بەندە لە مامۆستا صدیق و مامۆستا محەمەد ڕەئوف و مامۆستا ئەحمەدی




شافیعی دابڕابووم، بێ باسی جێگە و پێگەم لە ڕێکخستنی لە جەماعەتدا، پەیوەندی پرس و ڕای کارم لەگەڵ مامۆستا هادی عەلی و جارجارەش لەگەڵ مامۆستا سەلاح هەبوو.

ئاگاداری کەوتنە بەرباسی خەتی یەک و خەتی دوو بووم،-ئەم ناوە لە قسەی مامۆستا کریکار کەوتەوە، کە ئاماژەبوو بە درێژبوونەوەی زەمەنیی قەیرانی دابەشبوونی هەردوو هێڵی مامۆستا صدیق و مامۆستا سەلاح بە ناوێکی تر و پاساوێکی نوێوە، بەردەوامیی بە خولێکی نوێی مشتومڕەکان دەدا، بەلام تەنها قسەیەکی سەرپێی نەبوو بۆ ناونان، بەڵکو حەقیقەتی هەبوو، لە گفتوگۆی وەفد و وەفدکاری هەردوولادا هێڵی مامۆستا صدیق ئەم بابەتەیان بەجدی هێنابوویە بەرباس وەک دەرەچەک بۆ پرسەکە و داوایانکردبوو وەک ئەوەی لە هەندێک ولاتدا دووهێڵی ئیخوانی هەیە، بالێرەش دوو هێڵ هەبێت؟ مامۆستا سەلاح لە یاداشتەکانیدا دەڵێت:"ئێمەش وتمان شتیوا ڕەوا نییە و ساحەی ئێمە تەحەمولی ئەو دوو پارچەییە ناکات". ل:١٢٥.

هەندێک ڕایانوایە ئەم تەرحە لە ئەنجامی بێ هیوابوونی مامۆستا صدیق و هێڵەکەی لە هەوڵەکانی دەستخستنی ڕەسمییەت و شەرعییەتەوە سەرچاوەی گرتبوو، وەک دوا تیری کەوان بۆ دەربازبوون لەوەی ناویان نابوو تەسلیمبوون بە قیادەی مامۆستا سەلاح و هاوکارانی بەکاربێنن. لەم سەرەتای قۆناغی گەڕانەوەدا برایانی هێڵی مامۆستا صدیق هەستیان بەوەکردبوو کە لەڕووی ژمارەوە بە بەراورد لەگەڵ بەرامبەرەکەیان کەموکورتیان هەیە، بۆ چارەکردنی ئەم کەلێنە کەوتنە هەوڵێکی بێوچان بۆ فراوانکردنی بەرەکەیان و ڕوویان لە هەولێر و دهۆک و شارەکانی تری جگە لە سلێمانی دەکرد، بە ئاڕاستەی ئەوانەی وەک میحوەری مامۆستایەک یان ئەو گەنجانەی دەستی هیچ لایەکیان پێنەگەشتبوو.

بەندە ئاگاداری شێواز و ناوەڕۆکی ئەو گوتار و پاساو و گوزارشت لەخۆکردنەی هێڵی مامۆستا صدیق نەبووم کە بەناوی خەتی دووەوە ئاڕاستەی کەسان و گرووپی پێشتر پابەندبوویان بەئیخوانەوە دەکرد، بۆ قەناعەت پێکردنیان بەوەی ئەمان نوێنەرایەتی کۆمەڵەی ئیخوان موسلیمین دەکەن لە کوردستانی عێراق، بەلام دڵنیابووم ئەم هەوڵە بەناوی خەتی دووی ئیخوانەوە کارێکی دژوار و قورسبوو، چاوەڕوانی سەرکەوتنی لێنەدەکرا، لانیکەم لە ڕووە دەروونییەکەیەوە بۆ ئەوکاتەی زەین و تێگەشتنی کەسانی ئینتماکردو بۆ ئیخوان چاویان لەسەر ئەو ناوانەبوو کە لەناو خەڵکدا وەک کەسایەتی ئایینی ئیخوانی دیاربوون، ڕاستە کاری ڕیکخستنیان نەدەکرد، بەلام هەریەکە لە سنووری خۆیدا کار و جوڵەی بانگەوازی هەبوو، میحوەرێکی کەم یان زۆر خەڵکیان بەدەورەوە بوو، لەناو کۆمەڵگەدا بەئیخوانی ناسراوبوون، لەهەر شارێکدا باسی ئیخوان بکرایە ئەوانە ببوونە ڕەمزی ئەو خەڵکە ئیسلامییە لەو جێگە، بۆیە زۆرجار بیرم لەم ئالەنگارییەی ئەم هێڵە دەکردەوە داخۆ ئەم داوای ئینتمایە کە بە خەڵکی ئیسلامیی یان پێشتر ئیخوان بڵێی فەرموون بۆ کاری ئیسلامیی ئیخوان/خەتی دوو بەکوێ دەگات؟

**له نێوان گفتوگۆ و قسەبۆخۆکردندا**

لێکۆڵەرانی بواری پارتە سیاسییەکان، دەڵێن حیزب و کۆمەڵەی سیاسی هەرچەند بەرەو پیری بڕوات و بچێتە تەمەنەوە، سەرەتای دروستبوون و گەنجی خۆی وەک منالێک لە هەناویدا بەزیندوویی هەڵدەگرێت، تا لە پرۆسەی بە ئێستاییکردنی مێژوودا، پاساو و فاکتەرەکانی سەرەتای هاتنە گۆڕەپانی خەبات و شکۆ و سەروەرییەکانی بەزیندوویی بمێننەوە؟ ئەم دیاردەیە وەک پێکەوە گرێدانی مێژووی خەبات و بەیەکگەشتنەوەی(تواصل) نەوەکانی حیزب کارێکی بەجێیە، بەڵام گرنگ ئەوەیە چۆن بەکاردەهێنرێت؟ سوودبینین لەم بیرۆکە گشتییە دەربارەی بەکارهێنانی مێژووی کاری حزب، لەلایەن هەریەک لەم دوو هێڵەوە بۆ ئەم پرسی دابەشبوونە ڕاستبوو، بەڵام بۆ هێڵی مامۆستا صدیق و سەرکردایەتییەکەی لە بابەتی پاساوی ڕازی نەبوونەیان بە قیادەی مامۆستا سەلاح و هاوکارانیدا ئاشکراتر بوو، هەمیشە لە بەرامبەر پرسیاری بۆ نابنە یەک و بۆ ڕێکناکەون؟ دەگەڕانەوە بۆ هەناوی مێژووی سەرەتا، قسەیان لەسەر ئەوەبوو کاتێک ئێمە ڕێکخستنی ئیخوانمان دەستپێکردەوە و شانماندایە ژێر زیندووکردنەوەی کاری ڕێکخستن، لەو دۆخە پڕمەترسییەی عێراقدا سەدان گەنج و کەسایەتیمان لە دەوری ئەم مەدرسە و نەهجەی ئیخوان کۆکردەوە، ئەم برایانە یان ببوونە مەدرەسەی کۆمەڵەی نوور و بانگەشەیان بۆ ئەو ڕێبازە دەکرد، یان لە عێراق و کوردستان نەمابوون، یان تەسلیمی بڕیاری ڕاگرتنی کاری ڕێکخستنی ئیخوانی عێراق لەلایەن قیادەوە ببوون، و بەگژ ئێمەدا دەچوون!!

هەمان ئەم گێڕانەوەیەی مێژووی هێڵەکە بە خەستتر و توندتر و ئاوێتە بەسۆز، بۆ ناوخۆی ئەندام و لایەنگر و هەواداران دەکرا بەمەبەستی سەلماندنی حەقانیەتی بۆچوونەکانیان دەربارەی جیایی، خۆگەرمکردنەوە، تیژکردنەوەی ئینتما، توندوتۆڵکردنی پابەندی ئەندامان.

پەیوەست بە پرسی شەرعیەت و ڕەسمییەت، کە تەوەرەی سەرەکی کۆی کێشەکە بوو، ئەم دووئاستەی بەکارهێنانی گەڕاندنەوە و گێڕانەوەی مێژووە، هیچ سودێکی بۆ پرسە سەرەکییەکەی ئەم هێڵە نەبوو، ئەگەر گێڕانەوەی ئەم مێژووە ئاڕاستەی هێڵەکەی بەرامبەری دەکات و دەیەوێت لەگەڵی بکەیتە-دایەلۆگ(حوار) ئەوان کۆی ئەم پاکێجە مێژووییەی کار و جیهادی ئەم هێڵەی تۆ ناسەلمێنن و ئەوانیش قسە و تێگەشتنی تری جیاوازیان هەیە؟ ڕەنگە هەر لەبنەڕەتەوە قسەیان لەسەر پاڵنەرەکانی هەستانی مامۆستا صدیق بەم کار و هەوڵە هەبێت! لە ئاستی دووهەمیشدا گێڕانەوەی داستانی ئەم مێژووە لە ناوخۆدا، دەبێتە گفتوگۆ لەگەڵ خۆکردن-مۆنۆلۆگ، دەنگی بەهیچ جێگەیەک ناگات و سوودی بۆ پرسی شەرعییەت نییە.

دەبوو برایانی هێڵی مامۆستا صدیق بەدیقەت تر سەیری ئەم گێڕانەوە مێژووییە و بڵاوکردنەوەی بەناو ڕێکخستنەکانیاندا بکردایە، چونکە دواجار، بەردەوام گێڕانەوەی





ئەم مێژووە، وەک تۆماری مەزڵومییەت، بوویە گرێیەکی سیاسی دەروونی، و ڕێگای بیرکردنەوەی تر و دۆزینەوەی بەدیلی تری بۆ ڕێکەوتن داخست، لەلایەکی ترەوە ئەم گێڕانەوەیە هەرچەندە مەزن و شایستە بێت، شتێک لە شەرعییەت و ڕەسمییەتی بەدەستهاتووی-(الشرعیە المکتسبە)ی مامۆستا سەلاح وەک بەرپرسی هێڵی ئیخوانی کوردستان ناگۆڕێت و تانەی لەسەر دروست ناکات، ڕێگەی دروست ئەوەبوو، لەبری گەڕان و دەستەوداوێن بوونی ئەم کەسایەتی و ئەو کەسایەتی ئیخوانی، داوای داوەریکردنیان-(تحکیم)- لە سەرچاوەی بڕیاری شەرعیەتەکە بکردایە، گێڕانەوەی چیرۆکی مێژووی کار و خەباتی ڕێکخستن لەسەر مەنهەجی ئیخوان لە کۆتایی سالانی حەفتاکانەوە بۆ ئەو جێگەیە کاریگەرە.

**هێڵی مامۆستا صدیق بڕیاری ڕاسپاردنی مامۆستا سەلاحیان لەلایەن قیادەی ئیخوانی دەرەوە نەسەلماند و قبوڵیان نەکرد.**

ئەم برایانە کە چەندساڵ بوو لە کاری ڕێکخستن و حزبایەتیدا قاڵ ببوون، دەبوو بیانزانیایە کە ڕێکخستن لە هەر حزب و کۆمەڵەیەکدا پلەبەندی و پێگە و بەرپرسیارێتی بڕیار دەخولقێنێ، پەنابردنە بەر کەسایەتی و کەسی خاوەن نفوزی ئەخلاقیی و ئینتمای قەدیم بۆ کۆمەڵەی ئیخوانی عێراق لە بەغدا یان عەممان یان لە هەر جێگەیەک، توانای خەرقکردنی پێگە و پلەی بڕیاری حیزب و ڕێکخستنی سیاسی نابێت، ئەوەی دەکرێت جگە لە موجامەلەی بەڕێکردن هیچی تری لێ شین نابێت.

ئەگەرچی کێشەکە لە جەوهەردا قەیرانی بەرپرسی یەکەم و سەرکردەکان بوون، و تا کاتی ئەم ناوە نوێیە تاڕادەیەک لەو ئاستەدا تاوتوێ دەکرا، زیاتر لەوەی کێشەی خەڵکە گەنج و ئەندامە ئینتماکردووە تازە و سەرەتاییەکان بێت بۆ هەرلایەک.

لەگەڵ هەڵکشان و ئاڵۆزبوونی گرفتی نێوان دوو خەتەکەدا بۆ جارێکیش نەتوانرا پێکەوە کۆببنەوە یان بە هەوڵی کەسانی نێوەندگیر هەردوولا کۆبکرێنەوە، ڕاستەوخۆ ئاڵوگۆڕی دید و سەرنجەکانیان بکەن، لانیکەم پەندێک لە شەڕەکانی ناوخۆی هێزە کوردییەکان لە شاخ و شار وەرنەگیرا کە لایەنەکانی پاش سەنگەر لەیەکگرتن و کوشتار، لەسەر مێزی گفتوگۆ کۆدەبوونەوە، مامۆستا سەلاح پێداگری لەسەرئەوە دەکرد، کە

دەیگووت: براینە ئێوە وەرنە ناو بازنە شەرعییە مۆڵەتدراوەکەی ئیخوان جا ئەوکات گفتوگۆی داواکارییەکان و ئالییەتی چارەسەرکردنی کێشەکان دەدۆزینەوە! هێڵی مامۆستا صدیقیش دەیانگووت هاتنە ناوبازنەمان لە ئێران تاقیکردەوە و جگە لە غەدر لێکران ئەنجامێکی نەبوو! هاتنە ناو بازنە تەسلیم بوونە! لەڕاستیدا ئەم قسەیەی ئەمان هەموو ڕاستییەکە نەبوو، چونکە لەگەڵ ئەمەشدا ترسیان لە زۆری ژمارە و هەبوونی کۆمەڵێک کەسایەتی بەتەمەنی خاوەن ڕەمزییەت و نفوزی مەعنەوی هەبوو کە لە دەوری هێڵی مامۆستا سەلاح بوون.

بەم شێوەیە لە ئەزموونی ئەم ناکۆکییەدا پەیوەندی تەنها لە ڕێگەی پەیغامی ئەم و ئەوەوە ئەنجام دەدرا، دواجار کاری وتی وتی و دژایەتی و ناکۆکی لە بازنەی سەرۆک و سەرکردەکانەوە، بوویە ئاوێکی ڕژاوی لیخن، هەمووکەسی هەوادار و ئەندامی سادەی هەردوولا دەست و دەم و پێیان تێدەخست و سەرەداوی کێشەکەی ئاڵۆزتر دەکرد، بەتایبەت ئەوکاتەی چووە ناو ڕای گشتی خەڵکی ئیسلامیی و بەشێک لە شەقام و بۆ دەرسی مزگەوتەکان و تانە و تەشەر لە یەکتردانی گەنج و خەڵکی تازە ئینتماکردو بۆ ناوکاری ئیسلامیی.

ئەوەندەی بەر بەندە کەوتبێت، لەم سوتانەی مانا دینیی و شەرعییەکانی غەیبەت و بوختان و گومانی خراپ پێبردنەدا، ئەوەبوو کە هەندێک کەسی سەر بەهێڵی مامۆستا صدیق، بەدڵگەرمییەکی زۆرەوە دەهاتنە مەکتەبە و ڕووبەڕوو دەیانگووت: مامۆستا سەلاح چاک دەستی تۆی بڕی بەکردنەوەی ئەم مەکتەبە بۆت؟ هەندێکیش بە ناڕاستەخۆ پێیان لێهەڵدەکێشا و دەیانگووت: مامۆستا سەلاح بەکردنەوەی ئەم مەکتەبە بۆت کڕیویتی؟ جارێکیان کەسێک هاتە ژوورەوەی مەکتەبە برێک لێم ڕاماو وتی: ئەمە کەی ئیشی تۆیە؟ ئەمە ئیشی کەسێکی وەک تۆیە لە پشت ئەم مێزەوە بەیانی تائێوارە خەریکی کتێب فرۆشی بێت؟ باشیان لەناوبردی؟

یەکێک لەو هۆکارانەی کە ڕێگای کۆبوونەوەی ڕاستەوخۆ و خستنەسەرمێزی گفتوگۆی کێشەکەی لە نێوان هەردوو لادا ئاڵۆزتر کردبوو، ئەوکات هەموو حزب و ڕێکخستنە سیاسییەکان چەکداربوون، زۆربەی جار بەزەبری چەک ئیرادەی خۆیان بەسەر خەڵک و کۆمەڵە و هێزی تردا فەرز دەکرد، هەست بەجۆرێک لە نائەمنی هەمەلایەنە لە پەنای کۆنترۆڵنەکرانی چەکدا ئەگەرێکی کراوەبوو، تاڕادەی هەڵکوتانە سەر ماڵان بۆ تاڵانی.

ناوەناوەش هەندێ سەرکردە و سەرکردەی مەیدانی لە میحوەرەکانی بزوتنەوەی ئیسلامیدا بەگوێی ئیسلامییەکانی تریاندا دەدا ئەگەر هێز و چەکی ئەم بزوتنەوەیە نەبێت، هەمووتان بەدەستی ئەم هێزە عەلمانییانە دەخورێن! ئەم دۆخە و ئەم گوتارە وایکردبوو

که برایانی هێڵی مامۆستا صدیق نزیکییەکی تاڕادەی تێکەڵاوبوونیان لەگەڵ برایانی بزووتنەوە و گوتاری جیهادی پێوە دیاربێت، ئەگەرچی برایانی هێڵی مامۆستا سەلاح، ئەم پاساوەی ناچاری دۆخەکە بۆ ئەو نزیکییە بە نامەعقول دەزانن، و ڕایانوایە ئەم تێکەڵاویی و هاوگوتارییە، کار و بەرنامە و پلانی مامۆستا صدیق و هاوکارانیەتی، کە ببنە ڕێکخستنێکی سیاسی سەربەخۆ، بەڵام وەک باڵی سیاسی/ جەماوەریی تەواوکەری بزوتنەوەی ئیسلامیی بن.

### دوا وێستگەی جیابوونەوە و خیاری ناچاری

هێڵی مامۆستا صدیق بڕیاری ڕاسپاردنی مامۆستا سەلاحیان لەلایەن قیادەی ئیخوانی دەرەوە نەسەلماند و قبوڵیان نەکرد، نەک هەر پێی ڕازی نەبوون، بەڵکو داوای سەرەکییەکان ئەوەبوو دەبێت قیادەکردنی جەماعەتی ئیخوانی کوردستان نۆرەی ئێمە بێت و بەدەستی هێڵی ئێمە بێت! وەک چۆن لە ئێران بەدەستی ئێوە بووە بەگوێرەی ڕێکەوتنی نێوانمان.

لەڕاستیدا وەک قانونییەکان دەڵێن ئەمە تەفسیرێکی تەعەسوفی بوو بۆ بڕگەی یەکەمی ڕێکەوتنەکە، ئەم داوایە نەچووە سەر، هەوڵەکانی برایانی هێڵی مامۆستا صدیق بۆ بەدەستهێنانی ڕەسمییەت و شەرعییەتی کۆمەڵەی ئیخوان موسلیمینی عێراق ڕووەو درگای داخراو و بنبەست ڕۆیشت، قەیرانەکە بەهەڵپەسێراوی ماوەتەوە، ناکۆکییەکان قوڵتر و شێوانەکان بەرەو ئاقاری فیکریی و مەنهەجی دەڕۆن، هێڵی مامۆستا سەلاح لە ڕێگەی دکتۆر عەلی قەرەداغیی و ڕەحمەتی دکتۆر عەبدولحەکیم موختار-ئەبو وجدان داوایان لە قیادەی ئیخوانی عێراق لە دەرەوە کردبوو کە بڕیارێک بۆ یەکلایی کردنەوە و کۆتایی هێنان بەم ئاریشەیە دەربکەن.

قیادەی ڕێکخستنی عێراقیش نامەیەکی لە ڕێگەی (دکتۆر عبدالحکیم)ەوە بەناونیشانی( ایها الاخوه الکرام) کە ڕێکەوتی ١٩٩٢/٤/٩ی لەسەرە، ئاڕاستەی کەس و ناوێکی دیاریکراو نەکراوە، دەڵێت: فەرمانی جەماعەت لەسەر متمانەیە بەو کۆمەڵە ڕێکخستنەی برامان (ابو پیام) واتە مامۆستا سەلاح تێدایە... دکتۆر عەلی قەرەداغی لەدانیشتنێکدا نامەکەی بۆ مامۆستا صدیق خوێندبوویەوە.(کۆپی دەقی نامەکە لە پاشکۆی بەرگی پێنجەمی کتێبی بزاوتی ئیسلامی، نووسینی مامۆستا عبدالرزاق عبدالرحمن، ل:٤٨٥دا هەیە)-

لەمبارەوە مامۆستا سەلاح لە یاداشتەکانیدا دەڵێت:(نامەیەکی ڕەسمی هات بۆیان، کە برایان لە کوردستان یەک کۆمەڵەیە و ئەویش ئەوەیە کە(بەندە) سەرپەرشتی ئەکات، هەرکەسی تر ئەگەر بیەوێ لەگەڵ برایاندا کاربکات، دەبێ لەگەڵ ئەو کاروانەدا بێ، ئەم بڕیارە ڕاگەیەنرا بە مامۆستا صدیق بەمە حەسمی مەسەلەکە بوو، بەڵام بەداخەوە

لەجیاتی ئیلتزام و وەفا بۆ ساڵەهای تەمەنی خەباتی لەناو برایاندا، بڕیاری ماڵجیایی و ناوگۆڕینی دا ولە  ڕۆژی ١٩٩٢/١١/٢٢ بزووتەوەی ڕاپەڕینی ئیسلامیی ڕاگەیاند.

لەگەڵ ئەوەی ئەم نامە و بڕیارەی سەرکردایەتی ڕێکخستنی ئیخوانی عێراق لە دەرەوە، کێشەی شەرعیەتی لە نێوان ئەم دوو هێڵەدا یەکلایی کردەوە، لەهەمانکاتدا بوویە مایەی نوێکردنەوە و تەئکیدکردنەوەی پێگەی بەرپرسیارێتی مامۆستا سەلاح لەناو جەماعەتدا، هەروەها بوویە مایەی خۆیەکلاکردنەوەی ئەو کەس و میحوەرانەی لە نێوانە هەردوولادا وەستابوون بەدیار ئەم بڕیاری یەکلاکردنەوەوە، پاش هاتنی نامەکە خۆیان ساغکردەوە.

**لەگەڵ هەڵکشان و ئاڵۆزبوونی گرفتی نێوان دوو خەتەکەدا بۆ جارێکیش نەتوانرا پێکەوە کۆببنەوە یان بە هەوڵی کەسانی نێوەندگیر هەردوولا کۆبکرێنەوە، ڕاستەوخۆ ئاڵوگۆڕی دید و سەرنجەکانیان بکەن**

بەڵام دەرگای ناکۆکیی و ڕکابەریی و کێبڕکییەکی خراپ و ناتەندروستی زیاتر والاکردەوە، بەتایبەت وەک دەڵێن قوڕی مرۆڤ بە ئێرەیی و فیتنەی سامان و دارایی نێوانیانەوە شێلراوە، کۆمەڵەی ئیخوان بەسەرپەرشتی مامۆستا سەلاح، دانانی بەرپرس و کارگێر و ئەنجومەنی بەڕێوەبردن و کادیری ئیداریی و فەرمانبەرانی چەند ڕێکخراوێکی خێرخوازی ئیسلامیی بەدەستەوەبوو، کە تا ئاستێکی باش هاوکاری دارایی بۆ کادیرەکانی بانگەواز و کاری بەرپرسانی پەروەردەیی لە ڕێکخستنەکاندا فەراهەم کردبوو، هەروەها دابەشکردنی هاوکارییەکان و کۆمەکی گشتی ئەم ڕێکخراوانە بەسەر هاوڵاتیاندا، سەرنجی هەموو جەماوەر و حیزبە سیاسییەکانیشی بەرەو لای جەماعەت و دواتر بەرەو یەکگرتوو ڕاکێشابوو، بوویە هێڵی جیاوازی ناسینەوەی نێوان ئەمان و هەموو لایەنە ئیسلامییەکانی تری سەرگۆڕەپانی کوردستان، لە بەرامبەردا هێڵی مامۆستا صدیق و دواتر بزوتنەوەی ڕاپەڕینی ئیسلامیی، ڕووبەڕووی قەیرانی دارایی و تەنگدەستی بەرپرس و کادیرەکان و ئەندامانیان بەگشتی  بوونەوە، سەرباری پێویستییە داراییەکانی ڕاپەڕاندنی ئیدارەی حیزب و چالاکییە جۆراوجۆرەکانی.

ئەم واقیعەی پاش لێکترازان بوویە تانوپۆی ڕستنی هەموو ناکۆکیی و تانە و قسەی زبر و پیاهەڵشاخانێک لە سەرەوە بۆ خواری خوارەوە.

ناشیَ نکۆڵی لەوە بکەین کە حیزب لەسەر فیکر و ئەندێشە دروست دەبێت، بە ڕێکخستن لە شکڵێکدا بەرجەستە دەبێت، بە دارایش بەڕێوە دەچێت، بەتایبەت لەم نەمەتە حیزبیە باوەی وڵاتی ئێمەدا کە حیزب لەسەر پەیکەرێکی هەرەمی شاوڵی دادەمەزرێت و بەدەیان پێگە و پۆست و پلە و بازنەی بەرپرسیارێتی لێدەکەوێتەوە، قەیرانی دارایی بەرێژەی خۆی پێی چالاکی و بەڕێوەچوونی حیزب لەسەر گۆڕەپانەکە کورتدەکاتەوە.

بەردەوامی ئەرکی نویَ لەمسالەدا هێڵی مامۆستا سەلاحەدین پاش یەکخستنەوەی شورای ناوەوەی کوردستانی کاتی ڕاپەڕین و شورای دەرەوەی قۆناغی کاری ڕێکخستنی ئیخوانی دەرەوە لە ئێران، سەرگەرمی یەکخستنەوەی میحوەر و بازنە لێکدابڕاوەکانی ئیخوانی دەعەوی سەردەمی پێشوو بوون، لەهەمانکاتدا پەرە بە پەیکەری ڕێکخستن بۆ دابەشکردنی پێگە و پۆستی بەرپرسیارێتی درا، لە پەروەردەی ئەندامانداگەڕانەوە بۆ ناولێنانەکانی ڕێکخستنی ئیخوان دەستپێکردەوە، کۆبوونەوەکانی شورای جەماعەت بەردەوامبوون، و چەند پرۆژەیەکیان بۆ بنەجێکردن و فراوانکردنی کاری جەماعەت خستە بواری جێبەجێکردن، لەوانە دامەزراندنی کۆمەڵەی نووسەرانی ئیسلامیی کوردستان.

**کۆمەڵەی نووسەرانی ئیسلامیی کورد**

ئێوارەیەکی سەرەتای مانگی شوباتی ئەم ساڵە(٦/٢/ ١٩٩١)، یەک مانگ پاش دامەزراندنی ناوەندی ڕۆشنبیر بوو، مامۆستا هادی پێی گووتم ئێوارە پێش بانگ وەرە بۆ ماڵی مامۆستا جوتیار لە گردی مامەیارە کۆبوونەوەیەکی فراوانمان هەیە، نە ئەو گووتی بۆچییە و نە من پرسیم بۆچی؟ کە ڕۆیشتم سەیرەکەم ژمارەیەکی بەرچاو (زیاتر لە ٣٠ کەس) لە برایانی زۆربەی شوێنەکانی کوردستانی تیا ئامادەبوو، سەرەتا مامۆستا سەلاح دەستی بەقسە کرد، لەکۆی قسەکانیدا ئاماژەی بەوەکرد کە چەند ساڵ بەر لە ئێستا لە چەند قۆناغی جیاوازدا بەندە لەگەڵ مامۆستایان عوسمان جوتیار و موحسین جوامێر و حەبیب حەمەسەعید و برایانی تر کە سەروکارمان لەگەڵ نووسین و ئەدەبی کوردی و زەوقی شیعری دینی و ئەدیبانی شاعیرانی ناوداری کۆنی کورددا هەبوو وەک: مەحویی و مەولەوی و بێخود و ...هتد. دەستپێشخەریمان بۆ ئەم کارە کردووە، ناوە ناوە کۆبوونەوەمان هەبووە لە شارە جیاوازەکاندا، بۆ بایەخدان بەم لایەنە گرنگە و هەوڵی جەم و جۆرکردنی بدەین لە لیژنەیەکدا یان جەمعییەیەکدا، بەڵام ئەوکات نەکرا و تووشی خەمساردی بووین تیایدا لەبەر هۆکاری زانراو لای هەمووان، ئێستا هەلومەرجەکە ڕەخساوە کە لاکردنەوەیەکی پێویست بەلای ئەم مەسەلە گرنگەدا بکەینەوە و دەستبەکاربین بەشێوەیەکی مونەزەمتر کە بەردەوامی هەبێت، چەند پێشنیازێکی خستە بەردەم ئامادەبووان..... پاش ئەو مامۆستا

محەمەد ڕوشدی ئاکریی-کە پێشتر چەند کتێبی بەزمانی عەرەبی نووسی بوو دەستی بەقسەکردن کرد و پاش ئەو موداخەلات دەستپێکرد.

کۆبوونەوەکە لەلایەن دەستەی ڕێکخەرانییەوە بەرنامەڕێژی بۆکرابوو، هەر لە دروستکردنی کۆمەڵەیەک بەناوی(کۆمەڵی نووسەر و ئەدیبانی مسوڵمانی کورد) و پەیڕەوی ناوخۆ و شێوازێکی لۆگۆ و لەوەش زیاتر ژمارە سفری ئەزموونی گۆڤارێک بەناوی (پەیامی ڕاستی) وەک گۆڤارێکی ڕۆشنبیری گشتی ببێتە زمانحاڵی کۆمەڵەکە ئامادەکرابوو، کۆبوونەوە سێ ڕۆژی خایاند، بوویە کۆنگرەی یەکەمی دامەزراندنی کۆمەڵەکە، و لە کۆنگرەی دووەمدا ناوەکەی گۆڕا بۆ(کۆمەڵەی نووسەرانی ئیسلامیی کورد). دواتر هەڵبژاردن کرا بۆ ئەنجومەنی بەڕێوەبردنی کۆمەڵە کە مامۆستایان(فاروق ڕەسوڵ یەحیا، حەبیب محەمەد سەعید، هادی عەلی، عوسمان جوتیار، عومەر عەبدولعەزیز) دەرچوون. لقی لە شارەکانی سلێمانی و هەولێر و دهۆک و هەڵەبجەی شەهید و دواتر چەند شوێنی تر کرانەوە. ژمارەیەکی زۆر تیپی هونەری لە بوارەکانی سروود و شانۆ و خۆشنووسی، تابلۆدا سەر بە کۆمەڵەبوون، کە لە بۆنەکانی یادی لەدایکبوونی پێغەمبەردا(د.خ) و یادی هیجرەت و کیمیابارانی هەڵەبجە و دواتر یادەکانی دامەزراندنی یەکگرتوودا لە شارەکانی خۆیان چالاکیان دەنواند.

نووسەربوون و نووسەریی ڕاستەقینە و وەرگێریش مانایەکی گەورەیە، کۆمەڵێک توانا و لێهاتنی فیکریی و زانستیی و مەعریفیی و ڕۆشنبیریی و ئاڕاستەی ئارەزووی نووسین لە کایە و بوارێکی تایبەتدا وەک: وەک ئایین، مێژوو، فەلسەفە، فیکر،....هتد، لەگەڵ بەردەوامبوون دەیخەملێنێ، هەرچی پەیوەندی بە هونەر و هونەرمەندبوونەوە هەیە، وەک شاعیر و دەنگخۆش و نیگارکێش و پەخشاننووس بەهرەیەکی خودادایە لە زاتی کەسی هونەرمەنددایە، دەرفەتی دەرخستن و کەناڵی گەیاندنی بە دەرەوەی خۆیی و مەعریفە و زانیاری لە بوارەکەی خۆیدا بۆ پەرەپێدان و زیاتر جوانکردنی پێویستن، بەم مانا تەواو سادە و ساکارە ژمارەی ئەوانەی ئەم مەرجەیان تیابێ لە ژمارەی پەنجەی یەکدەست تێنەدەپەڕین، بەڵام ئەم بیرۆکەیە سەرکەوتووانە لەماوەی ئەو چەند ساڵەدا ژمارەکەی چەند ئەوەندە کردەوە. ئەوەی پشکی بەندەبوو لە دروستبوونی کۆمەڵە و دەرچوونی گۆڤارەکەیدا، هەر لە سەرەتاوە بوومە دەستەی نووسەرانی گۆڤارەکە، بەزۆری وەڵامی نامەی خوێنەرانی گۆڤارەکەم دەدایەوە، کە تا دەرچوونی ژمارە(٥٥) ناوی کەس لە هیچ شوێنێکی گۆڤارەکەدا نەدەنووسرا.

لە کۆنگرەی دووەمی کۆمەڵە لە ڕۆژانی ٧و١٩٩٣/٤/٨ بوومە بەرپرسی مەڵبەندی گشتی کۆمەڵە، کە بارەگاکەی لە سلێمانی بوو، هەروەها بەرپرسی بەشی ئەدەب. لە




سەرەتای ساڵی ١٩٩٤وە لە ژمارە (٢٣)وە بوومە جێگری سەرنووسەر. لەم ماوەیەدا دووسێ جارێک بوومە عەریف حەفلەی یادەکانی لەدایکبوونی پێغەمبەر(د.خ) لە هۆڵی ڕۆشنبیری سلێمانیی و مزگەوتی خانەقا و شوێنی تر.

لە کۆنگرەی چوارەمی کۆمەڵەکەدا لە ڕۆژانی ١و١٩٩٧/٦/٢ لە هەولێر بەسترا ماڵم چووبووە هەولێر، بوومە سەرنووسەری گۆڤارەکە تا ساڵی ١٩٩٩. کۆمەڵە بەهۆی کێشەی دارایی حیزبەوە نەتوانرا پێویستییەکانی بارەگا و هاوکاری چاپی بەرهەمی نووسەران و تیپە هونەرییەکان دەستەبەر بکات، لەلایەکی ترەوە هەوڵەکانی ڕەحمەتی مامۆستا عەلی صالح میران سەرۆکی خولی پێنجەمی کۆمەڵەکە، بۆ وەرگرتنی مۆڵەتی فەرمی لە حکومەتی هەرێم بەو ناوەوە شکستیهێنا و یەکێتی نووسەرانی کورد-ئەوکات مەهدی خۆشناو بوو ئامادەیی نیشاندابوو کە ئەندامانی کۆمەڵە دەتوانن ببنە ئەندامی یەکێتی نووسەرانی کورد، بەڵام ناکرێت دوو کۆمەڵەی نووسەران هەبێت.

لەپاڵ ئەم دوو هۆکارەدا، نووسین و بیروڕای ڕەخنەیی و تەقلیدی هەندێ نووسەری ناسراو بەم جۆرە نووسینە لەلایەن چەند نووسەرێکی سەر بە کۆمەڵە و کۆڕ و سیمینارەکانیان لەگەڵ بیر و بۆچوونی ژمارەیەک لە بەرپرسانی حیزب و نووسەرانی ئیسلامیی ناو چوارچێوەی کۆمەڵەکە دژ و ناتەبابوو، گەیشتبوونە ئەو بۆچوونەی بڵێن: ئێمە کەپر و ساباتێکمان سازداوە بۆئەوەی بیر و بۆچوونی ناکۆک لەگەڵ ئیسلامی تیا تەرویج بدرێت؟ دواتر کۆمەڵەی نووسەرانی ئیسلامیی کورد، لە کۆنگرەی شەشەم ڕۆژی ٢٠٠٤/٩/٢٣ خۆی هەڵوەشاندەوە، بەڵام گۆڤاری پەیامی ڕاستی هەر بەردەوامە لەدەرچوون.

**یەکەم هەڵبژاردنی هەرێم و بێ ئەزموونی**

لەلایەن بەرەی کوردستانییەوە بڕیاردرا، لە ڕۆژی ١٩٩٢/٥/١٧ هەڵبژاردنی گشتی بۆ یەکەم پەرلەمان لە مێژووی گەلی کورددا بکرێت، بەهۆی کێشەی تەنکیکی مرەکەبی ڕەنگی پەنجە خرایە ١٩/٥/ ١٩٩٢.

جەماعەت بە ماوەیەک پێش هەڵبژاردن، بەیانێکی بەشداریکردنیان لە هەڵبژاردنی پەرلەمانی کوردستان لە ناوخۆدا دەرکرد، بە بەشداری لەگەڵ لایەنە ئیسلامییەکان بەگشتی و بزوتنەوەی ئیسلامیی بەتایبەت، لەژێر ناونیشانی لیستی(ئیسلامییە سەربەخۆکان)دا .

بەندە لەلایەن جەماعەتەوە، وەک بەرپرسی لیژنەی هەڵمەتی هەڵبژاردنی بازنەی سلێمانی دەستنیشان کرام. لە ڕۆژی ١٩٩٢/٤/٢٢ لەگەڵ مامۆستا هادی عەلی و کاک شێخ عومەر بەرزنجی کاندیدی جەماعەت، بەرەو هەولێر بەڕێکەوتین، بەمەبەستی کۆبوونەوە لەگەڵ سەرکردایەتی برایانی بزوتنەوەی ئیسلامیی و گفتوگۆ لەسەر ناوی لیستەکە و

دیاریکردنی لیژنەی باڵای هاوبەشی هەڵبژاردن و چۆنیتی ڕیکخستنی ناوی پاڵێوراوان و دابەشکردنی ئەرکەکانی بەڕێوەبردنی هەڵمەتی هەڵبژاردنەکە، لە هەولێر لەگەڵ کاک موخلیص یونس، د.فایەق حەمەسەعید، د.فازیل حەمەسالح، ڕەحمەتی د.عوسمان محەمەد مستەفا، مامۆستا محەمەد تاهیر کەریم، وەک نوێنەری جەماعەت یەکمانگرتەوە.

چووینە بارەگای سەرەکی بزوتنەوە، مەلایەکی بادینیی و مەلا عەبدولغەنی و برایەکی تر لە پێشوازیدا بوون، دواتر مامۆستایان (مەلا عوسمان و مەلا عەلی و مەلا ئەحمەد کاکە مەحمود و مەلا شێخ صدیق) ئامادەبوون، بێ ناوبردن هەندێ لە مامۆستایان هەر لە سەرەتاوە دەستیانکرد بەزەمکردنی هەڵبژارد و پەرلەمان کە قیمەتی جیفەیەکی سەر مەزبەلەی نییە و ئەمە منداڵبازاڕە و دوورە لە نزووم و ئەحکامی شەرع!! بەڵام لەبەرخاتری ئیسراری هەندێ لە برایانی سەرکردایەتی و قاعدە کە بەباشی دەزانن موشارک بین.

لە چوونە ناو باسەکاندا گرفت بۆ ناوی لیستەکە دروستبوو، مامۆستا مەلا ئەحمەد کاکە مەحمود گووتی: ئێمە بە کەمتر لە ناوی بزوتنەوەی ئیسلامی بۆ لیستەکە ڕازی نابین، ئەو ناوە ڕەمزی دەیان شەهید و موجاهیدە، دواجار ڕێکەوتن کرا لەسەر ئەم خاڵانەی خوارەوە:

١. نە ناوی ئێمە و نەهی ئەوان ڕێکەوتین لەسەر ئەوەی ناوی لیستە هاوبەشەکە (لیستی ئیسلامیی) بێت، ٢-لیژنەیەکی باڵای هەڵبژاردن بۆ ڕێکخستنی لیستەکە بەڕێکەوتنی هەردوولا، و سەرپەرشتی پرۆسەی هەڵبژاردنی لیست بکات.

٣-ژمارەی کاندیدەکانی لیستەکە ١٠٠ کاندید بییێت و (٥٠ بە ٥٠) دابەش بکرێت لە نێوان هەردوولادا.

٤. ڕیزبەندی ناوەکان بەگوێرەی ڕێکەوتنی هەردوولا بێت لە لیژنەکەدا.

٥. ئەگەر بۆ نموونە لیستەکە(١٠) کەسی بەرکەوت ئەوا بەڕیزبەندی دە کەسی یەکەمی لیستە دەچنە پەرلەمان.

٦. دروشمی لیستە لە دوو ڕەنگی سپی و سەوزی موقەلەم دروست بکرێت.

٧-د.فازیل حەمەصالح نوێنەری ڕێپێدراوی لیستەکە دەبێت لە بەردەم لایەنە یاساییەکانی هەڵبژاردندا، وەک سەرۆکی لیست.

کۆنووس لەلایەن ئامادەبووانەوە ئیمزا کرا، لەسەرووی هەموویانەوە مەرحومی مامۆستا مەلا عوسمان ڕابەری گشتی بزوتنەوەی ئیسلامیی.

لە تەنها دوو ژووری یەکەم بارەگای ڕابیتەی ئیسلامیی کورد، لە شەقامی مزگەوتی گەورە (بەندە و مامۆستا حەمەڕەشید ماوەتی، مامۆستا عەبدوڵڵا سەید نەجمەدین، کاک

هەردی مستەفا بەختیار، کاک تەها سۆڵەیی) دەستمان کرد بەهەڵمەتی هەڵبژاردن لە بازنەی هەڵبژاردنی پارێزگای سلێمانی، بەتەنها ئیستنساخێک ژمارەیەکی زۆر دروشمی سادەمان کۆپی دەکرد، چەند تۆپ قوماشی سەوز و سپیمان دەدایە خەیات ئاڵای گەورە و مامناوەند و بچووکی دروست دەکرد، لای دارتاشیش دارمان بۆ ئاڵا پەڕۆینە دەدا بەدروستکردن، تەنها ئەم سێ کەرەستەیە، ڕۆژانە نوێنەرەکانی شارەکان دەهاتن و هەریەکە بەشی هەڵمەتی جێگەکەی خۆی وەردەگرت.

دووجار سەردانی لیژنەی باڵام کرد بۆ جێگۆڕکێی هەندێ ناو و ئاگاداربوون لە ڕێکخستن و تەواوبوون و تەسلیمکردنی لیستەکە بە لیژنەی باڵای هەڵبژاردنی گشتی، دواجار لیستەکە دەرچوو، یەک دوو ناوێکی کەم بوو بۆ سەد ناو، لە بەرامبەر ناوی کاندیدەکانی بزوتنەوەی ئیسلامیی، نووسرابوو بزوتنەوەی ئیسلامیی، بەرامبەر ناوی کاندیدەکانی ئێمە بە بۆشی بەجێهێڵرابوو، بەندەش بڵاوم نەکردەوە هەتا پرسم کرد ئەم بۆشاییە بەچی پڕکەینەوە، گووتیان بنووسن، ئیسلامیی سەربەخۆ، هەرئەوەندە بەسبوو تا یەکەم نوسخەی لیستەکەمان بڵاوکردەوە برایانی بزووتنەوە-لانیکەم ئاگاداری ئەوانەی سلێمانیم تا ئەوپەڕی ڕادە تورەیی و بێزاریی و قسەی نە شیاویان بەرامبەر کردم، ئەمە کوفرە کوا کەسێ خۆی بەمسوڵمان بزانێت بێلایەنە، ئەمە تەبەڕایە لە ئیسلام، ئەمە پیلانە دژی هێزی جیهادی بزوتنەوەی ئیسلامیی،....هتد، کارگهیشتە هەڕەشە لەبەندە و گلەیی لە برایانی سەرکردایەتی جەماعەت، دەمەوعەسری ئەو ڕۆژەی لیستەکەمان تیا بڵاوکردبوویەوە چووم بۆ مەکتەبەی ڕۆشنبیر، بەرامبەرمان نووسینگەی فۆتۆکۆپی ڕەحمەتی مامۆستا ئیبراهیم ڕێشاوی بوو، گووتیان ئێستا دووکەسی چەکداری بزوتنەوە هاتوونەتە ئێرە و هەواڵی تۆیان پرسی! زۆر تورە بوون و قسەی نەشیاویان کردووە و مامۆستا محەمەد فەرج و مامۆستا ئیبراهیم چوون بەگژیاناو بێدەنگیان کردوون، یەکێکیان گووتوویەتی تەلاقم کەوتبێ ئەم ئێوارەیە لە هەرشوێنێ مەولود باوەمرادم دەستکەوێت دەیکوژم! چوومە ئەوبەرەوە لای مامۆستا ئیبراهیم سەیرم کرد هێشتا سپی هەڵگەڕانی تورەییەکی بە سەروسیماوە دیارە، گووتم چی بووە؟ گووتی هیچ نییە ئێستا ئێوارەیە وەختی هیچ نەماوە بچۆرەوە ماڵەوە با تەڵاقی ئەو هەتیوە نەگبەتە نەکەوێت! ناوەکەی نازانم، بەڵام وادەزانم وازی لە ئیسلامییەکان هێناوە و لە ئەوروپا دەژی.

ئەوەندەی لە منەوە دیاربوو برایانی بزوتنەوە زۆر سارد و سڕبوون لە کەمپینی هەڵبژاردن، ئەویش چەندین هۆکار و پاساوی جیاوازی هەبوو لەسەروی هەموویانەوە باوەڕنەبوونی ژمارەیەکی بەرچاویان بەهەڵبژاردن و پەرلەمان بوو، دواتر لیستەکە نەیتوانی بەربەستی ٧٪ی دەنگەکان ببڕێت و هیچ کورسییەکی بەدەستنەهێنا.

ئەم زانایە وەک لە دەستخەتەکاندا دەردەکەوێت زانایەکی گەورە بووە، کۆمەڵێک ڕیسالە و بەرهەمی لەپاش بەجێماوە، هەندێک سەرچاوە بە کورتی باس لە ژیانی دەکەن و هەندێک لایەنی دیکەی ژیانیشی لەو پێشەکییانەی کتێبەکانیدا هەڵمانهێنجاوە کە خۆی بە ناڕاستەوخۆ ئاماژەی پێ کردوون. وادیارە ناوی عەبدولقادر کوڕی محیەدینی ئەربیلییە و بە غەوث ناسراوە و قوتابی و موریدێکی دڵسۆزی شێخ عەبدولڕەحمانی تاڵەبانی (خالص) بووە و وەک خۆی ئاماژەی پێ داوە سەفەری ئەستەنبوڵی کردووە و کوڕێکی بەناوی محەمەد مەحوی هەبووە. ناوبراو لە ساڵی ١٨٠٦ی میلادی لە شاری هەولێر لەدایکبووە، هاوسەرەکەی ناوی زەهراخان بووە و ناوی سێ لە منداڵەکانیشی دیارن کە محەمەد محیەدین، مستەفا سەفوەت، هەروەها عەبدوڵڵا بوون. دوو لە منداڵەکانی شاعیر، زانا و سۆفی بوون. محەمەد محیەدین لە هەولێر هاتۆتە دنیاوە، مستەفای کوڕە گچکەیشی لە ١٨٦٦/١٢/٣ لە گەڕەکی حاجی غازی لە شاری ئورفا لەدایکبووە و لە ١٩٥٠/١٠/٢٧ کۆچی دوایی کردووە.

لە کتێبی (حجة الذاکرین)دا باس لەوە دەکات کە شێخ عەبدولڕەحمانی خالصی تاڵەبانی فەرمانی پێ کردووە کە وەک خەلیفەی ئەو بچێتە ئورفا، بەڵام بەتەواوی دیارنییە لە کام ساڵ چۆتە ئەوێ، بەگوێرەی یەکێک لە دەستخەتەکانی مەزەندەی ئەوە دەکرێ کە لە ساڵی ١٨٤٨ەوە چووبێتە ئورفا.

شێخ عەبدولقادری ئەربیلی لای شێخ عەبدولڕەحمانی تاڵەبانی تەسەووفی وەرگرتووە و بۆتە یەکێک لە گەورەترین خەلیفەکانی، لەپاڵ ئیجازەی تەریقەتی قادری، ئیجازەی تەریقەتی خەڵوەتی و نەقشبەندیشی هەبووە. لە ساڵی ١٣١٥ی کۆچی بەرامبەر ١٨٩٧ی میلادی لە ئورفا کۆچی دوایی کردووە و لە تەکییەی خەڵوەتی نێژراوە. لەسەر گۆڕەکەی نووسراوە: هذا ضریح العارف بربه سمی الغوث ابی محمد محی الدین السید السند الشیخ عبد القادر ابن شریف محمد محی الدین الصدیقی الحسینی، توفی عن احدی وتسعین سنة رحمه الله الرحمن فی شهر رمضان سنة ١٣١٥. فاتحة.

**هەشت بەرهەمی لە دوای خۆی جێهێشتووە، لەوانە:**

١. الدر المعتبرة فی شرح الآیات الثمانیة العشرة من مقدمة المثنوی الشریف (شرۆڤەی هەژدە بەیتی سەرەتای مەسنەوییە)

٢. الالهامات الالهیة فی معرفة الحقیقة الانسانیة (دەستنووس)

٣. حدیقة الازهار فی الحکمة والاسرار (دەستنووس)

٤. حجة الذاکرین فی رد علی المنکرین: (چاپکراو)

٥. مرآت الشهود فی بیان وحدة الوجود (دەستنووس)

٦-شرح كلمات الفارسية من اللمعات العراقية (دەستنووس)
٧-طريقة الرحمانية فى الرجوع والوصول لحضرة العلية (دەستنووس)
٨-تفريح الخاطر فى مناقب عبد القادر. (چاپكراو)(١)

ئەگەرچی ئەو دوو کتێبەی سەرەوە تەنیا ئەو هەشت بەرهەمەیان دیاریکردووە، لەبەرئەوەی بەشێک لە دەستخەتەکان چەند کتێبێکیان تێدایە بۆیە هەموو بەرهەمەکانیان نەدیوە. چەند بەرهەمێکی تری هەن. لە کتێبخانەی فاکەڵتیی ئیلاهییاتی زانکۆی ئەستەنبوڵ دوو دەستخەتیمان دۆزینەوە، کە یەکێکیان مەجمووعەیەکە و لە چەند دەستخەتێک پێکهاتووە. بابەتی نووسراوەکانیشی زیاتر لە دەوری تەسەووف و شەرحکردنی چەند بەیتێکی شیعری شێخ عەبدولڕەحمانی خالص و زانستی کەلامدا خۆی دەبینێتەوە.

**بەرهەمەکانی:**

١. الطريقة الرحمانية فى الرجوع والوصول الى الحضرة العلية:

ئەم ڕیسالەیە وەک خۆی لە پێشەکییەکەیدا ئاماژەی بۆ کردووە لە ساڵی ١٢٦٥ی کۆچی نووسیویەتی و لە پێشەکییەک و بابێک و خاتیمەیەک پێکهاتووە و باسی ڕەوشت و سلووکی پەیڕەوانی ڕێبازی قادرییە. لە پێشەکییەکەدا باسی تەوبە و مەرجەکانی و پلەوپایە و جۆرەکانی کردووە. لە بابەکەشدا کە بەناوی (السلوک والرجوع الى الحضرة العلية)ە و لە چەند فەصڵێک پێکدێ و تێیدا زۆر بەوردی باسی لەخۆدارنین لە خەسڵەتە خراپەکان دەکات. لە خاتیمەشدا بەناوی (السير عن الله وبيان تنزلات اللطيفة الانسانية)یە کۆمەڵێک ئامۆژگاریی لەخۆگرتووە.

ڕیسالەکە ٢٤ لاپەڕەیە و لە هەر لاپەڕەیەکدا پازدە دێر نووسین هەیە.

٢. النفس الرحمانية فى مراتب الحقيقة الانسانية:

ئەم ڕیسالەیە وەک خۆی نووسیویەتی بەکاریگەریی زۆری هیممەتی بەرز و فەیزی شێخ عەبدولڕەحمانی تاڵەبانی لە ساڵی ١٢٦٩ی کۆچی نووسیویەتی. کتێبەکە ٢٥ لاپەڕەیە و لە هەر لاپەڕەیەک ٢٥ دێر نووسین هەیە و لە دوای پێشەکی لە دوو باب پێکدێت، لەوانە:

الباب الاول: فى تنزلات السر الربانى وحقيقة الانسانى.

الباب الثانى: فى بيان الترقى على الدرجات ووصول النقطة الاخيرة الى اقصى الغايات ليتم القوس العروجى بذلک السير والسلوک، حتى يصل السالک الى ملک الملوک.

٣. الهامات الرحمانية فى معرفة حقيقة الانسانية

ئەم ڕیسالە بچوکە حەوت لاپەڕەیە و وەک خۆی لە پێشەکییەکەیدا باسی دەکات(كنت فى ثانى عقد الثامن من ثالث عشر الالف الثانى من هجرة صاحب السبع المثانى فى شهر ذى القعدة) کە لەو ساڵەدا ئەم ڕیسالەیەی نووسیوە و ئاماژەشی بەوە داوە کە هەموو

ژیانی خۆی لە لە تەکییەی حەزرەتی شێخ عەبدولڕەحمان تاڵەبانی بەسەربردووە و ئەم ڕیسالەیەشی شەرحی فەرموودەی (من عرف نفسه فقد عرف ربه)یە.

٤. مرآت الشهود فی بیان وحدة الوجود

ئەم ڕیسالەیە چواردە لاپەڕەیە و تێیدا نووسەر لە پێشەکییەکەدا باس لەوە دەکات کە ئەو کاتەی لە ساڵی ١٢٨٨ی کۆچی لە سەردەمی سوڵتان عەبدولعەزیز سەردانی ئەستەنبوڵی کردووە و بینیویەتی کە خەڵکێکی زۆر سەر بە تەریقەتەکانە و سەری زمان و بنی زمانیان ئەهلی حەقە، بەڵام جیاوازی لە نێوان حەق و باتڵدا ناکەن و هەمیشە باسی وەحدەتولوجود دەکەن، کەچی لە حەقیقەتی واتاکەی بێئاگان، بۆیە لە ڕێی محەمەد محیەدین مەحوی کوڕم داوایان کرد کە ڕیسالەیەک لەبارەی وەحدەتولوجود بنووسم، بۆیە ڕیسالەیەکم بە سێ بەش دانا و ئەو ناوەی سەرەوەم لێنا.

ئەم چوار ڕیسالەیەی سەرەوە لەگەڵ نوسخەیەک لە ڕیسالەی حدیقة الازهار لە دەستخەتێک دان بە ژمارە ٣٧٣١٦ لە کتێبخانەی فاکەڵتیی ئاداب لە زانکۆی ئەستەنبوڵ پارێزراون.

٥. حدیقة الازهار فی الحکمة والاسرار

ئەم بەرهەمەش لە زانستی تەسەووفدایە و پەیوەست کراوەتەوە بە زانستی کەلام، بەتایبەت لە حیکمەت و ئەسراردا و بۆچوونی جیاوازی زانایانی لەسەر باسکراوە لەگەڵ هێنانەوەی نموونەی شیعری مەولانای ڕۆمی و حافزی شیرازی. ئەم دەستخەتە یازدە لاپەڕەیە و هەر لاپەڕەیەک شازدە دێری نووسین تێدایە و محمد العمری الحزین لە ساڵی ١٢٦٠ نووسیویەتییەوە. دەسخەتەکە لە مەجموعەی دەستخەتەکەی تریش نووسراوە کە ناوی نووسەرەوەی پێوە نییە و پێدەچێ خەتی نووسەر خۆی بێت و لە هەر لاپەڕەیەکدا پازدە دێر نووسین هەیە و چواردە لاپەڕەیە.

٦. شیعرێکی دە بەندییە کە تەخمیسە لەسەر شیعری (وان کنت یاذا المن والجود مجرما)ی ئیمامی شافیعی نووسراوەتەوە و لە کۆتایی کتێبەکەدا سێ لاپەڕەی گرتووە و ئاماژەی بە ناوی خۆی داوە، بەڵام هەمان ئەو عەبدولقادر ئەربیلییە نییە:

فتخمیس نظم الشافعی محمد

لعبد خطیر ابن حاج محمد

محمد الاسم لیس ذاتی محمد

اناجی الیک انت ربی محمد

کۆتایی دەستخەتەکەش لە دوو لاپەڕەدا باسی ئاداب و دوعای چوونە سەر گۆڕی ئەولیایانی کردووە.

ئەم دەستخەتەش هەر لە کتێبخانەی فاکەڵتیی ئیلاهییاتی زانکۆی ئەستەنبوڵ بە ژمارە ٧٤٤٤ لە بەشی دەستخەتە عەرەبییەکان پارێزراوە.

**بەرهەمی دیکەی ئەربیلی**

شێخ عەبدولقادری ئەربیلی چەند بەرهەمێکی دیکەی هەیە، ئەگەرچی هەندێک سەرچاوە ئاماژەیان پێداوە، بەڵام ئێمە بە چاوی خۆمان نەماندیون، ئەوانیش بریتین لە:

١- آداب المريدين ونجاة المرشدين

٢- الدر المكنون فى معرفة سر المعصوم

٣- القواعد الجامعية فى طريقة الرافعية

٤- مجموعات الأشعار فى الرقائق والآثار

٥- مشكات الختام فى معرفة الامام

٦- الدر المعتبرة فى شرح ابيات الثمانية العشرة

٧- شرح صلاة المختصرة للشيخ الاكبر

٨- شرح اللمعات لفخر الدين العراقى(٢)

بە ئومێدی ئەوەی بەرهەمەکانی ئەم زانا هەولێرییە ساغ بکرێنەوە و ببنە خشتێک بۆ سەر دیواری گەورەی مێژووی زانایانمان.

**پەراوێز و سەرچاوەکان**


Cunbur, Müjgan (2002). «Abdülkadir Kemaleddin». Türk .Dünyası Edebiyatçıları Ansiklopedisi. C. I. Ankara: AKM Yay. 77

٢ زانیاریی لەبارەی کتێبە ونبووەکانی لەم تێزەی ماستەر وەرگیراوە:
ABDULKADĠR BĠN MUHYĠDDĠN EL–ERBĠLÎ HAYATI, ESERLERĠ VE TASAVVUFÎ GÖRÜġLERĠ, Mehmet TAġKANAT, Yüksek Lisans Tezi, ERCĠYES .ÜNĠVERSĠTESĠ, Kayseri 2014








نووسینی: د.زیاد عەبدولکەریم

وەرگێڕانی لە عەرەبییەوە: وەفا تاهیر محەمەد

# فەلسەفەی پەروەردە چییەتی و گرنگیی

**بەرایی:**

لە سەردەمی ئێستاماندا، زۆرینەی وڵاتانی جیهان گرنگییەکی گەورە بە بابەتی پەروەردە ئەدەن، کە گشتگیرتر و فراوانترە لە پرۆسەی فێرکردن، زانراویشە پەروەردە جێ ئومێدی ئوممەتان و ڕێگەی هەستانەوەیانە، چونکە ڕەنگدانەوەی ئێستا و پلانی داهاتوو و باڵاکردنە بەرەو ئاسۆیەکی پرشنگدار، ئەمەش لەپێناوی ئەوەی بگەنە ئاستێکی باڵا لە شیاندن و گەشەپێدانی کۆمەڵگە،گەشەپێدانێکی گشتگیر کە تەواوی بوارەکانی ژیان: کولتووریی و کۆمەڵایەتی و سیاسیی و ئابووریی. بنەمایەکی گەورەی پەروەردە ئەوەیە کە گرنگیی بە تاك، وەک کرۆک و پێکهێنەری یەکەمی کۆمەڵگە بدرێ و بەشێوەیەکی ڕاست و دروست و گشتگیر پەروەردە بکرێ، درک بە ڕەگەز و بنەماکانی کەسێتیی بکرێ، بە جەختکردنەوە لەسەر پێگەیاندنی ئەو تاکە لەسەر بنەما و بەهاکانی کۆمەڵگە و ئوممەتەکەی، کارکردن لەسەر ڕێککردنەوەی ڕەفتارەکانی و بنیاتنانی کەسێتییەکەیی و ئامادەکردنی ئەو تاکە بەشێوەیەکی توندوتۆڵ کە لەگەڵ کولتووری کۆمەڵگەکەی گونجاو بێ تاوەکو شایستە بێ بەوەی کۆمەڵگەی بنیات بنێ و هەڵگری کلتووری کۆمەڵگەکەی بێ.

**یەکەم: چییەت (ماهیەت)ی فەلسەفەی پەروەردە**

ئامادەگیی فەلسەفە لە کایەی پەروەردەدا، داخوازیی ڕۆحی ئەم چەرخەیە کە تێیدا دەژین، ئەمەیش بنیاد لەسەر ئەوەی کە بنەڕەت و بناغەی فەلسەفەی پەروەردە لەسەر بابەتێک وەستاوە کە پەروەردە گرنگیی پێدەدات ئەویش خودی مرۆڤ و پەیوەندییەتی لەگەڵ خۆی و لەگەڵ کۆمەڵگە. زانراویشە کە ئەم پەیوەندییەی مرۆڤ لە ڕێڕەوی پەرەسەندنی فیکری مرۆییدا بابەتێکی تەواو فەلسەفیی بووە و تەنها لە ڕوانینی فەلسەفییەوە لێکۆڵراوەتەوە. هەرچی فەلسەفەیە، شێوازێکی مەنهەجییانەیە بۆ بیرکردنەوە لەوەی کە بوونی هەیە، و هەوڵدانە بۆ ناسینی شتەکان بەشێوەیەکی هەمەکیی، بەپشتبەستن بە شیکارکردن و ڕێککاریی و ڕەخنە و تێڕامان، فەلسەفە هەوڵدەدات کۆی ئەو شارەزاییەی مرۆڤ لە بوارە جیاوازەکاندا کەڵەکەی کردووە، پێکەوە گرێبدات. دەیەوێت بەردەوام لە واقیع تێبگات لە شێوە گشتگیرییەکەیدا. بەهەمان شێوە فەلسەفەی پەروەردەش هەوڵدەدات بۆ تێگەیشتن لە پەروەردە بەشێوەیەکی هەمەکیی گشتگیرانە، بەجۆرێک کە بیرکردنەوەی فەلسەفییانە لە کایەی پەروەردەدا جێبەجێبکرێ. بەم شێوەیە فەلسەفە، وەک (جۆن دیۆی) دەڵێت: دەبێتە تیۆری گشتیی پەروەردە و پەروەردەش دەبێتە ئەو کارخانەیەی کە هزرە فەلسەفییەکانی تێدا تاقی دەکرێنەوە.

**(فەلسەفەی پەروەردە) بریتییە لەو چالاکییە هزرییە ڕێکخراوەی کە فەلسەفە دەکاتە ئامرازێک تاوەکو لە ڕێیەوە وا لە پرۆسەی پەروەردە بکات ڕێکخراو و هەماهەنگ و گونجاو بێ.**



ئەگەر بڵێین: فەلسەفەی پەروەردە جێبەجێکردنی مەنهەج و تێڕوانینی فەلسەفەیە لەسەر پەروەردە، چونکە هەم ڕۆڵی هەیە لە دیاریکردنی ڕێگای تایبەت بە پرۆسەی پەروەردەکردن و هەمیش بەشدارە لە ڕێککردنەوە و ڕەخنەگرتن و هەماهەنگی ئەو پرۆسەیە تاوەکو هاوشانی کێشە و ململانێ کولتوورییەکان هەنگاو بنێ و وەڵامی گونجاوی هەبێت بۆیان. هەروەها فەلسەفەی پەروەردە بریتییە لە کۆششی وەگەڕخراو لەپێناو جێبەجێکردنی هزرە فەلسەفییەکان لە ژینگەی پەروەردەدا، یان بریتییە لە هەوڵدان بۆ پەخشکردنی تێڕوانینی گشتیی فەلسەفە لەنێو پێکهێنەرە تایبەتەکانی پەروەردەدا، پاشان گەڕان بەدوای بەهاکان و مەعریفەدا، و ڕەخنەکردنی ئەو گریمانە باوانەی لە پرۆسەی پەروەردەدا باڵادەستن، و بەشداریکردن لە دابینکردنی هەماهەنگییەکی تایبەت بە پرۆسە




پەروەردەییەکان تاوەکو وایان لێبکات هاوشانی گرفتەکانی کۆمەڵگە هەنگاو بنێن.

بەم شێوەیە (فەلسەفەی پەروەردە) بریتییە لەو چالاکییە هزرییە ڕێکخراوەی کە فەلسەفە دەکاتە ئامرازێک تاوەکو لەڕێیەوە وا لە پرۆسەی پەروەردە بکات ڕێکخراو و هەماهەنگ و گونجاو بێ، و ئەو بەها و ئامانجانە ڕوونبکاتەوە کە ئەیەوێ بیان هێنێتە دی. هەر لەم چوارچێوەیەدا پرۆفیسۆر (ئۆلیڤەر ڕێبۆول) لە پەرتوکەکەیدا (فەلسەفەی پەروەردە) دەڵێت: پەروەردە، پێش ئەوەی هەرچی بێ، بەتەواوی بەشێکە لە بوونی مرۆیی وەک هەریەک لە زانست و هونەر و زمان، هەرئەمەشە بوونی فەلسەفەی پەروەردە پێویست دەکات. ڕەنگە قەناعەتێکی وامان لا دروست ببێ کە مەبەستمان لە فەلسەفەی پەروەردە لێرەدا لقێکی لاوەکیی فەلسەفە بێ! بەڵام ئەگەر ئێستا پرسیار لە فەیلەسوفێک بکەین کە مرۆڤ چییە؟ چی شتێک لە گیاندارانی تری جیادەکاتەوە؟ لە وەڵامدا دەڵێت: مرۆڤ بە کار و زمان و کلتوور جیادەکرێتەوە، دەی خۆ ڕوونیشە کە هەریەک لە کار و زمان و کلتوور بەبێ پەروەردە بوونیان نییە، هەروەک کاتی خۆیشی کانتی فەیلەسوف وتوویەتی: ئەوەی مرۆڤ لە گیاندارانی تر جیادەکاتەوە تەنها ئەوەیە کە مرۆڤ بەبێ پەروەردە ناتوانێ مرۆڤ بێت.

کەواتە فەلسەفەی پەروەردە بریتییە لە لێکۆڵینەوەی فەلسەفیی شیکاریی ڕەخنەگرانەی پەروەردە لە ڕووی چییەتی و مەبەست و ئامانج و توانا و سنوورەکانی بۆ گەیشتن بە تیۆرەکانی پەروەردە و ڕاڤە بنەڕەتییەکانی پرۆسەی پەروەردەیی کە توانای جیبەجێکردنیان لە بوارە جیاوازەکانی پەروەردەدا هەبێ. دەگونجێت بڵێین سیستەمی پەروەردەش یەکێکە لە سیستەمە جۆراوجۆرەکانی کۆمەڵگە، بەڵام هەم کاریگەری لەسەریان هەیە و هەمیش پێیان کاریگەرە، بۆیە هەر هەنگاوێک بۆ چاکسازیی لە بواری پەروەردەدا بنرێ تاوەکو بتوانێ فریای پەرەسەندنە خێراکانی مەعریفە بکەوێ و ڕووبەڕووی ئەو ئاڵنگارییانەش بێتەوە کە چواردەوریان لێگرتووە، ئەوا دەبێت لە چوارچێوەیەکی هەمەکیی گشتگیردا، کۆی سیستەمەکانی ئابووریی و کۆمەڵایەتیی و ڕامیاریی و کلتووریی و ڕاگەیاندن ڕەچاوبکرێت.

### دووەم: گرنگیی فەلسەفەی پەروەردە

پەروەردە، بەگشتیی، کار لەسەر دڵنیایی و پاراستنی سیستەمی گشتیی کۆمەڵگە دەکات، کارلێکیش لەگەڵ تێهاویشتەکان (مدخلات)ی دەکات تاوەکو کار لەگەڵ شتە واقیعییەکاندا بکات و هەوڵیش بدات لەگەڵیاندا بژی و هەڵبکات، هەروەها بتوانێ ڕووبەڕووی ئەو ئاریشە و ئاڵنگارییانە بێتەوە کە ڕوودەکەنە کۆمەڵگە، لەمەشەوە ڕوون ئەبێتەوە کە پێویستە کۆششەکانی دەزگا و دامەزراوەکان بەشێوەیەک یەکخراو و هەماهەنگ بن کە گەرەنتی بەردەوامیی پرۆسەی پەروەردەیی و بەدیهێنانی ئامانجەکانی بدەن. لێرەوە هەستئەکەین کە پێویستییەکی زۆرمان بە یەکخستنی کۆششەکانی دامودەزگا جیاوازەکانی کۆمەڵگە

و ڕەگەزە کاریگەرە جیاوازەکانی تری کۆمەڵگە وەک: خێزان و خوێندنگە و زانکۆ و ڕاگەیاندن و دامەزراوەکانی تری تایبەت بە پێگەیاندنی کۆمەڵایەتی، هەیە، واتە ئەبێ گونجان و هەماهەنگی لە نێوان ڕەگەزە کاریگەرەکانی ناو پرۆسەی پەروەردەدا هەبێ.

گرنگیی فەلسەفەی پەروەردە لە زۆر بواری ژیاندا دەردەکەوێت، وا لەم چەند خاڵەی خوارەوەدا کۆی ئەکەینەوە:

١. هاندەرە بۆ وەرگرتن و قەبوڵکردن (ئیستیعابکردن)ی پرۆسەی پەروەردە و بەئاسانیی چاکسازیکردن تیایدا.

٢. بەشداریی ئەکات لە دانانی ئاراستە و هێڵە نوێیە داهێنراوەکانی گەشەی پەروەردەیی.

٣. ڕۆڵێکی کاریگەر دەگێڕێت لە ڕێکخستنی هزری پەروەردەییدا، چونکە خۆی فەلسەفەیەکی ئەزموونییە.

٤. بەشدارە لە قوڵکردنەوەی چەمکەکانی پرۆسەی پەروەردەدا، و ئاڵۆزییەکانی ئەو چەمک و گریمانانەش ڕووندەکاتەوە کە تیۆرەکانی پەروەردە پشتیان پێدەبەستن.

٥. ئاسانکاری دەکات لە ناسینی سروشتی پەیوەندی نێوان زانستی پەروەردەیی و دیاردەکانی ژیان.

٦. پانتایی مەعریفەی مرۆڤ سەبارەت بەو ململانێ و دژیەکییانەی کە فەلسەفەی پەروەردە و بوارە پراکتیکییەکەی بەدەستیانەوە ئەناڵێنێن، فراوانتر ئەکات.

٧. لێشاوێک لە پرسیار لە ئاوەزی مرۆڤدا ئەوروژێنێ سەبارەت بە چۆنێتی بەدیهێنانی زیندوێتی پەروەردەیی، و بەمەش پەرە بە تواناکانی ئەدات بۆ زیاتر ناسینی فەلسەفە.

لەم ڕۆژگارەشدا، لەسایەی ئەو پەرەسەندنە خێرایەی دونیای هاوچەرخمان لەسەر ئاستی ئابووریی و کۆمەڵایەتیی و سیاسیی و کلتووری و بەهایی، بەخۆیەوە ئەیبینێت، کێشەکانی پەروەردە و فێرکردن قورستر و ئاڵۆزتر بوون و بوونەتە بەربەستێکی بەردەوام لە بەردەم داڕێژەرانی سیاسەتی پەروەردەیی، لەبەرئەوەی لەکاتێکی پێوانەییدا پێداویستیگەلێکی نوێ دێنە ئاراوە و هی تریش لەناودەچن و سیستمگەلێکی پەروەردەیی تێدەپەڕێنرێن، چونکە شۆڕشی مەعریفی و تەکنەلۆژیی بە ڕیتمێکی زۆر خێرا دەڕوات.

بنیات لەسەر ئەمە، پێویستە لەسەر تەواوی ئەو ئوممەت و ژیار و کۆمەڵگە و دەوڵەتانەی کە ئەیانەوێ لەگەڵ ئەم گۆڕانکارییانەی سەردەمی ئێستامان –سەردەمی جیهانگیریی–دا هەڵبکەن، ئەوا بە کارایی و گەرەنتی و هێزەوە سیستمی فێرکردنیان بپارێزن و توانای بەردەوامبوونی لەنێو جەنجاڵیی کێبڕکێ و بەرهەمهێنان و گەشەسەندندا، بۆ دابین بکەن. ئەمەش بەبێ تێڕوانینێکی هزریی ڕوون و گشتگیر کە بەردەوام لە جووڵە و نوێبوونەوە و گەشەسەندنی بەردەوامدا بێ.

هەنگاوی یەکەمی ئەم تێڕوانینەش ئەبێ لە پوختە و دەرئەنجامەکانی ئەو توێژینەوە پەروەردەییانەوە دەستپێبکات ، کە لەسەر بناغەی فەلسەفاندنی پەروەردەیی ئەنجامدراون.

لەگەڵ ئەوەی زانستەکانی پەروەردە لق و پۆپی زۆرن، بەڵام ڕوحی سەردەمی ئێستامان ئەوە ئەخوازێت کە فەلسەفە هەموو کات لە کایەی پەروەردەدا ئامادەبێت، چونکە فەلسەفەی پەروەردە بنەماکەی لە سروشتی ئەو بابەتانەوە وەردەگیرێت کە خودی پەروەردە گرنگی پێئەدات، ئەویش خودی مرۆڤ و پەیوەندییەتی لەگەڵ خۆی و لەگەڵ کۆمەڵگە.

زانراویشە کە فەلسەفەی پەروەردە نەک هەر لقێک نییە لە لقەکانی مەعریفە وەک هەریەک لە هونەر و زانست و مێژوو، بەڵکو هەموو ئەو لقانە (هونەر و زانست و مێژوو) ش لە ڕووی تیۆریی و مەعریفیی و مەنهەجییەوە لە خۆدەگرێت و هەوڵیشدەدات پەیوەندی لە نێوانیاندا بنیات بنێ. چونکە فەلسەفە کار لەسەر گرێدان و پێکەوەبەستنەوەی کۆی بوارەکانی شارەزایی و ئەزموونی مرۆیی بکات و لە هەوڵیشدایە تێگەیشتنێکی گشتگیرانە هەبێ بۆ واقیع، بەهەمانشێوە فەلسەفەی پەروەردەش تێدەکۆشێ بۆ تێگەیشتن لە پەروەردە لەچوارچێوە هەمەکییە گشتگیرکەیدا، بە جۆرێک کە ببێتە مایەی جێبەجێکردنی بیرکردنەوەی فەلسەفیی لە کایەی پەروەردەدا.

**سێیەم: تایبەتمەندییەکانی فەلسەفەی پەروەردە**

فەلسەفەی پەروەردە هەندێک تایبەتمەندیی هەیە کە لە فەلسەفەکانی تر جیای دەکاتەوە، لەم چەند خاڵەی خوارەوە پوختی ئەکەینەوە:

١. وەسفکردن: تاڕادەیەکی زۆر، فەلسەفەی پەروەردە پشتدەبەستێت بە وەسفکردنی هەموو ئەوانەی ڕووبەڕووی پەروەردە ئەبنەوە لە کێشە پەروەردەییەکان و هۆکارەکانیان و زانینی کاریگەرییە ڕاستەوخۆکانیان.

٢. تێڕامان: واتە ڕوانینی ورد و گشتگیر بۆ هەموو ڕەگەزە جیاوازەکانی پەروەردە، لەنێویشیاندا مەعریفە و سروشتی مرۆیی. بە بەشەکانی لە نێوانیشیاندا سروشتی مرۆڤ و زانیارییەکانە.

٣. شیکردنەوە و لێکدان: واتە تەرکیزکردنە سەر بیرۆکە و تیۆر چەمک و قانوونەکان و شیکارکردنیان و دڵنیابوون لەوەی کە تا چەندێک گونجاون و کەڵکی ئەوەیان هەیە پراکتیزە بکرێن.

٤. ڕاڤە و ڕێنمایی: واتە ڕاڤەکردنێکی تێروتەسەلی هەموو ئەو شتانەی کە ڕووبەڕووی پەروەردە ئەبنەوە لە: کێشەکان، ڕێوشوێنەکان، ڕەگەزەکان، لە هەموو ئەمانەشدا پشت بەیەک مەنهەج ببەسترێ بۆ گەیشتن بە ڕێنمایی و بەرچاوڕوونی.

٥. ڕەخنە: ئەم تایبەتمەندییە هەموو تایبەتمەندییەکانی پێشوو تەواو ئەکات، ئەویش بە ڕەخنەکردنی زانیاریی و داتا بەردەستەکان لە ڕوانگەی بنچینە جیاوازەکانی پەروەردەوە.

**دەرئەنجام:**

لەوەی ڕابورد، بۆمان ڕوون ئەبێتەوە کە فەلسەفەی پەروەردە چالاکییەکی هزریی ڕێکخراوە و فەلسەفە دەکاتە ئامرازێک بۆ ڕێکخستن و هەماهەنگیی پرۆسەی پەروەردە و گونجانکاریی تێیدا، و ڕوونکردنەوەی ئەو بەها و ئامانجانەی پەروەردە هەوڵدەدات بیانهێنێتەدی. لێرەوە گرنگی لێکۆڵینەوە لە فەلسەفەی پەروەردە لەم سەردەمەی ئێستاماندا بۆ دەردەکەوێت، چونکە هەم دەبێتە مایەی ئەوەی بە ڕێگەی باشتر و قووڵتر لە مانای پرۆسەی پەروەردەیی تێبگەین و چۆنیش پێیهەستین، هەم کۆمەکیشمان ئەکات لە دەستخستنی ئەو میکانیزمەی کە بەرچاوڕوونمان ئەکات لە ناسینی ململانێ جیاوازەکانی نێوان تیۆری پەروەردەیی و پەروەردەی پراکتیکیی و هەوڵدانیش بۆ نەهێشتنی ئەو ململانێیانە، تاوەکو دیدگا فراوانتر و گشتگیرتر بێ و هزریش زیاتر ڕوو لە شیکردنەوە و ڕەخنەگرتن بێ، و پەروەرشیارانیش بالا بکەن و هەڵکشێن، و بەهۆی تەرکیزیان لەسەر لێکۆڵینەوە و توێژینەوە مەیدانی و بەتایبەت ڕاپرسییەکان، ئەوەندە لە شتە وردەکاندا ڕۆنەچن، و توێژینەوەی فەلسەفیی پشتگوێ نەخەن، چونکە توێژینەوەی فەلسەفیی زۆر پێویستە بۆ هەموو هەوڵێکی زانستیی بۆ تێگەیشتن لە دیاردە پەروەردەییەکان و بەتایبەتیش تێگەیشتن لە چەمکی فەلسەفەی پەروەردە.

**سەرچاوە:**

فلسفة التربية ... الماهية والأهمية

د. زياد عبد الكريم

سایتی ساسەپۆست، لەسەر ئەم بەستەرە بەردەستە:

https://www.sasapost.com/opinion/philosophy-of-education-the-essence-and-importance/



عادل صدیق عەلی

# ڕۆڵی ئایین لە سەرهەڵدانی ڕۆژهەڵاتناسی و پرۆسە داگیرکارییەکاندا ئەڵمانیا بەنموونە

**ڕۆژهەڵاتناسی:**

خۆرهەڵاتناسی، کە بە عەرەبی (استشراق) و بە فارسی (خاورشناسی) و بە ئینگلیزی (Orientalism)ی پێ دەڵێن، کاتێك خۆرئاواییەکان خۆیان پێناسەی دەکەن جیاوازە لەگەڵ ئەوەی خۆرهەڵاتییەکان پێناسەی دەکەن، بەلای خۆرئاواییەکانەوە، خۆرهەڵاتناسی بریتییە لەو دیسپلینانەی کە ئامانجیان لێکۆڵینەوەیە لە شارستانییەتی خۆرهەڵات، خۆرهەڵاتناسیش بەوە پێناسە دەکەن هەرکەسێکە شارەزا و پشپۆڕ بێت لە زمان و ئەدەبیاتی خۆرهەڵات. یان دەتوانین بڵێین ڕۆژهەڵاتناسی تەوژمێکی فیکرییە لەو لێکۆڵینەوە و دیراسە هەمەچەشنانەدا ڕەنگیداوەتەوە، کە دەربارەی ڕۆژهەڵات و گەلانی مسوڵمان نوسراون و تیایاندا ڕۆژئاواییەکان لە ئایین و زمان و ئەدەب و شارستانییەت و کلتووری ڕۆژهەڵاتیان کۆڵیوەتەوە.

وەک دەبینین ئەم پێناسانە گشتین و لە ڕێگای ئەرک و جۆری کارەکەوە دیاریکراوە، لە هەموو خۆرئاواش بەوجۆرە پێناسە دەکرێت، بەو واتایەی کە هەموویان لەسەر مەسەلەکە کۆک و تەبان، کەچی خۆرهەڵاتناسی و خۆرهەڵات بەلای خۆرهەڵاتەوە بەتایبەتی لەلای هەندێک لە عەرەبەکان شتێکی زۆر جیاوازە، تەنانەت هەندێکیان زۆر بەتوندی دژی خۆرهەلاتناسی دەوەستنەوە، بەنمونە هەریەکە لە ئیدوارد سەعید و د.شکری النجار پێیانوایە شێوازێکی خۆرئاوایە بۆ تێگەیشتن و کۆنترۆلکردنی خۆهەڵات، کەسێتی خۆرهەڵاتناسیش لە سیخوڕێک زیاتر نییە.

**مێژووی سەرهەڵدانی ڕۆژهەڵاتناسی:**

ئەگەرچی پەیوەندییەکانی نێوان خۆرهەڵات و خۆرئاوا و بەریەکەوتنیان مێژوویەکی دوورودرێژ و کۆنی هەیە، بەڵام بابەتی ڕۆژهەڵاتناسی وەک دیاردەیەکی مێژوویی لەگەڵ جەنگی خاچپەرەستەکان لە سەدەی یانزەوە زیاتر سەریهەڵدا. بەکورتی ڕۆژهەڵاتناسی دیاردەیەکە وەک مەنزومەیەکی هزری جۆراوجۆر لە سەردەمێکی دیاریکراوەوە و لە قۆناغێک لە قۆناغەکانی پەرەسەندنی پەیوەندی ڕۆژئاواوە بە ڕۆژهەڵات سەریهەڵداوە، ڕەگی ئەم دیاردەیەش دەگەڕێتەوە بۆ قۆناغی سەدەکانی ناوەڕاست و تیایدا بە کاریگەری هەندێک فاکتەر ڕۆژئاوا کەوتە خۆ بۆ ناسینی ڕۆژهەڵات و پاشان لە قۆناغی دواتردا لەگەڵ گۆڕانی ئاڕاستەی هزری ڕۆژئاوا لەلایەک و گۆڕانی بارودۆخی ڕۆژهەڵات و پەیوەندی نێوان ئەو دوو جیهانە لەلایەکی دیکەوە ئەمانە بوونە هۆی ئەوەی ڕۆژهەڵاتناسیش وەک حەقلێکی سەربەخۆ دیدوبۆچوونی تایبەت بەخۆیان هەبێت لەمەڕ ڕۆژهەڵات و کەلتوورەکەی، ئەم دیدو بۆچوونانەش لە شێوەی تیۆر و گریمانەی جۆراوجۆرەوە لەناو لێکۆڵینەوە ڕۆژهەڵاتناسییەکاندا ڕەنگیداوەتەوە.

ڕوونتر بڵێین ڕەگی بزاڤی ڕۆژهەڵاتناسی لە سەدەکانی ناوەڕاستەوە لەگەڵ ڕوودان و پەرەسەندنی جەنگی خاچپەرستەکان هاتەکایەوە، کە بەهۆیەوە ڕۆژهەڵات لەو سەردەمەدا بوویە مایەی بایەخپێدان لەلایەن جیهانی مەسیحی ڕۆژئاواوە. دواتر ئەم بابەتە وەک زانستێک و بوارێکی مەعریفی لە خورئاوا بەڕەسمی لەلایەن کڵێساوە لە ڤییەننا ساڵی ١٣١٢ز بڕیاری لەسەر دراوە، لەگەڵیدا کۆمەڵێک کورسی بۆ خویندنی زمانەکانی(عەرەبی، یۆنانی، عیبری، سریانی) لە زانکۆکانی پاریس و ئۆکسفۆرد و پۆلۆنیا و ئەفینیۆن و سلامنکای بۆ تەرخانکرا.

دواتر لە سەدەی شازدەدا لە فەڕەنساش خۆرهەڵاتناسی وەک زانستێک بەشێوەیەکی ڕەسمی چەسپا، لە ساڵی ١٥٣٠ز لە پاریس کۆلێژی شاهانە کرایەوە کە تیایدا زمانەکانی یۆنانی و عیبری دەخوێنرا، لێرەوە وردە وردە لە ئەنجامی پێشکەوتنی بازرگانی نێوان خۆرهەڵات و خۆرئاوا، پەیوەندی دیپلۆماسیی و سیاسی نێوان فەڕەنسا و خۆرهەڵاتیش

پەرەی سەند. ئەوەبوو لە سەدەی شانزەدا فەرەنسا باڵیۆزخانەی خۆی لە پایتەختی هەردوو دەوڵەتی عوسمانیی و سەفەوی کردەوە. پاشان بایەخدانی ئەوروپییەکان بەگشتی و فەرەنسا بەتایبەتی بە خۆرهەڵات و کلتوورەکەیان پەرەی سەند. بۆ نموونە ژمارەی کتێبە وەرگێڕاوەکان بۆ زمانی فەرەنسی گەیشتە ٨٠٠ کتێب، لەکاتێکدا لە نێوان ساڵانی ١٦٥٠-١٧٠٠ تەنها ٨٤ کتێب وەرگێڕدرابوون. ئەوەش کاریگەری دانا لەسەر پێشکەوتنی پەیوەندی کلتووری نێوان ئەوروپا و خۆرهەڵات. هێندەی پێنەچوو لەبەر گرنگی زانستەکە لە نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەدا لەسەر داوای زانای فەرەنسی(لیون دی ڕۆزنی) ساڵی ١٨٧٣ لە پاریس یەکەم کۆنگرەی نێودەوڵەتی خۆرهەڵاتناسی بەسترا.

دەبێ ئەوەش بڵێین کە ڕۆژهەڵاتناسی چەند جۆرێکی هەیە، بەڵام ئەوەی لێرەدا مەبەستی نووسینەکەی ئێمەیە ڕۆژهەڵاتناسی بۆرجوازی ئیستعمارییە، سەرهەڵدانی ئەم جۆرە دەگەڕێتەوە بۆ تەشەنەکردنی بزاڤی داگیرکاری ئەوروپی لە دەرەوەی سنوورە تەقلیدییەکەیەوە بەرەو بەشەکانی دیکەی جیهان بە ئامانجی داگیرکاری، بەهۆیەوە ڕۆژهەڵاتناسی بوو بە دەزگایەکی ئیستعماریی و پەیوەندییەکی پتەوی هەبوو لەگەڵ بەرژەوەندییە ئابووریی و بازرگانی و ستراتیژییەکانی دەوڵەتە ئیستعمارییەکانەوە، ئیدی بەم شێوەیە ڕۆژهەڵاتناسی بونیاتێکی هزری ئایدۆلۆژی تایبەت بەخۆی وەرگرت و چەندین گریمانە و تیۆر و بیروباوەڕی جۆراوجۆری گرتە خۆی و بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ لە دووتوێی ئەو بەرهەمە هزریی و زانستی و سیاسیی و کۆمەڵایەتییانەی کە دەزگا ڕۆژهەڵاتناسییەکان بەرهەمیان هێنابوو دەری دەبڕین.

لێرەوە دەتوانین ئاماژە بە گرنگترین تیۆرەکانی ڕۆژهەڵاتناسی بۆرجوازی ئیستعماری بکەین کە خۆی لە دوو تیۆری سەرەکیدا دەبینییەوە، ئەگەرچی هەردووکیان لە شێوەدا جیاوازن، بەڵام لە ناوەڕۆکدا لەیەک دەچن، چونکە هەردوو تیۆرەکە شێوەیەک لە شێوەکانی هوشیاری خودیی و چینایەتی و نەتەوەیی ئەو بۆجوازییانە نیشان دەدات کە بە ئاڕاستەی ئیمپریالیزم تەشەنە دەکەن، ئەوانیش بریتین لە تیۆری نەژادگەریی و تیۆری ئەوروپا سەنتەری. لە ناوەڕاستی سەدەی ڕابردووش بەدواوە بیری سیاسیی و ڕووناکبیری زیاتر پێشکەوت و ڕێبازە سیاسیی و فەلسەفییەکان تێکەڵبوونی زیاتریان بەخۆیانەوە بینی و دنیای خۆرهەڵات و خۆرئاواش لە ئەنجامی قوڵبوونەوەی بەرژەوەندی و ناکۆکییەکانی نێوانیان بەیەکتردا هەڵپژان ئەوەش وایکرد بابەتی خۆرهەڵاتناسی زیاتر قوڵبوونەوە بەخۆیەوە ببینێت.

هەر لەگەڵ ئەمانەشدا شەپۆڵێکی بەهێزی بوژانەوەی ئایینی لە ناوەڕاستی نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەوە ئەوروپای خۆرئاوای گرتەوە. ئەم تەوژمە بەتایبەتی لەنێو چینەکانی ناوەندا فرە بەهێز بوو. هاوکات پێداگرییەکی بەهێز هەبوو بۆ بڵاوبوونەوەی ئایینی مەسیحی لە ئەفریقا و ئاسیا، هەربۆیە کاری مسیۆنێرە ئەوروپییە مەسیحییەکان

توانی لە بیابانی گەورەی ئەفریقادا سەرکەوتنی گەورە بەدەستبهێنێت، بەڵام لە ئاسیا و باکووری ئەفریقای ئیسلامیدا نەیانتوانی سەرکەوتووبن. د.دیفید لیفنجستون یەکەم پیاوی سپی پێست بوو کە هەستا بەکاری ئایینی و مرۆڤدۆستانە بەتایبەتی لە ناوەند و باشووری ئەفریقادا. هەروەها ئێچ.ئیم ستانلی ئەوکەسە بوو کە لە ڕاپۆرتە ڕۆژنامەوانییەکانیدا بایەخی ئەوروپییەکانی بۆ ئەفریقا دەخستە ڕوو، ئەو کەسێک بوو هاوکاری پاشای بەلجیکای دەکرد هەتاکو بتوانێت دەستی بە کۆنگۆ بگات.

**ڕۆڵی ئایین لە سەرهەڵدانی دیاردەی ڕۆژهەڵاتناسی و پرۆسەی داگیرکاریدا:**

ئەڵبەت فاکتەرەکانی سەرهەڵدانی دیاردەی ڕۆژهەڵاتناسی زۆرن، بەڵام ئێمە لێرەدا تەنها جەخت لە پاڵنەرە ئایینییەکەی دەکەینەوە و دەیخەینە بەر باس و لێکۆڵینەوە.

دوای ئەوەی کە ئایینی ئیسلام گەیشتە ئەوروپا، ئەوروپییەکان پێشکەوتنی مسوڵمانان و دواکەوتنی خۆیان بەچاوی خۆیان بینی، هەروەها سەرکەوتنی مسوڵمانان و شکستی خۆیان لەبەرەکانی جەنگدا بینی، ئەمە وای لە ئەوروپییەکان کرد کە هەست بە بوونی کەلێن و بۆشایی گەورە لە شارستانییەت و کلتووری خۆیاندا بکەن، هەرزوو دەرکیان بەوە کرد کە ئەو پێشکەوتنەی مسوڵمانان و دواکەوتنەی خۆیان، واتا کۆتایی ئەوان، بۆیە خێرا کەوتنە خۆیان بۆئەوەی بوار نەدەن ئایینی ئیسلام لەوە زیاتر تەشەنە بکات و پەلبهاوێت، کڵێسا بڕیاریدا کە خۆرهەڵاتناسی وەک زانستێک لە زانکۆکانی ئەوروپا بخوێنرێت، هەرلەبەرئەوەش بوو زۆربەی زۆری دەزگا خۆرهەڵاتناسییەکان بریتی بوون لە دەزگای کڵێسایی، چونکە کڵێسا بڕیاری لەسەردابوو، هەروەها ئەوانەی کە دەهاتن بۆ خۆرهەڵات بەزۆری پیاوانی ئایینی کڵێسا بوون، بە هەموو توانایانەوە هەوڵی ئەوەیان دەدا کە ئایینی ئیسلام وا وێنا بکەن بۆ خەڵکی خۆرئاوا کە ئاینێکە شیاوی بڵاوبوونەوە نییە، چونکە مسوڵمانان هەموویان دز و جەردە و خوینڕێژن و ئیسلام زیاتر بایەخ بە شەهواتی جەستەیی دەدات و لایەنی ڕۆحانی و خولقی پشتگوێ خستووە.

بەوشێوەیە ڕۆژهەڵاتناسی لە سەدەکانی ناوەڕاستەوە بۆ یەکەمجار لە ڕێگەی ڕەبەنەکانەوە سەریهەڵدا، ئەمەش بەهۆی ڕێکخستنی کاروانی ڕۆژهەڵاتناسی کە لە پیاوانی ئایینی پێکهاتبوون و تەمسیلی داموودەزگاکانی کڵێسەیان دەکرد و کتێبی پیرۆزیان لە ڕۆژهەڵات بڵاودەکردەوە، بۆ ئەم مەبەستەش بیرۆکەی یارمەتیدانی مەسیحییە چەوساوەکانی ڕۆژهەڵاتی ئیسلامی هاتە کایەوە و بوو بە پاساوێک بۆ ئازادکردنی زەوییە پیرۆزەکان لەژێر چنگی مسوڵمانان. بەشێک لەو هێرشە داگیرکارییەکانی وڵاتانی ئەوروپی بینا لەسەر ئەو بەرچاوڕوونیانەی تیمەکانی لێکۆڵینەوە و موژدەدەرە ئاینییەکانەوە بووە، لەوەشدا تاڕادەیەک سەرکەوتووبوون لە دروستکردنی ناوچەی نیشتەجێبوون لە هەندێک




لەو هەرێمانەی کە لە دەرەوەی ئەوروپا داگیریان کرد، گەورەترین و دیارترین نمونەی ئەم حاڵەتە لە کیشوەری ئەفریقا ڕوویدا، بەتایبەتی لە باشووری سودان و نەیجیریا.

وڵاتانی داگیرکەر لەپێناو کەمکردنەوەی ئەو فشارە زۆرەی کە بەهۆی زۆربوونی ژمارەی دانیشتوانەوە ڕووبەڕووی ببوونەوە، کەوتنە هەوڵی گواستنەوە و نیشتەجێکردنی بەشێک لە خەڵکی وڵاتەکانیان لەو ناوچانەی کە لە دەرەوە داگیریان دەکرد، وڵاتانی ئەوروپا لە سەدەی نۆزدەدا ڕێژەیەکی زۆر بێکاریان تێدا بوو، ئەوەش پاڵنەرێکی سەرەکی بوو بۆئەوەی بەناوی ئاوەدانکردنەوەوە خەڵکانی وڵاتەکانی خۆیان ببەنە ناوچە داگیرکراوەکانیان و سەرقاڵیان بکەن بەکاری کشتوکاڵکردنەوە، وڵاتێکی وەک بەریتانیا لەو قۆناغەدا نزیکەی ١٠٣ گرووپی بۆ ئەو مەبەستە تێدا بوو. گومانی تێد نییە وڵاتانی ئەوروپا ئەو قۆناغە لەژێر فشارێکی گەورەی سیاسی و ئابووریی و سەربازیی و زانستیدا بوون، ئەوەش هۆکارێکی سەرەکی بوو بۆ پەرەسەندنی دیاردەی داگیرکاری لە دەرەوەی کیشوەرەکەیان.

> **تاڵانکردنی ناوچە کۆڵۆنیکراوەکانی ئەمریکای لاتین زۆر بەخێرایی کاریگەری لەسەر ئابووری ئەوروپای ڕۆژئاوا بەتایبەتی ئیسپانیا و پرتوگال دانا.**

ئەوەی تایبەتیش بێت بە دۆزینەوە جوگرافییەکان، دوای ئەوەی کە کۆڵۆمبسی خەڵکی جەنەوەی ئیتاڵیا ساڵی ١٤٩٢ ئەمریکای دۆزییەوە، تەواوی ئەو زەوییانەی کە دۆزییەوە بوون بە موڵکی ئیسپانییەکان، جگە لە بەرازیل کە دواتر پرتوگالییەکان دەستیان بەسەردا گرت، لە سەرەتای سەدەی شازدەشدا ماجەلانی پرتوگالی کە خزمەتی پاشای ئیسپانیای دەکرد، ڕێگەی ڕۆژئاوای لە ئەوروپاوە بۆ ڕۆژهەڵاتی دوور دۆزییەوە و بەوجۆرە سەلماندی کە زەریای ئەتڵەسی و گەورە پێکەوە بەستراون، لە مێژوودا ئەوە یەکەمین گەشتی دەریایی بوو بەدەوری جیهاندا.

ئەڵبەت هۆکاری زۆر لە پشت ڕەوتی گۆڕانکارییەکانی ئەوروپا و لەنێویاندا پەرەسەندنی دیاردەی کۆڵۆنیالیزم و ئیمپریالیزم هەبوون، لەنێویاندا ڕەهەندی ئایینی زۆر بەتوندی پاڵی بەدەوڵەتە ئیستعمارییەکانەوەنا بۆ داگیرکردنی ڕۆژهەڵات و بڵاوکردنەوەی ئایینی مەسیحی. لە قۆناغی ئیمپریالیزمدا پیاوانی نێردراوی مەسیحییەت لە ڕۆژهەڵات و ئیدارەی ئیستعماری هاوکات لەگەڵیاندا پێیان وابوو کەوا

سەرکەوتنی گەلانی ئەوروپا دەگەڕێتەوە بۆ ئایینی مەسیحی، چونکە مەسیحییەت هەر بە سرووشتی خۆی حەز بە پێشکەوتن دەکات. هەموو ئەوانە لەگەڵ دەستپێکردنی شاڵاوی چالاکی پڕوپاگەندەی ئایینیدا گونجاوبوون کە پشتگیرییان لە هەندێک لە دۆزینەوەکان دەکرد(لەوانە ئەوەی تایبەت بوو بە لیڤنجستۆن) کە بووە هۆی کۆکردنەوەی کۆمەڵێک زانیاری زۆر و گرنگ لەسەر ئەنسۆگرافیا و زمانەکان و جوگرافیا، لە ڕێگەی مژدەدەرە ئاینییەکانەوە کە خۆیان بۆ ئەو پرسە لە دەرەوەی ئەوروپادا تەرخانکردبوو. ئیسپانەکان خەزێنەی خەڵکە ڕەسەنەکەی ئەمریکایان تاڵان کرد، شارستانییەتە کۆنەکانی مەکسیک و پیرۆیان لەناوبرد، دواتریش بە بەکارهێنانی چەکی باشتر کە خۆی لە مسیۆنێرە کاسۆلیکەکاندا دەبینییەوە زۆرترین بەشی ئەمریکای ناوەند و باشووریان خستە ژێر کۆنترۆڵی خۆیانەوە. تاڵانکردنی ناوچە کۆلۆنیکراوەکانی ئەمریکای لاتین زۆر بەخێرایی کاریگەری لەسەر ئابووری ئەوروپای ڕۆژئاوا بەتایبەتی ئیسپانیا و پرتوگال دانا.

**نەزمی داگیرکاری ئەڵمانەکان زۆر دڵڕەقانە و توندوتیژ بوو، بەجۆرێك لە ئەنجامی ئەو سیاسەتە توندوتیژەی کە لە داگیرگەکانیاندا پەیڕەویان کرد زیاد لە ٥٠ هەزار ژن و منداڵ و پیاوی ئەفریقی بوون بە قوربانی.**

مەرج نییە هەر فاکتەری بڵاوکردنەوەی ئایین لە دەرەوە هۆکار بووبێت بۆ بڵاوکردنەوەی ئایین و هەل و دەرفەت ڕەخسان بۆ پرۆسەی داگیرکاری لە دەرەوە، بەڵکو هەندێک جار سیاسەتی چەوساندنەوەی ئایینی لە هەندێک لە وڵاتانی ئەوروپا بووە هۆی کۆچکردنی ئەو کۆمەڵە چەوساوانە ڕووە و وڵاتێکی دیکە... ساڵی ١٤٩٢ مسوڵمانەکان لە ئەندەلوس دەرکران، هەروەها هیگۆنۆتەکان لە فەڕەنسا ڕایان کرد بەرەو هۆڵەندا و بەریتانیا، کاسۆلیکەکان هاوئایین و ڕێبازگە ئاینییەکانی تریان دەچەوساندەوە، ئەم دەرپەڕاندن و کۆچپێکردنە بووە هۆی هەڵهاتن و ڕۆیشتنی ژمارەیەکی زۆر لە خاوەن بەهرە و مرۆڤە کارامە و زاناکانی ئەو وڵاتانە و جێگیربوونیان لەو وڵاتانەی بۆی چووبوون، هەربۆیەکە لە بەریتانیا و هۆڵەندا کەڵکێکی زۆریان لەو خەڵکانە وەرگرت بۆ داگیرگەکانیان بەتایبەتی هیگۆنۆتەکان کە بوونە هۆی ڕاکێشانی ژمارەیەکی زۆر لەو جۆرە خەڵکانە.

## داگیرکارییەکانی ئەڵمانیا بەنموونە:

لەوکاتەی وڵاتە ئەوروپییەکان سەرقاڵی داگیرکردنی ناوچەکانی ئەفریقا بوون، ئەڵمانەکان خەریکی پێکهێنانی یەکێتی وڵاتەکەیان بوون، ئەمەش بە بەراورد بەو گەمە ئیمپریالیستییەی کە بەریتانیا و فەرەنسا دەستیاندابوویە درەنگ بوو، دوای هاتنە کایەی یەکێتی ئەڵمانیا(١٨٧١)، ئەو وڵاتە گۆڕانکاری گەورەی بەخۆیەوە بینی لەڕووی پێشکەوتنی پیشەسازیی و پەرەسەندنی بواری ئابووری، بۆیە سەرمایەدارانی ئەو وڵاتە داوایان لە کاربەدەستانی ئەڵمانیا کرد، کە ئەوانیش وەک تەواوی وڵاتانی ئەوروپا داگیرگە لە دەرەوە دابمەزرێنن. هاوکات تاوەکو بەر لە ساڵی ١٨٨٤ پسمارکی ڕاوێژکاری ئەڵمانیا زۆر بایەخی بە نەزمی ئیمپریالیستی نەدەدا، بۆیە زیاتر سەرقاڵی جڵەوگیری مەترسییەکانی ڕووسیا لە خۆرهەڵات و فەرەنسا لە خۆرئاوا بوو. بەڵام کۆنفرانسی بەرلین کە لەلایەن پسمارک و جۆری فێری ڕێکخران، ئەوان لەوێوە ئامادەکاریی و ڕێکخستنی تەواویان کرد بۆ ڕێ و شوێنی داگیرکاری لە کیشوەری ئەفریقادا، هەرئەوەش بوو کە زەمینەی ڕەخساند تاکو ئەڵمانیاش ببێتە کاراکتەرێکی بەرچاو لە داڕشتنەوەی نەخشە ئیمپریالیستییەکەدا بۆ داگیرکردنی ئەفریقا.

وەک دەستپێک پسمارک لە ساڵی ١٨٨٣ بانگەوازێکی بۆ بازرگانانی وڵاتەکەی بڵاوکردەوە، تیایدا داوای لێکردن کە هەر پێشنیاز و سەرنجێکیان هەیە دەربارەی بەرژەوەندییە بازرگانییەکانی ئەڵمانیا لە دەرەوە پێشکەشی بکەن هەتا بەوردی حکومەت لێی بکۆڵێتەوە، دواتر پسمارک لە ساڵی ١٨٨٤ کۆی ئەو سکاڵانامە و پێشنیازانەی کە بازرگانەکان پێشکەشی حکومەتیان کردبوو لە دوو تویی کتێبێکدا بڵاوکردەوە. بازرگانەکان سکاڵایان لە کونسوڵە بەریتانییەکان لە ئەفریقا کردبوو کە کۆسپ و تەگەرە دەخەنە بەردەم بازرگانە ئەڵمانییەکان. لەمەدا پسمارک مەبەستی دۆزینەوەی بیانوو بوو بۆ جێکردنەوەی جێ پێی ئەڵمانیا لە دەرەوە، ئەوەبوو لە ساڵی ١٨٨٤ لەسەر داوای پسمارک کۆنگرەی بەرلین بەسترا، پسمارک لەم کۆنگرەیهدا هەوڵیدا کە ئازادی بازرگانی لە دۆڵی ڕووباری کۆنگۆ و نەیجیر بپارێزیت، لەلایەکی تریشەوە هەر وڵاتێک کە ناوچەیەک داگیردەکات پێویستە ڕێزی لێبگیرێت. ئەڵمانەکان گرنگیان بە ڕۆژهەڵاتی ئەفریقا دەدا، بەوهۆیەشەوە تووشی ململانێ بوون لەگەڵ ئینگلیزەکان، بەڵام دواتر ئەم ناکۆکییانە بە ڕێکەوتننامەیەک لە ساڵی ١٨٩٠ کۆتایی پێهات، کە تیایدا لەسەر ئەوە ڕێکەوتن ئۆگەندا ببێتە داگیرگەیەکی ئینگلیز و تەنزانیاش بۆ ئەڵمانیا بێت. جگە لەم ناوچانە ئەڵمانەکان دەستیان بەسەر هەندێک ناوچەی دیکەدا لە باشووری ڕۆژئاوای ئەفریقا گرت.

لێرەوە سەرەتای ململانێکانی لەگەڵ فەرەنسا و دواتر لەگەڵ بەریتانیادا لەسەر بابەتی داگیرکاری دەستپێکرد، چاوتێبڕینەکانی لە ڕۆژئاواوە لەسەر مەغریب(١٩١١) کە ناسراوە بە (کێشەی ئەغادیر) کە دواتر بەپێدانی کامیرون کێشەکە چارەسەر کرا و ناوچەکانی تری ئەفریقا بوو، لە ڕۆژهەڵاتیش لە کۆتایی سەدەی نۆزدەوە هەوڵەکانی خستەگەڕ

بۆ بەدەستهێنانی ئیمتیازات لەناو دەوڵەتی عوسمانیدا کە یەکێک لەوانە ڕاکێشانی هێڵی ئاسنی بەغدا ـ بەرلین بوو. لەوەبەدوا ئەڵمانیاش توانی زنجیرە داگیرکارییەکی بچووک و جیاجیا لە کیشوەری ئەفریقادا بۆ خۆی ببچڕێت. هەربۆیە هەتاوەکو جەنگی یەکەمی جیهانی هەموو ئەو ناوچانەی کە ئەڵمانیا توانی دەستیان بەسەردا بگرێت پێنج جار زیاتر بوون لە خاکی ئەڵمانیا خۆی. ساڵی ١٨٨٤ ئەڵمانیا توانی دەستبگرێت بەسەر کامیرون و تۆگۆلاند لە خۆرئاوای کیشوەری ئەفریقا. ساڵی ١٨٨٥ دەستیگرت بەسەر تانگانیا و ناوەکەشی گۆڕا بۆ ئەفریقای خۆرهەڵاتی. ئەم داگیرکارییە بۆ ئەڵمانیا زۆر بە سانایی ئەنجام درا، چونکە پێشتر بازرگانە ئەڵمانەکان ڕێ و شوێنی تەواویان گرتبوویەبەر. هاوکات باشووری خۆرئاوای ئەفریقاش کەوتە دەست ئەڵمانەکان.

ماوەتەوە کە بڵێین، نەزمی داگیرکاری ئەڵمانەکان زۆر دڵڕەقانە و توندوتیژ بوو، بەجۆرێک لە ئەنجامی ئەو سیاسەتە توندوتیژەی کە لە داگیرگەکانیاندا پەیڕەویان کرد زیاد لە ٥٠ هەزار ژن و منداڵ و پیاوی ئەفریقی بوون بە قوربانی.


## سەرچاوەکان

**کتێب: ١ـ کوردی:**

ـ د.ک.میترۆپۆلیسکی و ئەوانی تر: زەمینەی گەشەکردنی کۆمەڵایەتی، و.ناسر حەقپەرست، چاپخانەی پیرەمیر، لەبڵاوکراوەکانی دەزگای جەمال عیرفان، ٢٠١٣.

ـ د.عەبدولعەزیز سلیمان نوار و د.عەبدولمەجید نەعنەعی: مێژووی هاوچەرخی ئەوروپا لە شۆڕشی فەڕەنسییەوە هەتا جەنگی دووەمی جیهانی، و.خالید هەرکی، چ١، هەولێر، ٢٠٠٩.

ـ ماجید خەلیل: ئیمپریالیزم و ئیمپریالیزمی نوێ لە کتێبی ئیمپریالیزم، چاپخانەی حەمدی، لە بڵاوکراوەکانی دەزگای ئایدیا، ٢٠١٩.

د.محەمەد فاضل قەفتان: ڕژێمە ئابوورییەکان کۆمەڵگای تەکنەلۆژیای نوێ، ب١، چاپخانەی ئۆفیسی سەرکەوتن، سلێمانی، ١٩٨٥.

**٢ـ عەرەبی:**

ـ جی. ئم. بلاوت: نموذج المستعمر للعالم الانتشار الجغرافي والتاريخ المركزية الاوروبية، ت. هبة الشايب، ط١، المركز القومی للترجمة، القاهرة، ٢٠١٠.

ـ د.جمال حمدان: الاستعمار والتحرير في العالم العربي، دارالقلم، القاهرة، ١٩٦٤.

**گۆڤار:**

ـ ئیسماعیل تەها: لێکۆڵینەوەیەک دەربارەی ڕۆژهەڵاتناسی، گ(ستاندەر)، ژ(١٥و١٦)، حوزەیرانی ٢٠٠٧.

ـ جەلال ئەنوەر: خۆرهەڵاتناسی، گۆڤاری نما، ٢٠٠٦.

ـ عیماد ئەحمەد: ڕۆژهەڵاتناسی لە نێوان مەعریفە و ئایدۆلۆجیادا، گۆڤاری برایەتی، ژ(٢٢)، ٢٠٠١.



کاروان عوسمان خەیات (ڕێبین)

# بەزمی سەماوەرەکەی بێخود و تورکییەکەی تاهیربەگی جاف

## لە دوو دەستنووسی نەجمەددین مەلادا

ئەم بابەتە لەبەر ڕۆشناییی دوو دەستنووسی نەجمەددین مەلادا نووسراوە و ئامادەکراوە، ئەم دوو دەستنووسە کۆپییان لە لای منە و لەبەر ڕۆشناییی ئەو کۆپییانە کار کراوە. ئەم دەستنووسانە شتگەلێکی نایاب و بڵاونەکراوەی باشی تێدایە، بەو هیوایەم لە جێگەی خۆیاندا هەموویان بڵاو بکەمەوە.

کاتێک خەریکی دیوانی تاهیربەگی جاف بووم، بڕوام وابوو کە تاهیر بەگ تورکییەکی ئەوتۆی نەزانیوە، یان ئەگەر زانیبێتیشی، شیعری زۆری پێ نەنووسیوە، بەڵام کاتێک ئەم دەستنووسانەم بە وردی پشکنی، بۆم دەرکەوت کە دەبێت بەو تێبینی و بۆچوونانەی خۆمدا بڕۆمەوە. هەر لە مینای شکەستەیشدا کاتێک گەیشتمە ئەو شیعرەی بێخود و باسی سەماوەرەکەی تاهیر بەگی دەکرد، نەدەکرا بەسەریدا بڕۆم و باسی لێوە نەکەم.

لێرەدا بابەتەکەم بۆ دوو بەش دابەش دەکەم. پێش ئەوەی بچەمە سەر بابەتەکان، لێرەدا پێم خۆشە بە کورتی هەردوو دەستنووسەکە بناسێنم.

دەستنووسی مینای شکەستە: ئەم دەستنووسە بریتییە لە کەشکۆڵێکی قەبارە گەورە و لەلایەن نەجمەددین مەلاوە نووسراوەتەوە. نووسەر بە بەرگی سێیەم لە قەڵەمی داوە. ئەندازەکەی (٣١×٢٠ سم)ە و لەسەر کاغەزی خەتدار نووسراوەتەوە. (٥٦٢) لاپەڕەیە و لە ساڵی (١٩٤٠م=١٣٥٩هـ) نووسیویەتییەوە. شیعری شاعیرانی وەکو نالی، مەحوی، سالم، بێخود، کوردی و... تێدایە.

> **ئەم بەیتە و قسەکانی سۆن و چەند بەیتە تورکییەکەی نێو داستانی قومارەکە، پێکەوە سەلمێنەرێکی ڕاستین و بۆمان دەسەلمێنێت کە تاهیر بەگ تورکی زانیوە، زێوەریش نزیک بووە لە تاهیربەگی جاف و دیداری لەگەڵیدا هەبووە و هاتوچۆیانی کردووە.**

دەستنووسی دیوانی زێوەر: ئەم دەستنووسەیش بە خەتی نەجمەددین مەلایە و لە کتێبخانەی گشتیی بەرلین پارێزراوە، ژمارەی ئەم دەستنووسە (Or .hs ١٠٨٧١)ە، ئەم دەستنووسە لە دەفتەرێکی خەتداردا نووسراوەتەوە و ئەندازەکەی لە نێوان (١٦×٢١سم)ە دایە و بەشێکی باشی دیوانی زێوەری شاعیرە و شیعری بڵاونەکراوەی زێوەری زۆری تێدایە، ئەو شیعرە بڵاونەکراوانەشم ئامادەی چاپ کردووە. ئەم دەستنووسە لە ڕێکەوتی ١٧ی ئازاری ١٩٤٢ بەرامبەر بە ٢٨ی سەفەری ١٣٦١ی کۆچی، لە شاری سلێمانیدا نووسراوەتەوە.

## بەزمی سەماوەرەکەی تاهیر بەگ و بێخود

لەم ڕۆژانەدا خەریکی دیوانی بێخودی شاعیر بووم و لەگەڵ دەستنووسێکی نەجمەددین مەلادا بەراوردم دەکرد، لە پڕ چاوم بە پەرەگرافێکی نەجمەددین مەلا کەوت لەسەر ئەم شیعرەی بێخودی شاعیر نووسیبووی، بە باشم زانی شتێکی بچووکی لەسەر بنووسم و بڵاوی بکەمەوە.

**ئەی پیاڵەگێڕی مەجلیسی تۆ تووسی نەوزەری!**
**کەیخوسرەوی زەمانی و جەمشیدی کیشوەری**
**تەندووری دڵ بە ئاگری غەم جۆشی سەندووە**
**بەزمم دەمێکە ساردە لەبەر بێسەماوەری**

ئەم شیعرەی بێخود کە لە دیوانەکەیدا هاتووە، بە پەراوێزێک نووسراوە کە: دیارە بێخود بەم چوارینەیە داوای سەماوەری لە برادەرێکی کردووە». (دیوانی بێخود، ١٣٨٦: ١٥٩–١٦٠) ئیتر هیچ شتێکی ئەوتۆی لەسەر نەنووسراوە کە هۆی دانانەکەی چی بووە، ئەو کەسە کێ بووە؟! بەڵام خۆشبەختانە لەم دەستنووسەی نەجمەددین مەلادا ئەوە هاتووە، بۆ من «جەژنێکە و دوو قوربان»، هەم بۆ دیوانی بێخود ئەوە ساغکرایەوە کە ئەو کەسە کێ بووە و هەمیش بۆ دیوانی تاهیربەگی جاف ئەو بابەتەمان بۆ زیاد دەکات کە باری کۆمەڵایەتی و سەخاوەتی تاهیر بەگ لە چیی ئاستێکدا بووە.

ڕوونە و دیارە دیوەخانی جافەکان هەمیشە بە ڕووی میوان و لێقەوماواندا واڵا بووە و خزمەتی میوانی لە خۆشی و ناخۆشیدا تێدا کراوە، دیوەخانی شاعیران و مەلایان و پیاوچاکان و قسەخۆشانیش بووە، شەوچەرەی تێدا بووە... ئەمجا دیوەخانی تاهیر بەگ و نەوەی عوسمان پاشای جاف و کوڕی عادیلەخانم و پاشا و موڵکداری هەڵەبجە... بێت. نەجمەددین مەلا لە سەرەتای شیعرەکەوە دەنووسێت: «جارێک جەنابی مەلا مەحموود «بێخود» لە مەجلیسی تاهیر بەگی کوڕی عوسمان پاشای جاف دادەنیشێ، چاوی بە سەماوەرێک ئەکەوێ کە بۆ چایی خواردن دێتە مەجلسەوە، گورج ئەم ڕوباعییەی ئاتی ئەفەرموێ، تاهیر بەگیش لەپاشا سەماوەرەکە بۆ بێخود ئەنێرێ». (مینای شکەستە، ١٩٤٠، ب٣: ٤٣٠)

### ئەم نووسینە چەند پەیامێکی جوانمان پێ ڕادەگەیەنێت:

١. دەست و دڵسافی و وریایی و تێگەیشتنی تاهیربەگی جاف لەوەی کە بێخود بە چوارینەیەک داواکارییەک پێشکەش دەکات، تاهیر بەگیش بەو شێوەیە وەڵامەکەی دەداتەوە؛
٢. تاهیر بەگ هەر لەوێدا دیارییەکەی پێشکەش ناکات و ڕووگیری بکات، یان تووشی بارێکی ناجۆری بکات، بەڵکو دواتر سەماوەرەکەی بۆ دەنێرێت؛
٣. لە شیعرەکەدا بێخود دەڵێت: تۆ وەکو پاڵەوان تووسی نەوزەریی ئێرانیت...؛
٤. لەم زەمانەدا تۆ وەکو کەیخوسرەویت، وەکو جەمشیدی جەمیش وەهایت و دونیا دەبینیت؛

٥. ماوەیەکی زۆریشە من چاوەڕوانی شتێکی وەهام و ئەوەتا لە لای تۆ ئەو سەماوەرە هەیە و تۆ دڵ و دەروون پاک و سەخاوەتداری....

لە ڕاستیدا ئەم دیوەخانەی عوسمان پاشا و تاهیر بەگ هەمیشە گەرموگوڕ بووە و تەنانەت فارس و ئینگلیزەکانیش باسی ئەوەیان کردووە، بۆیە شتگەلێکی وەها بۆ تاهیر بەگ، شتێکی سادە و ساکار بووە، بۆیە ئەو سەخاوەتییەش هەر لە خۆی جوان بووە. ئەوەتا زێوەری شاعیریش لەبارەی ئەم بنەماڵەیەوە دەڵێت: «پاش نیوەڕۆ سواربووین چووینە هەڵەبجە، لە ماڵی مەجید بەگی کوڕی عوسمان پاشا میوان بووین. ئاساری میواننەوازی لەوێشدا ئاشکرا بوو. شێخ بە ڕەسمی فاتیحەخوانی لەگەڵ مەلا ئەحمەدی شینکی کە مودەڕڕیسی مزگەوتی گەورەی سولەیمانی بوو وە شێخ لە خدمەت خۆیا هێنابووی، چوونە خدمەت عوسمان پاشا.

دوو سێ شەو لە هەڵەبجەماینەوە. لە تەرەف تاهیر بەگی کوڕی عوسمان پاشا دەعوەتێکمان بۆ کرا چەشنی دەعوەتەکەی عەلی بەگ. بەڕاستی دیواخان و نان و خوانی عوسمان پاشا خوانی یەغما بوو، نەک بە خوسووسی، بە دائیمی وابووە. غەیری سەخاوەتی ئیحسان و ئینعامیشی بێمیسل بوو. بۆ تەعمیری مزگەوتی گەورە لە سولەیمانی کە لە زەمانی بابانەکانەوە کرابوو و ڕووی لە خراپی بوو، بەجارێ پێنجسەد لیرەی عوسمانیی بۆ نارد کە سەرفی تەعمیراتی بکەن، وە بۆ عولەمای هەڵەبجە و ئەترافی ئیحسانی دەوامی ئەکرد و تەبیعەتی ئەوەندە بەرز بوو کە بهاتایە سولەیمانی میوانی کەس نەدەبوو، خانووی خوسووسی ئەگرت. هەروەک هەڵەبجە، ئەهلی سولەیمانی و مەئمووران ئەچوونە دیواخانەکەی. بۆ سەخاوەتی عوسمان پاشا هەرچەند بنووسرێ ڕاستە. خوا لە قیامەتیشدا ساحێب نیعمەتی کا.

لە پاش چەند ڕۆژێ کە لە هەڵەبجە ماینەوە، دوعاخوازیمان کرد، هاتینەوە ماڵی مەحموود پاشا...». (گەنجینەی مەردان: ١٩٨٥، ٦٨-٦٩).

ئەم پیاهەڵدان و شان و شکۆیە لە خۆڕا نەبووە و نەکراوە، بۆیە ئەوانیش بەوشێوەیە باسیان لێوە کردووە، لەمەوە بۆمان ڕوون دەبێتەوە کە دیوەخانی عوسمان پاشا بەگشتی و بەتایبەتی تاهیر بەگ، دیوەخانێکی هەمیشە گەرموگوڕ بووە، دیوەخانی شاعیران و زانایان بووە. عەلی ئەکبەر خانی سەنجاویش لە یادداشتەکانیدا زۆر لەسەر ئەم بابەتەی تاهیر بەگ دواوە و بە جوانی باسی سەخاوەتی و میواندارێتی تاهیر بەگ و بنەماڵەکەیان دەکات.

### تاهیر بەگ و زمانی تورکی

واباوە و دەبێژرێت کە تاهیر بەگ زمانی تورکی و فارسی باش زانیوە، ئەوەی لە پاشی بەجێماوە، دیوانێکی فارسیی باشە و لە بەردەستدایە، بەڵام دیوانە تورکییەکەی ونبووە. هەر ئەو ونبوونەیش وایکردووە کە هەندێک بڵێن نەخێر تورکی نەزانیوە، چونکە

هیچ بەڵگەیەک لە بەردەستدا نییە بیسەلمێنێت کە تورکیی باش زانیبێت، ئەمەیش لە ڕوانگەی شیعرەکانییەوە، بەڵام لەڕووی ئەوەی کە مێجەرسۆن دەیگێڕێتەوە شتێکی ترە.

هەر لەم ڕوانگەیەوە سۆن دەڵێت: «دەگەڕامەوە بۆ ژوورەکەی خۆم، کاتێ خزمەتکارێک پێی وتم کە من دەبێ بڕۆم بۆ لای تاهیر بەگی دووەم کوڕی عوسمان پاشا لە ژنی یەکەم، کە لە کۆتاییەکەی تردا لە ماڵە گەورەکەدا دەژیا لەو شوێنەی ژوورەکەی منی لێ بوو. ئەم گەورەیە، کە هەندێ زەویوزاری لە هەڵەبجەدا هەیە، ناو و ناوبانگێکی بەدەستهێناوە بۆ توانای ئەدەبی و لەگەڵ زمانی کوردیشدا فارسی و تورکیش دەدوێت، لەوەوبەریش بڕێکی زۆر شیعری باشی دەنووسی. هەروەها زانیارییەکی کەمی لە فەرەنسیدا هەیە... تاهیر بەگ دانیشتووە و ڕادەمێنێت...

لە گەیشتنی من ئاگادار کراوە و وەڵامی سڵاوەکەمی بە فارسییەکی تەواو دایەوە، بێئەوەی کاریگەری شێوەی کوردی پێوەبێت، بانگی کردم بۆ دانیشتن لە تەنیشت خۆیەوە. هەندێ پرسیاری لێکردم، لە کوێوە هاتووم و بۆ کوێ ئەچم و ئایا بە فەرەنسی قسە دەکەیت، وەڵامی هەموو وەڵامە ئەرێنییەکانی منی دایەوە لەگەڵ..

«Et moi aussi, je sais un peu» واتە: «منیش کەمێک دەزانم» ئەوە سەرسووڕهێنەرە لە سەرۆکێکی کوردەوە کە لە ژیانیدا بەرزاییەکانی وڵاتی خۆی جێنەهێشتووە. وەک ئەوەی کە ئەگەر ئەو ڕەنجە زیاد لە پێویست بێت بۆ ئەو، بێدەنگ بووەوە و ئیدی لە دەرەوە دانیشتین، بێدەنگییەکە قاوەگێڕ دەیکردەوە و دەیوت قاوەی تورکی، کە خزمەتکارەکان دەیانهێنا. چاکەیەکی تریشی لەگەڵ کردم بەوەی کە لە سندووقە تایبەتییەکەی خۆی جگەرەیەکی پێشکەش کردم و خۆشی بۆی داگیرساندم.

لە هەمانکاتدا، بەرپرسێکی تورک گەیشت کە لە خانەقینەوە هاتبوو بچێت بۆ سلێمانی، هاتە ژوورەوە و کەسێکی زۆربڵێ بوو، سووربوو لەسەر دەمەتەقێکردن، کە بە چەند وشەیەکی کورتی تورکی لەلایەن تاهیر بەگەوە سنووردار کرا. دیدارەکەی کورتکردەوە بەوەی هەستا و چووە ژوورە تایبەتییەکەی خۆیەوە و ئێمەیش بڵاوەمان لێکرد». (مێجەر سۆن: ٢٠١٨، ٢٣٣ و ٢٣٤ و ٢٤٥ و ٢٤٩)

لەناو داستانی قومارەکەی تاهیر بەگدا چەند بەیتەشیعرێک هەیە کە بە تورکی نووسراوە، ئەو چەند بەیتەیش ئەمەیە:

**چـون کە بدی ترک بە ترکی زبان**
**گفت: چنین با غم و آه و فغان**
**وای دید[ی] بر شـی مز قالمدی**
**باد هـوا پارە ولسـن آلمدی**
**بی ینر گلدم نــە حضــر ایلـدم**
**سـهـو ایدی نی بلکـە فنا ایلدم**

لیره لــرم جمله ســی جالدی لر
باقی قــلانی بــوارده آلدی لر
کش فی شـــو دفعه اگــر آصمیم
توبه دها کاغد آل آصمـــیم
اولــدر آخر بنی قهــر قهار
مصلحتم بونده که ایستهم فرار
باقی نـــه بلاگلدی نیه نــاگهان
ثروتمـه برلی گیتـــر دی زیان
کیســـمه بنم حالمی بیلمز تمام
طوتدی نبی فعـــل شنیع حرام
(خانقین)ـه عودت ایدر سـرم اگر
تو بر دها ایتمیم عزم ســفر
شو سفر[م] ده بلرم گر نــجات
کردلره اصلا ایلا مـــم التفات
از همه خوشتر بشنو این سخن
آنچه که من دیدم از آن انجمن

ئایا بەم چەند بەیتە دەتوانرێت ئەوە لە بەرچاو بگیرێت کە تاهیر بەگی جاف تورکی زانیوە؟! لەڕاستیدا نامانگەیەنێتە ئەو ئەنجامەی کە تاهیر بەگ تورکی زانیوە، چونکە لەناو شیعرەکەدا ئاماژەیەکی زۆر ڕوونی وەها نابینرێت کە بیسەلمێنێت کە شیعرەکە هی تاهیر بەگە و تورکی زانیبێت، بەڵام ئەو وتانەی مێجەرسۆن و ئەم چەند بەیتە و ئاماژەیەکی بچووکی ناو داستانەکە، ئەوەمان پێ دەڵێت کە تورکی زانیوە. ئەو چەند وشەیەی نێو شیعری قومارەکەیش ئەگەر جوان لێی بڕوانین و لێی وردببینەوە، ئەوا بۆمان ڕوون دەبێتەوە کە تورکی زانیوە.

(خانقین)ـه عودت ایدر سرم اگر
تو بر دهــا ایتمیم عزم سفر

مێجەرسۆنیش لە چەند جێگەیەکی کتێبەکەیدا دەڵێت: لەهەمانکاتدا، بەرپرسێکی تورک گەیشت کە لە خانەقینەوە هاتبوو بچێت بۆ سلێمانی، هاتە ژوورەوە و کەسێکی زۆربڵێ بوو، سووربوو لەسەر دەمەتەقێکردن، کە بە چەند وشەیەکی کورتی تورکی لەلایەن تاهیر بەگەوە سنوودار کرا...

بە وشەی سنووردار کرا. ئەمەش ئەوەمان پێ دەڵێت کە تاهیر بەگ شارەزایی لەو

زمانەدا هەبووە، چونکە شارەزابوون لە زماندا بۆ ئیدارییەک یان کەسێکی لێزان و وردەکار... کۆمەڵێک دەستەواژەی زمان هەیە کە خوێنەر یان مرۆ لە ئاستی وەڵامدانەوەدا ڕادەگرێت... ئەم وشەی سنووردارکردنەش کە مێجەرسۆن باسی دەکات، ئەوەمان پێ دەڵێت کە تاهیر بەگ شارەزایی لە زمانی تورکیدا هەبووە و بە باشی زانیویەتی، چونکە لە شیعرێکی تریدا و لە دەستنووسێکی نەجمەددین مەلادا کە دیوانی زێوەری شاعیرە، ئەوەمان زیاتر بۆ دەسەلمێنێت، ئەویش ئەوەیە کە زێوەر شیعرێکی تورکی لەسەر بەیتێکی تاهیر بەگ داناوە، شیعرەکەش تەقریزە، ئەم شیعرەش سەلمێنەرێکی ترە بۆ ئەوەی تاهیر بەگ زمانی تورکی زانیوە و شیعری بە تورکیش هەبووە و فەوتاوە. لەوانەشە بگوترێت ئەو چەند بەیتەی نێو داستانی قومارەکە بەڵگەی سەلمێنەر نییە و ئەم بەیتە سەلمێنەرە، لەڕاستیدا پرسیارەکە لە جێگەی خۆی دایە. بۆیە ئەبێت ئەم بەیتە و قسەکانی سۆن و چەند بەیتە تورکییەکەی نێو داستانی قومارەکە، پێکەوە سەلمێنەرێکی ڕاستین و بۆمان دەسەلمێنێت کە تاهیر بەگ تورکی زانیوە، زێوەریش نزیک بووە لە تاهیربەگی جاف و دیداری لەگەڵیدا هەبووە و هاتوچۆیانی کردووە، کاتێک لەو بنەماڵەیەوە نزیک بووبێت و ئاگاداریان بووبێت، ناکرێت قسەکانی بەهەند وەرنەگیرێت.

به باشی دەزانم شیعرەکەی هەردووکیان وەکو چۆن لە دەستنووسەکەدا هاتووە، لێرەدا هەردوو شیعرەکە بڵاو بکەمەوە.

تاهیر بەگی جاف فەرموویەتی

**صليب آسا ينه قوردى خم زلف پريشانى**
**قاليرسه بويه اول كافر بوزار دين مسلمانى**

تەقریز زێوەر ئەفەندی

**كلامى دلپذيرك ايتدى ممنون جان حسانى**
**كمال بـا ضــيانك ايلدى دنيايى نورانى**
**تصاعد ايتسه بويـله فكر رنگينك ممالكده**
**دگل ملك سليمانى ايــدر تسخير يونانى**
**در اتيله فطانتله بتون ايرانى ضبط ايتدن**
**شرفلندى وجود شحله سراسر ملك عثمانى**
**حسودن قولنى در خاطر ايتمه هپ هبادر بو**
**«وما أدريك ما الفيل» ايلمز تنظير قرآنى**
**عروس فكرك استغنا ايدر زيوردن اى طاهر!**
**گوررسه اهل انصاف ايليور هردم ثناخوانى**

## سەرچاوەکان


- بیرەوەرییەکانی عەلی ئەکبەرخانی سەنجاوی سەردار موقتەدر: دوکتۆر کەریمی سەنجاوی، و- دوکتۆر حەسەن جاف، بڵاوکراوەی ئەکادیمیای کوردی، چاپخانەی حاجی هاشم، چ١، هەولێر، ٢٠١١.
- دەستنووسی دیوانی زێوەر، بە خەتی نەجمەددین مەلا، کتێبخانەی گشتیی بەرلین، ژمارە hs. Or. ١٠٨٧١، ١٩٤٢.
- دیوان طاهربگ جاف: کامل صفریان، زهرا سجادی، چاپ اول، انتشارات آراس، ١٣٩٣هەتاوی.
- دیوانی تاهیربەگی جاف: نەجمەدین براخاسی (هەوار)، چ١، بڵاوکراوەی چاپەمەنی مانگ، بانە، ٢٠٢٠.
- دیوانی تاهیربەگی جاف: حەسەن گۆران، چ٢، دەزگای ڕۆشنبیری گۆران، سنە، ٢٧١١کوردی.
- دیوانی تاهیربەگی جاف: حەسەن گۆران، چ١، بڵاوگەی گۆران، چاپ گلبان چاپ، سنە، ٢٧٠٢کورد.
- دیوانی تاهیربەگی جاف: لەسەر نەفەقەی موحەممەد ئەمین عەسری چاپکراوە، خاوەنی کتێبخانەی مەعارف لە کەرکووک، چاپخانەی تەرەقی، کەرکووک، ١٩٥٧.
- کەشکۆڵی مینای شکەستە: نەجمەددین مەلا، حەمەبۆر پەراوێزی بۆ نووسیوە و لە بنکەی ژین وەرگیراوە، بەرگی سێیەم، ١٩٤٠.
- گەشتێک بۆ میسۆپۆتامیا و کوردستان لە بەرگی نادیاردا: ئی بی سۆن «مەیجەر سۆن»، و. مینە، چ١، لە بڵاوکراوەکانی کتێبخانەی یادگار، ٢٠١٨- سلێمانی.
- گەنجینەی مەردان و یادداشتی ڕۆژانی دەربەدەری: ن- مەلا عەبدوڵڵای زێوەر، موحەممەدی مەلا کەریم، چ١، چاپخانەی شرکە مطبعە الادیب البغدادیة، بەغدا، ١٩٨٥.



نووسینی: بەتین جەمال

# ئایا خودا بوونی نییە؟

## هەتا کەی سۆفستائییەتی ناخوداباوەڕەکان بەردەوام دەبێت!

وەڵامێك بۆ بابەتی «بۆچی خودا بوونی نییە؟،

نووسینی: ارمین نوابی،

وەرگێڕانی: فاکت»

لە ژمارە ٣ – ٤ـی گۆڤاری فاکت

هەر لە دەمی گفتوگۆکردن لەگەڵ ناخوداباوەڕدا؛ پرسیاری «بوونی زاتی خودا» خۆی دەبێت بە ڕۆشنایی بابەتەکە، چونکە ئەمە جیاوازییەکی مەزن و ئاشکرایە لە نێوان باوەڕداران لەگەڵ ناخوداباوەڕەکاندا. جا وەها نەبێت ئەم باسە باسێکی نوێ بێت: بەڵکو هەر لە دێرین سەردەمەوە بڕواداران بەڵگەکانی خۆیان لەهەمبەر بوونی خودایەکی زانا و دانا و بەدەسەڵات خستووەتە ڕوو، کەلامی و فەیلەسووفەکانی گێتی ئیسلامیش بەدەر نەبوون لەم هەوڵە. هەوڵیانداوە بەڵگەی ئاوەزی بۆ تاک بە تاکی بیروباوەڕی ئیسلامی بهێننەوە. سەلماندنی بوونی خودایەکیش لە ئاستێکی بەرزدا بووە، چونکە وەک بەشێک لە کەلامییەکان گوتوویانە: «یەکەم شت کە لەسەر بەندە پێویستە ناسینی خودایە.» دیارە ناسینی خوداش لە ڕێگەی بەڵگەوەیە، چونکە هەر ناسینێک لەسەر بنەمای بەڵگە نەبێت هێشتا دەروونمان خاڵی نابێت لە گومان کردن لێی. جا کە ئەو زانا و فەیلەسووفانە دەبینیت گفتوگۆیەکی هێندە مەزن و وردیان هەبووە لە بابەتە لاهووتییەکاندا، دووچاری سەرسووڕمانێکی ئێجگار مەزن دەبیت؛ کە هێشتا کەسانێک هەبن بانگەشەی نەبوونی بەڵگە بۆ بوونی خودا دەکەن!

ڕەنگە کەسانێک بڵێن کوا لە سەردەمە دێرینەکاندا کەسانێک هەبوون بوونی خودایەک ڕەتبکەنەوە؟ بەڵام ئەوەی لە لامان ڕوونە شتێکیش نەبووە بەبێ لایەنگر بێت. هەروەکو پێشەوا غەزالی باسیان دەکات لە پەرتووکی (ڕزگارکەر لە گومڕایی) بە «دەهرییەکان» ناویان دەبات. ئەوەمانزانی کە هەر لەو سەردەمەوە بوونی خودا مشتومڕی گەرمی لەسەر بووە و هەر قوتابخانەیەکی کەلامی بەڵگەی تایبەت بەخۆی هەبووە بۆ سەلماندنی، لە ئەشعەریی و ماتۆریدییەکانەوە هەتاوەکوو شیعەکانیش بەڵگەیان بۆ بوونی خودا هێناوەتەوە لە گێتی ئیسلامیدا. بێگومان لاهووتی مەسیحی و یەهوودیش بەدەر نیین لەم بەڵگەکارییە بۆ سەلماندنی بوونی خودا.

دوور لەم پێشەکییە ڕەنگە کەسانێک بپرسن؛ بۆچی ئەم بابەتە لە ئێستادا باس دەکرێت؟ بەکورتییەکەی ئەم نووسینە وەڵامی گۆڤارێکی هزری کوردییە؛ سەرەبابەتەکەیان نووسیبوو بەناونیشانی «بۆچی خودا بوونی نییە؟»، وەها جوان نووسینەکەیان ڕازاندبوویەوە، ئارەزووم پەی برد بۆئەوەی ئەم گۆڤارە؛ ئاخۆ وەڵامی کام لەو فەیلەسووف و کەلامییانەی دابێتەوە، کە لە پەرتوکەکانی پەیوەست بە بوونی خودادا بەڵگەکانی خۆیان خستووەتە ڕوو!

سەیر لەوەدا بوو وەک گشت جارێکی دیکە ئەوانەی بانگەشەی نەبوونی خودا دەکەن، خۆیان بە وەڵامدانەوەی پرسیاری کەسانی ئاساییەوە خەریک دەکەن. لەکاتێکدا باش دەزانن کەسانی ئاسایی کە هیچ زانستێکیان پێ نەگەشتووە و لەسەر ئاستێکی کولتووری باوەڕیان بە خودا هێناوە، کەچی لەلایەکی دیکەیە بەڵگەی سەدان زانا و فەیلەسووف و کەلامی بڕواداریان فەرامۆش کردووە، وەکوو ئەوەی هەر نەبن. لە

دواجاریشدا دەیانهەوێت بەم ڕێگەیە بگەنە ڕاستی. سەرەڕای ئەمەش؛ نووسیویانە: «وەڵامی ئەو بەڵگانەی ئایینداران دەیخەنە ڕوو.» دەی ئەگەر هەر زانایەکی باوەڕدار ئەو بەڵگانەی بەکارهێنابێت، کەسێکی بێئاگا بووە لە بەڵگەکانی پەیوەست بە بوونی خودا و دەبێت لە ڕیزی کەسانی ئاساییدا هەژمار بکرێت لە بابەتی (لاهووتدا). دەبێت ئەو ڕاستییەمان لەبەرچاو بێت، مەرج نییە گشت زانایەک لەکۆتاییدا شارەزایی بابەتە لاهووتییەکان بێت. لەکاتێکدا هەر لەم سەردەمەدا کەسانی وەهامان هەیە، بانگەشەی (ریچارد دۆکنز) دەکات بۆ دیبەیت، یەکێکە لە مەزنترین و بەناوبانگترینی ناخوداباوەڕی سەردەم، بەڵام ئەوەی جێگای تێڕامانە؛ کورسیەکە لەکاتی دیبەیت بە بەتاڵی دەمێنێتەوە تەنها فەیلەسووف و لاهووتی کریستیانەکان (ولیام لەین کرەیگ) ئامادە دەبێت.

هەروەکو گوترا وەڵامدانەوەی کەسانی ئاسایی دهۆ لەخۆکردن خۆچەقبەستووکردنە بەرامبەر بەڵگەکانی بوونی خودا! ئێمە چەندین بەڵگەی بەهێز وەکو باوەڕدار پێشکەش دەکەین بۆ بوونی خودا. وەکو نوێنەرێک لەو کۆمەڵە بەڵگانەی کە هەمانن. بەڵام بەوپەڕی سۆفستائییەتەوە وەڵاممان دەدرێتەوە و بە بڕیارێکی پێشوەختە پێمان دەڵێن: «ئێوە لەو باسەدا بەڵگەتان نییە، بۆیە هەڵە ژیربێژییەکە دەکەن کە بانگەشەی بوونی بەڵگە دەکەن.» وەها دیارە نووسەری بەڕێز هیچ کام لە پەرتوکەکانی «گەشتی ئەقڵ، خورافەی ئیلحاد، براهين وجود الله، مستعدون للمجاوبة» و دەیان و سەدان پەرتووکی دیکەی پەیوەست بە بوونی خودا پێی نەگەیشتووە. پاشان وەکوو سەرچاوەی زیادە ئاماژەیان پێ دەدەین!

هەندێک لە ناخوداباوەڕەکان دەڵێن بەڵگەکانی بڕواداران خولگە بەڵگەیە. ئەمەش لەوانەیە بەرامبەر ئەوە گوترابێت، هەندێکجار کۆمەڵێک ئایەت و دەقی پەرتووکی پیرۆز باس دەکرێت بۆ پشتگیری لە گریمانەی بوونی خودا. باس لە کۆمەڵێک ئاماژە دەکات، نموونەیەکی دیار لە سورەتی (الطور: ٣٥) خودای مەزن دەفەرموویت: {أم خلقوا من غير شيء أم هم الخالقون} واتە: ئا ئەوانە بەبێ هۆ دروست بوونە یاخود خۆیان ئافرێنەری خۆیانن. بۆیە ناخوداباوەڕان ڕاستەوخۆ لەمبارەیەوە دەڵێن باوەڕداران کەوتوونەتە هەڵەیەکی ژیربێژی «بەڵگەی خولگەییەوە»، گوتەیەکی ناو پەرتووکەکەیان وەک سەرچاوە بۆ سەلماندنی خوداکەیان دێننەوە و لەناو بازنەیەکی داخراودا دەخولێنەوە، بەڵگە بۆ بوونی خوداکەیان پەرتووکەکەیە و بەڵگە بۆ ئاسمانی بوونی پەرتوکەکەش خودایە. لەکاتێکدا ئەمە لە بازنەیەکدا خولانەوەیە بەبێ ئەوەی هیچیان ببنە سەلمێنەری ئەوی دیکەیان. بێئاگان لەوەی ئەم جۆرە بەڵگە هینانەوە؛ بە هیچ جۆرێک «خولگە بەڵگەیی» نییە. بەڵکو ئاماژەدانە بەوەی پەرتووکە پیرۆزەکە باسی بەڵگەیەکی ئاوەزی کردووە، کە دەتوانیت لە ڕاستییەکەی بکۆڵییەوە. بۆیە ناکرێت بەمە بگوترێت "سورە بەڵگەیە"، هەرگیز لە فەلسەفەی ئاییندا وەک بەڵگەیەکی یەکلایکەرەوە و سەلمێنەری بوونی خودا پشت بەم ئاماژانە نەبەستراوە. نموونەیەکی ڕوون؛ کاتێک لە دادگا کەسێک بەڵگە بۆ بێتاوانی

خۆی دەهێنێتەوە، دادوەر بە پارێزەرەکەی دەڵێت ئەوە خولگە بەڵگەداری دەکات؛ بۆیە بەڵگەکانی وەرناگرم؟ بێگومان نەخێر! وەعی ئێمە ئەوە ئیدراک دەکات، کەسەکە بەڵگەیەک باس دەکات لە دەرەوەی خۆیەتی، وەلێ ئەگەر کەسێکی ئاسایی  بڵێت لەبەرئەوەی قورئان دەڵێت خودا هەیە، بۆیە خودا هەیە. ئەوە سەیرە بۆ کەسێکی بیرمەند دابنیشێت پەرتووک و گوتار لە وەڵامی ئەم جۆرە بەڵگە سادانە بداتەوە.

ئەو پەرتووکانەی باسکران؛ هەریەکە و کەمترینی ٣٠٠ لاپەڕەیە، ئایە ئەو ناخوداباوەڕەی  هاوڕێمان پێی وەهایە گشتی دووبارەکردنەوەی دەقە پیرۆزەکانمانە؟ ئەگەر من لەجیاتی ئەو وەڵام بدەمەوە؛ دەڵێم:  بێگومان نەخێر. ئەگەر هەرکەسێکیش بڕوای وەهایە؛ بەڵێ دووبارە کردنەوەی دەقەکانە، دەبێت وەڵامی بەڵگەکان بداتەوە کە لەم گوتارە و لە پەرتووکەکانی دیکەی تایبەت بە سەلماندنی بوونی خودا نووسراون.

## ئایا پەرتووکی پیرۆز و قورئان هەڵەیان تێدایە؟

هەرچەندە وەک موسڵمانێک ئەوە دەنووسم، بەڵام لەسەرمە ڕاستییەکان وەک خۆی بگەیەنم بە خوێنەری خۆشەویست، هەتاوەکوو بزانێت مەنزومەی ئایینی ئەوەنە شتێکی سادە نییە؛ بەیەک گەڕان لە دوو دەقی ئاسایی و سادە بەبێ ڕاڤە و قوڵبوونەوە لە گیانی دەقەکە و تێڕوانین لە سیاقی دەقەکە؛ ڕاستەوخۆ ڕەخنە بگریت لە بابەتە سەرەکییەکە، بابەتەکە بگۆڕیت، کە دوورە لە ناونیشانی گوتارەکە. دیارە ئەمەش هۆکارەکەی پێموایە تێڕوانینی نووسەرە و وەها تێگەیشتووە کە پێویستە بۆ ڕاستبوونی ئایین؛ خودا هەبێت؛ ئایین ڕاست نییە، کەواتە خودا بوونی نییە. بەڵام ئەمە هەر لە خۆیدا هەڵەیە، وەکوو ئەوەیە بڵێی:»پێویستە بۆ دەوڵەمەندبوون پارەت زۆر بێت، پارەت زۆر نییە؛ کەواتە هەژاریت.»

ئەو قەفەزە باوەڕدارییە لە هیچەوە هاتووە کە پێیوایە خودا لە ئایین هاتووە، یان وەکوو نموونەکەی هێندرایەوە، پێیوایە یان هەژار هەیە یان دەوڵەمەند. لەکاتێکدا ئەمە شێواندنی تێگەیشتنی خوێنەرە بەوەی وەها وێنای بکەیت؛ ئەم بابەتە لە دوو گریمانە زیاتر هەڵناگرێت، نووسەر بە زانین بێت یان بە نەزانین خۆی دووچاری هەڵەیەکی ژیربێژی کردووە، دەتوانین بە هەڵەی (دوو ڕێگەخوازی) ناوی ببەین، چونکە ئێمە دەکرێت بژاردەی سێیەمان هەبێت کە سەلماندنی زاتێکی دانای زانای بەدەسەڵاتە، بەدەر لە هانابردن بۆ ئایین، تەنها لە ڕێگەی بەڵگە ئاوەزییەکانەوە و بەدوور لە فورمە ئایینییەکە.

سەرباری ئەمەش نووسەر؛ هەوڵیداوە ڕەخنەگرتن لە پەرتووکە ئاسمانییەکان وەک بنەمایەک بۆ نەبوونی خودا بەکاربهێنێت. سەرباری ئەوەش کۆمەڵە گومانێکی زۆر سادە باس دەکات لەسەر پەرتووکە ئاسمانییەکان کە هەرکەسێکی خاوەن هزر ببینێت؛ بە هیچ جۆرێک پێی کێشەیەکی وەها نییە هەتاوەکوو بکرێتە پێش گریمانەیەک بۆ بە ئەنجام گەیشتنی نەبوونی خودا.

بیر لەوە بکەوە نووسەر بڕوای وەهایە لە سەرەتای پەرتووکی پیرۆزدا هەڵەیەکی مەزن هەیە، بەڵام هێشتا باوەڕداری مەسیحی ڕوو لە زیادبوونە! تەنانەت زۆربەی زانا سروشتییەکان مەسیحین، ئایا بەڕاستی پێتوایە کەسیان سەرنجی ئەو هەڵە مەزنانەیان نەدابێت؟

بێگومان یەکێک لەو هەڵانەی کە باسکراوە ئەوە بووە؛ لە سفری پەیدابوون باسی ئەوە دەکات خودا بەهەشت و زەمینی یەکەم ڕۆژ ئافراندووە. بەڵام ئەوە هەڵەتێگەشتنە لە دەق. وشەی (havens) لە ئینگلیزیدا دوو واتای هەیە؛ یەکەم بەهەشتەکان، دووەمیان ئاسمانەکان. بۆیە ئەو هەوڵەی نووسەر کە دەیەوێت بڵێت بەپێی ئەو دەقە؛ زەوی پێش ئاسمانە، هیچ گەرەنتیەک نییە! چونکە دەقەکە هەردوو واتاکە هەڵدەگرێت. ئەگەر خوێنەر بۆ ئەو سیاقە بگەڕێتەوە کە دەقەکەی تیادا هاتووە؛ تێدەگات زیاتر مەبەست لێی ئاسمانەکانە. هەر ئایەتی پاش ئەوەش کە باس لەوە دەکات زەوی سەرەتا شێوەی نەبوو بۆ هەمان مەبەست کەمەندکێشمان دەکات.

> **ناخوداباوەڕەکان هیچ بەڵگەیەکیان پێ نییە دژی خودا، بۆئەوەی خۆیان لەم گێژاوی نەبوونی بەڵگەیە ڕزگار بکەن! دەڵێن سەلماندن لەسەر کەسێکە کە بانگەشەی بوونی شتێك دەکات.**

پاشان نووسەر دێتە سەر باسی قورئان؛ باس لەوە دەکات کە گوایە ئەوەی قورئان باسی زەوی تەخت دەکات و باس لەوە دەکات کە خۆر لە گۆمێکی قوڕدا ئاوا دەبێت! دووبارە ئێمەش دەڵێین هەر هەڵەتێگەشتن و سادە خوێندنەوەی دەقەکانە. ئەمەش کاتێک خودای مەزن دەفەرمووێت: «ئەی سەیر ناکەن چۆن زەوی ڕاخراوە»، واتای ئەوە نییە زەوی لەڕاستیشدا ڕاخراوە! بەڵکوو ڕاخستنەکە تەنها بۆ ئێمەیە. ئەگەر زەوی مەزنتر بێت لە ئێمە ئاساییە لە پارچەی تەخت پێکبێت. هەروەها سەیر دەکەین خودای مەزن لە شوێنێکی دیکە دەفەرمووێت: «ئەی سەیر ناکەن وشتر چۆن دروستکراوە؟» کەواتە ئەو کارەی خودا کردوویەتی لەگەڵ ئەوەی دەیبینین جودا کراوەتەوە، دەنا داوای ئەوە ناکات سەیری بکەین، چونکە ئەگەر خودا مەبەستی تەنها سەیرکردن بووایە؛ چی پێویستی دەکرد پێیان بفەرمووێت:»سەیری بکەن» لەکاتێکدا ڕۆژانە بینیویانە! بۆیە ڕوون دیارە مەبەستی ئایەتەکە ئاشکراکردنی شتێکی جودایە لەوەی دەبیندرێت و لەبەردەستدایە. بە هەمان شێوەش بۆ زەوییەکە ڕاستە! ئەوەی لەبەردەستمانە ئەوە نییە کە خودا کردوویەتی، بۆیە ئاساییە زەوی تەخت نەبێت وەکوو ئەوەی دەیبینین و بەشێک بێت لەو هەڵانەی

بەهۆی هەستەکانمانەوە دووچارمان دەبێتەوە. پاشان لە لام سەیرە کەسانێک ماون باسی چاڵە قوڕەکەی (سورەتی الكهف) دەکەن و کەچی هەر کەمێک ڕانامێن هەتاوەکوو بزانن ئایەتەکە لە سیاقەکەیدا چیمان پێ دەڵێت؟ لەکاتێکدا ئایەتەکە بە ڕوونی باس لە بینینی زولقەرنەین دەکات؛ پەیوەندی بە کەتوارەوە نییە!

بۆیە پێم وەها نییە ئەو بابەتانە هیچی بەڵگە بێت بۆ ناڕاستی ئایینێک؛ چ جای وەک بەڵگە بن بۆ نەبوونی خودایەک، ئاخۆ ئێوەی ناخوداباوەڕ کە گومانێکی گەلێک سادە دەکەنە سەر بەڵگەکانی بوونی خودا و بە ئێمەش دەڵێن بەڵگەکانتان بەتەواوی بێسوودن! ئەی بۆ ئەو مافە بە خۆتان نادەن؛ لەکاتێکدا گومانەکانتان هیچی هەڕەشە نین و هەڵەخویندنەوەی دەقن؟ هەروەها بیرمان نەچێت بەلاڕێدابردنی نووسەر بۆ خوێنەر لەژێر ناونیشانی «بۆچی خودا بوونی نییە؟» و هێرشکردنە سەر ئایین خودی خۆی هەڵەیەکی ژیربێژییە، بە هەڵەی «سوورەماسی» ناودەبرێت. لەم هەڵە ژیربێژییەدا؛ نووسەر یاخود قسەکەر دەیەوێت سەرنجت بۆ شتێک ڕابکێشێت کە پەیوەندی بە باسەکەتان نییە، ئەمەش گوتەکەی ناپەیوەندیدار دەکات و پێمان دەڵێت ئەو کەسە سۆفستائیانە بیر دەکاتەوە هەتاوەکوو خۆی دەرباز بکات.

### ئایە بەڵگە هەیە بۆ نەبوونی خودا؟

ئایا کەسێکی ناخوداباوەڕ بەڵگەی هەیە؟ ئایا بەڵگە هەیە کە ئەو گەردوونە ئافرێنەرێکی نییە؟ ئایا بەڵگە هەیە کە خودا بوونی نییە؟

لێرەدا دەبێت وریابین وشەی خودا بەواتای خودایەکی تایبەت نایەت؛ یاخود تەنها مەبەست لێی خودای ئایینەکان بێت، مەبەست لێی چەمکی خودای زاتە بە سێ سیفاتە سەرەکیەکە: «تەواو باش، تەواو زانا، تەواو دەسەڵاتدار.»

کەواتە پێویست ناکات بکەوینە ناو هەڵەی دیکەوە زانیمان مەبەستمان لە خودا چییە. ئایا ئێستا بەڵگە هەیە بوونێکی وەها ڕێی تێناچێت؟ بێگومان نەخێر. ئەی ئەوان بانگەشەی بێباوەڕیان لەسەر چی بنیاتناوە؟

بێگومان بێئایین ناتوانێت بانگەشە بۆ بەرنامەکەی بکات، هەتاوەکوو فەیلەسووفی مەزن (بیرتراند رسل) دەیگوت:»من لەگەڵ کەسێکی نەزاندا بێخودام، لەگەڵ کەسێکی ڕۆشنبیریش نازانمگەرا.» بەڵام سەیرم لەوە دێت نووسەری گوتارەکە بە بیرۆکەی نەبوونی بەڵگە بۆ نەبوونی خودا دەڵێت پوچگەرایی؛ لەکاتێکدا پوچگەراییە ئەگەر بە واتا بوونییەکەی بێت، هەر هەڵەیە:» بەواتا ماریفەناسییەکەشی بێت هەر بە هەمان شێوە.»

هەربۆیە لێرەدا کەوتووەتە هەڵەوە کە دەڵێت پوچگەراییە، بەڵکوو ئەو دەیەوێت بڵێت؛ ئەگەر وەها بێت؛ دەبێت باوەڕ بە گشت شتێک بکەین! چەند نموونەیەکیش دەهێنێتەوە کە هەندێکی ژیربێژی نییە، بۆ نموونە دڕندە سپاگێتییەکە بکاتە خودا، دڕندەیەکی سپاگێتی

ماددەیە، چۆن ماددە ئافرێنەری ماددەیە؟ خۆ ئەگەر دەڵێین ئافرێنەرییەتی؛ مەبەستمان ئەوەیە لە نەبوونەوە هێناویەتی. چۆن ماددە هەبووە؛ بەڵام ماددەی هێناوەتە بوون و پێشی دەڵێت خودا؟ بێگومان ئەوە دژیەکە!

خۆ ئەگەر بڵێن: «ماددە نییە ئەو سپاگێتیە»، کەواتە تۆ تەنها ناوی خودات گۆڕی بۆ سپاگێتی، ئەمە دەمارگیری نەبێت دەبێت چ ناوێکی لێ بندرێت؟

خۆ نموونەکانی دیکەی وەکوو شەیتانەکەی (کارل ساگان) و قۆرییەکەی (بیرتراند رەسل) تەواوی ژیربێژی نەبوونەکەیان بۆ خۆیان دەگەڕێتەوە. ئەمە تەنها ئەوە دەسەلمێنێت شتانێک هەن کە باوەڕیان پێ ناکەین و ئەگەریان هەیە بوونی هەبێت.

بەدڵنیاییەوە من باوەڕ بە قۆرییەکەی (ڕاسل) و شەیتانەکەی (کارل ساگان) ناکەم، خۆ ئەگەر بوونیان هەبێت؛ ئەوە شتانێکی ناوازەن. بەڵام چ بوونی لەوە دەکەم قۆرییەک هەبێت یاخود نەبێت؟ لە کاتێکدا بوونی زاتی خودا پەیوەندی بە چارەنووسمەوە هەیە. ئایا ئەوەی دەیکەم زاتێک ئاگادارە؟ ئایا چاکەکانم چی لێ دێت؟

گشت ئەمانە بە قۆرییەک ناچوێندرێت، بێگومان کەسمان نامانەوێت ئازار بچێژین، بۆیە ئەگەر لەودیوی گێتی؛ خودا لەبەردەمماندا فەرمووی: «ئەی بەڵگەت چی بوو من بوونم نەبوو؟» هەروەها دابنیشین بەبێ وەڵام و چاوەڕێ بکەین بەزەیی پێماندا بێتەوە؟

بە بۆچوونی من؛ ئەوەی ڕوونە ناخوداباوەڕەکان هیچ بەڵگەیەکیان پێ نییە دژی خودا، بۆئەوەی خۆیان لەم گێژاوی نەبوونی بەڵگەیە ڕزگار بکەن! دەڵێن سەلماندن لەسەر کەسێکە کە بانگەشەی بوونی شتێک دەکات، بەڵام نازانم زاتێک بەدرێژایی ئەو مێژووەی پێی ئاشناین لەگەڵمانە، بەشێکە لە کولتوور و ژیانمان و کاریگەرییەکی مەزنی لەسەرمان هەیە، باسکردن لە بوونی؛ بانگەشە و سەلماندنی دەوێت، یاخود بانگەشە کردن بۆ نەبوونی؟ بەڵام سەرباری ئەوەی بڕوامان وەهایە کە بێخودایی بەڵگەی نییە، بەڵام لەکۆتایی گوتارەکەدا ئالنگارییەکەیان وەردەگرین و هەوڵ دەدەین ئاماژە بە کۆمەڵێک بەڵگە بدەین. لە قازانجی کەسیشمان نییە، پاش ئەوەی کۆمەڵێک بەڵگەم زانی لەسەر بوونی خودا؛ دانی پێدا نەنێین!

لە نووسراوی ئەو هاوڕێیەدا خوێندمەوە کە وەهای دادەنێن ئەوان بانگەشەی نەبوونی خودا ناکەن. تەنها باوەڕیان وەها نییە خودا بوونی هەبێت. ئەمەش جۆرێکە لە وشەسازی، وەلێ واتاکەیان هەمان واتایە.

جۆرێکە لە هەڵاتن لە بەڵگە هێنانەوە، چونکە کە من دەڵێم: «بەڵگەت چییە؟» تۆ بڵێیت: «من بانگەشە ناکەم هەتاوەکوو بەڵگە بهێنم.» ئەو دەمە تۆ دوو شت بە من دەبێژیت: «یاخود ئەوەتا تۆ جیهانبینیت نییە؛ یان ئەوەتا تۆ نازانمگەرایت و نازانیت خودا بوونی هەیە یاخود نا!» کە شتێکیش نەزانی بڕیاری لێ نادەیت و گرنگیش بێت لامان کە بڕیاردان و زانین «دڵنیایی پێویست نییە»، هەروەکوو لە فەلسەفەی ماریفەناسیدا زاندراوە تەنها




خودی خۆت دڵنیاییت، خۆ ئەگەر وەها بێت بانگەشەی ١+١=٢ بانگەشەیەکی نادڵنیاییە و ناتوانیت فێری کەسی بکەیت.

زانایان چارەی ئەوەیان بەوە کردووە کە پێویستت بەدڵنیاییەکی سەد لە سەد نییە؛ تەنها زانینت بەسە کە ڕێژەکەی لە ٦٠ بۆ ٩٩یە، هەتاوەکوو بڕیار بدەیت، ئیدی خۆ تۆ گوتت من چ بەڵگەم لە بندەست نییە؛ کەوایە چۆن بوونی خودا ڕەتکرایەوە؟

پاشان بانگەشەی ”بەڵگەم نییە؛ بەڵام باوەڕم نییە» بانگەشەیەکی ناتەندروستە. هەر گریمانەیەک کە دەیکەیت، لەوانەیە کۆمەڵێک باوەڕدار بن؛ دەبێت بەڵگەیەکی بۆ ساز بدەیت، دەنا خۆ ئاوەز لە کار دەکەوێت لە گریمانەدانان، هەر خودی میتۆدی زانستی لەبەر تەندروستییەکەی ڕێگە بە هەندێک گریمانە نادات. لەوانەیە تۆ بچیتە تاقیگە، بتەوێت کەوتنەخوارەوەی تەنێک بپێویت؛ لەوبارەدا کۆمەڵێک گریمانە بەهۆی داتاکانی دەستتەوە فەرامۆش دەکەیت، لەوانە؛ فڕینی تۆپەکە لە جێی کەوتنەخوارەوەی.

بەمەش دەگەینە وێستگەی کۆتایی، کە بەڵێ بانگەشەکردن بۆ نەبوونی خودا بەڵگەی دەوێت، تەنانەت ئەویش لە باوەڕ دەرنەچووە؛ بەتایبەت پاش خستنەڕووی بەڵگەکانمان بۆ بوونی خودا، چونکە وەک ڕوونە نەبوونی زانیاری بە شتێک؛ واتای ئەوە نییە شتەکە بوونی نییە، بۆ نموونە کاتێک من نەزانم ئاژەڵی (ا) لە ئەمەزۆن هەیە و شێوەی لە فیل دەکات، واتای ڕەتکردنەوەی شتەکە ناکات لەو دارستانە، بە هەمان شێوە نەزانینی ئەوان لەهەمبەر زاتی خودا و ئاشنانەبوون بە بەڵگەکانی بوونی؛ ڕەتکردنەوەی خودا و بەڵگەکانی بوونی ناکات. بەڵام لە کۆتاییدا ئەوەی لە لامان ڕوونە؛ بێخوداکان ناتوانن بەڵگەیەکی دڵنیاکەرەوە بۆ بانگەشەکەیان بهێنن و هەر خودی بەڵگە لە دەرەوەی باوەڕەوە شتێکی قسەهەڵگرە. لەبەرئەوەی مێشکمان پەرەسەندوویەکی بێئامانجە بە بڕوای ئەوان، بۆیە کاتێک بەڵگە داوا دەکەین؛ وەکوو ئەوە وەهایە مێشهەنگێک داوای شیلەی گوڵ بکات بۆ باوەڕهێنان؛ بەوەی شیلەی گوڵ هەیە، یاخود چامپانزییەک داوای مۆز بکات بۆ باوەڕ. ئایا کاتێک ئێمەش بەرهەمی پەرەسەندنین؛ بەڵگەش وەکوو ئەو مۆز و شیلەیە بۆ ئێمەش؟ بێنرخە لەڕاستیدا. گشت ئەوە بۆ ئەوە خۆشبێت کە ئێمە ناتوانین لە سایەی ناخوداباوەڕییەوە بتوانین ڕاستییەک ببینین، پەرەسەندوویەکی بێئامانج، دەی خۆ سروشت گوێ نادات بەوەی کە من ڕاستی دەبینم یاخود نا؟ تەنها منم دەمەوێت بمێنمەوە، دەکرێت بە بیروباوەڕی هەڵە بمێنمەوە. بەڵگە یەکێکە لەو بیروباوەڕانە، بۆیە بەڵگە بێسوودە لە سایەی ناخوداباوەڕیدا، چونکە بەڵگە؛ کاری بەشێک نییە لە سروشتی پەیوەست بە مانەوەی من، لەکاتێکدا ئەمە گرنگترین خاڵی پەرەسەندنە.

خۆ گەر یەکێک بیەوێت بەڵگە بۆ بەڵگە بهێنێتەوە، بنەماکانی بەڵگە بەکاردەهێنێت، کە بنەماکانی بەڵگەی بەکارهێنا، هەتاوەکوو بەڵگە بسەلمێنێت، ئەمە «خولگە بەڵگەیە» و هەڵەیەکی ژێربێژییە. ئەگەر بیەوێت لە بەڵگە دەربچێت؛ ئەوا بە شتێکی دیکە بەڵگە

بسەلمێنێت؛ کەواتە ئەو بناغەی ڕووخاند کە زانین بەڵگەی دەوێت. بۆیە داروینیزم خۆش بێت؛ ئێمە ناتوانین بزانین. هەر بۆیە نەک ناخوداباوەڕی بەڵگەی ناوێت؛ بەڵکوو هەر بەڵگە سفر دەکاتەوە. بۆیە (سامی عامری) دەڵێت: «ئاژەڵ بوونی مرۆڤی هەڕەمەکییانەی پەرەسەندوو؛ ڕێگری دەکات لە بەئاوەزبوونی پرۆسەی بیر کردنەوە.»

لەمەشەوە دەگەین بەو ڕاستییەی کە تەنها بوونیادی ئایینەکان گرنگی بە بەڵگە دەدەن، خۆ لام سەیر نابێت ناخوداباوەڕی وەها پەیدا بێت؛ گاڵتە بە هزری بەڵگە بکات لە داهاتوودا، چونکە هەر خودا دەزانێت سبەی ئەوان لەسەر چ ڕێبازێک ڕێ دەکەن.

**کورت و پوخت: بەڵگەکانی بوونی خودا لە دیدگای باوەڕدارەکانەوە.**

چەندین بەڵگەی مۆدێرن هەن بۆ بوونی خودا؛ ئێمە هەوڵ دەدەین بەکورتی ئاماژە بە هەندێکیان بکەین:

**١. بەڵگەی ڕەوشتی «ئایا دەتوانیت بە ڕەوشت بیت بەبێ خودا؟»**

لەوەیە پێکەنینت بێت! هاوڕێ بێئایینە نەرمونیانەکەت بیر بکەوێتەوە و بڵێیت:»چۆن دەبێت؛ ئەوەتا ئەو باوەڕی بە خودا نییە و کەسێکی بەڕەوشتە، بەڵام بێئەوەی هەست بکەیت هەڵە تێگەیشتی، من نەمگوت بەبێ «باوەڕبوون» بە خودا دەتوانی بەڕەوشت بیت؟ گوتمان: «ئایا بەبێ خودا دەتوانیت بەڕەوشت بیت؟»

بەڵگەکەمان بەم شێوەیە دادەڕێژین:

أ. ئەگەر خودا بوونی نەبێت، پێوانەیەکمان بۆ بەها ڕەوشتییە بابەتییەکان نابێت.

ب. بەڵام پێوانە ڕەوشتی بابەتی هەیە.

کەواتە دەبێت خودایەک بوونی هەبێت.

ڕەنگە کەسێک بڵێت ڕەوشتی بابەتیانە چییە؟ بڕوام وەهایە کەسێک بە جوانی توانیبێتی ئەم بابەتە بناسێنێت (ویلیام ڕیتچی سورلی)ە، لە پەرتوکەکەیدا بەناوی (بەها ڕەوشتییەکان و بیرۆکەی خودا) کە دەڵێت:»ئەو دەمەی کە دڵنیادەبمەوە کە کارێک باشە یاخود خراپە، واتای ئەوە نییە من چێژ یاخود ئازار دەبینم لە مامەڵەکردن بە دەرئەنجامی دڵنیاییەکەمەوە، یاخود هەست بە سەرسووڕمان یان ڕقلێبوونەوە لەهەمبەری بکەم. ڕەنگە هەستەکە هەبێت، بەڵام ئەوەی لە لام ڕوونە؛ بڕیاردان لەسەر باشی و خراپی شتەکان هیچ پشت بە هەڵبژاردنی ئاوەزی ئێمە نابەستێت! بەڵکوو پەیوەستە بەو بەها بابەتییەوە کە لەوبوارەدا هەیە، ئەوە چی وابەستەبوونێک لەو بابەتی بوونە دەهێنێتە گۆڕێ؟ زۆر بە ڕاشکاوی لە سۆنگەی بابەتی بوونی بابەتەکەوە، بڕیاردان لەسەر شتەکە دەبێتە بابەتێکی سەربەخۆ. بۆیە ئەگەر من گوتم:»ئەو شتە چاکە»، واتای ئەوە نییە تەنها بۆ من چاکە، بەڵکوو ئەوە بۆ گشت کەسێک چاکە. خۆ ئەگەر گوتم: «ئەمە شتێکی چاکە»، لەولاوە کەسێک هات گوتی:»نەخێر چاک نییە»، بەبێ سێ و دوو دەبێت

یەکێک لەو دووانەمان هەڵە بین. هۆکارەکەی ئەوەیە ڕاستی بڕیارێکی ڕەوشتی پەیوەست نییە بەوکەسەوە کە قسەکە دەکات، بەڵکوو بابەتێکی دەرەوەی گوتەی خەڵکە و لەسەر ئەوەش ڕانەوەستاوە کە ئێمە دانی پێدا دەنێین یاخود نا.

ڕەنگە کەسێک بێت و بڵێت بابەتی ڕەوشت بابەتێکی ڕێژەییە؛ نەک بەوشێوەیەی باسی لێ دەکەن!

لە وەڵامدا پرسیارکەر ڕووبەڕووی پرسیارێکی جددی دەکەینەوە، بۆچی دەبێت تانە بدەین لە کەسانی بیروباوەڕ توندی وەک (نازییەکان) ئەگەر ڕەوشت شتێکی ڕێژەییە؟ دیدگای نازییەک ڕێگەی پێ دەدات کە کۆمەڵکوژی (یەهوودییەکان) بکات و دیدگای پیاوکوژێکیش ڕێگەی دەدات کەسانی بێتاوان بکوژێت لەپێناو دەستکەوتنی بڕێک پارە. کاتێک پێمانوایە ڕەوشت ڕێژەییە و کۆمەڵە بنەما و بەهایەکی جێگیر نییە، چۆن ڕاڤەی ئەمانە دەکەیت؟ چونکە ئەگەر ڕەوشت ڕێژەیی بێت بەپێی ویست و ئارەزوو و پاڵنەرە بیروباوەڕییەکان بگۆڕێت، چۆن کارێکی ڕەوشتی و ناڕەوشتی لە یەکدی جودا دەکەینەوە؟

ئێمە بە هەستە ناوەکییەکانمانەوە باش دەزانین بناغەیەکی ئەنتۆلۆژی هەیە بۆ ئەو ڕەوشتانەی کە ئێمە پەیڕەوی دەکەین، بۆیە ئەو بەهایە لە زاتی خودادا نەبێت؛ ئەی چی دیکەیە؟ لێرەدا جوداکاری لە نێوان ماریفەناسیی و ئەنتۆلۆجی ڕەوشت دەکەین، لەبەرئەوەی دەتوانرێت بزانرێت، هەر لەوێوە دەگەینە ئەنتۆلۆجییەکەی کە بوونی خودایە.

بۆیە ئەوەی ڕوونە؛ کەسانی ناخوداباوەڕی لە ڕاڤەی ئەنتۆلۆژی ڕەوشت تێناگەن. ئەو بە شوێن وەڵامی پرسیاری «بۆچی ڕەوشتیانە مامەڵە دەکەین؟» دەگەڕێت، لەکاتێکدا جەوهەری پرسەکە ئەوەیە:»بۆچی دەبێت ڕەوشتییانە مامەڵە بکەین؟» کرۆکی پرسەکە ئەوەیە دەبێت چۆن بین؛ نەک چۆنین. هەر ئەم ڕاستییەیە وەهای لە یەکێک لە ڕابەرانی ناخوداباوەڕی وەکوو (ج . ل . ماکی) کردووە کە بڵێت: «وەرگرتنی بابەتی بوونی ڕەوشتی، زەمینە خۆش دەکات بۆ ئەوەی کە وەها دابنێین لەلایەن خوداوە هاتووە.»

### ٢. بەڵگەی کەلامی گەردوونی:

زۆرجار کە لە شەوێکی زستاندا لە شانشینەکەی ماڵەوە دادەنیشتم و لە ئاسمانم دەڕوانی و هەستم بە سەرسام بوونێکی لە ڕادەبەدەر دەکرد لە بەردەم بووندا؛ نەک لەبەر جوانی و سیستەمەکەی! بەڵکوو لە مێشکمدا بیرم لەم پرسیارە دەکردەوە: «بۆچی شت هەیە لەبری ئەوەی نەبێت؟ بۆچی هەبوون هەیە؟»

هەر لەم پرسیارانە بوو کەلامییەکان و فەیلەسووفە ئاییندارەکانی بەرەو ئاراستەی داڕشتنی بەڵگەیەک بۆ بوونی خودا برد، بەڵگەکەش بەم شێوەیە:

أ. هەرشتێک دەستبکات بە دروستبوون؛ هۆکارێکی هەیە.

ب. گەردوون دەستیکردووە بە دروستبوون.

**کەواتە هۆکارێکی هەیە!**

گەردوون بوونێکی بێسەرەتایی نییە و لە خاڵێکەوە دەستی بە دروستکردن کردووە و سەردەمانێک نەبووە، کەواتە بوون «قابیلە بۆ نەبوون و بوون» کەواتە هۆکارەکەی لە دەرەوەی شوێن و کات کە بوونی پێویستە هۆکاری بوونی ئەم گەردوونەیە. هەر ئەم باسەیە وەهای لە فەیلەسووفی بەریتانی (کیث وارد) کردووە کە بڵێت: «گەردوون خۆی توانای ڕاڤەکردنی خۆی نییە، بەڵکوو پێویستی بە ڕاڤەی دەرەکییە.»

بەڵگە گەردوونییەکان پێمان دەڵێن کەمبوونی وزە لە گەردووندا ئاماژەیە بۆ بوونی سەرەتایەک، ئەمەش ئەوە ڕوون دەکاتەوە کە بەڵێ سەرەتایەک ئەگەری بوونی زۆرە. کەواتە ئەم بەڵگەیە سەرکەوتووە، چونکە بوونی هەرشتێکی ماددی؛ داخوازی هەبوونی هۆکارێکە بۆ هەبوون کە لە دەرەوەی خۆی بێت. چونکە گەردوون یاخود ماددە خۆی دەستپێکێکی هەیە و مومکین بوو ئەو دەستپێکەشی هەبێت و مومکین بوو نەیبێت. ئەوەشی ئاشکرایە گریمانەی نەبوونی زاڵترە بەسەر بووندا، چونکە وەک (سێر مارتن ڕیز) لە پەرتووکەکەیدا (تەنها شەش ژمارە) دەڵێت: «بچووکترین گورانکاری لەو بەها جێگیرانەی کە گەردوونیان لەسەر بنیاتنراوە، گەردوون بەم شێوەیەی ئێستا دەبووە شتێکی مەحاڵ». کەواتە پێویستی بە هۆکارێکی دەرەکی هەیە کە بێنێتە بوون ئەو هۆکارەش (خودا)یە؛ وەک باوکی فەلەکناسی نوێ (ئالان ساندێج) دەڵێت: «من وەهای دەبینم کە بەهیچ شێوەیەک ناکرێت سیستەمی گەردوون بەشێوەیەکی خۆکرد لە نارێکییەوە پەیدابووبێت. پێویستی بە ڕێخەرێک هەیە، ئەگەر خودا لای من ناڕوون بێت: بەڵام لەلام تاکە لێکدانەوەیە بۆ وەڵامی ئەو پرسیارەی بۆچی نەبوون کۆتای هات و بوون دەرکەوت؟»

**بەڵگەی بوون (ئەنتۆلۆژی):**

خودا زاتێکی تەواو و کامڵە، کە پێویستە بوونی تەواو باش؛ تەواو زانا؛ تەواو بە توانایە. ئەو زاتە هیچ دژیەکێک لە بوونیدا نییە، کەواتە ئەگەر بوونی ئەو خودایە بە گریمانەیی لە چەند گێتییەکی گریمانەیی هەبێت، کەواتە دەکرێت لە گشت گێتییە گریمانەییەکان هەبێت، کە لە گشت گێتییە گریمانەییەکان هەبوو، کەواتە خودا بوونی هەیە. لێرە تەنها ئەگەری بوونی خودا کار دەکات، کە وەها دەکات بڵێین ئایا ئەگەر شتێکی پێویست نەگۆڕ ئەگەری بوونی هەبێت لە گێتییەکی گریمانەیی واتای ئەوەیە لە گشت گێتییەکاندا بوونی هەیە؛ چونکە بوونەکە ناگۆڕێت، تەنها بارەکەی دەگۆڕێت لە گێتییەکەوە بۆ گێتییەک. گەر لە گشتیشی بوونی هەبێت، لەڕاستیشدا بوونی هەیە.

**بەڵگەی بەهاگەرایی:**

٢٨ بەها گەردوونییە نەگۆڕەکان کە هەن؛ بوونیان  یان پێویستن یان دەرفەتن، یان دیزایین کراون. هیچ کەس ناتوانێت بانگەشەی دەرفەت یان پێویست بوونیان بکات؛ کەواتە دیزایین کراون.

نموونەیەکیش بۆ ئەم بەهایە؛ دەکرێت نموونەکەی زانای فیزیایی بەناوبانگ (پۆل دیڤیز) بێت کە  تێبینی ئەوەی کردووە ڕێژەی ئەو هێزە موگناتیزییەی ئەلیکترۆنەکانی گەردیلە لە تەوقی ناوک دەپارێزێت، لەگەڵ هێزی کێشکردندا کە بەش و گەردیلە و تەنەکان بۆ لای یەکدی ڕادەکێشێت؛ ڕێژەیەکی هەستیارە، چونکە ئەگەر ئەم ڕێژەیە بەڕێژەی ١* ٤٠.١٠ زیاد بکات؛ ئەوا بەس ئەستێرە بچووکەکان بوونیان دەبوو، ئەگەر بە هەمان ڕێژەش کەم بکات؛ ئەوا تەنها ئەستێرە مەزنەکان بوونیان دەبوو. لەکاتێکدا بوونی هەردوو قەبارە لە ئەستێرە بۆ بوونی ژیان پێویستە.

ئەگەر دەشڵێن فرەگەردوونی هەیە؛ کەواتە دەرفەتە، فرەگەردوونی هەر بەو ٢٨ بەها جێگیرە یەکتۆز بگۆڕێت؛ گەردوون دروست نابێت. بەتایبەت بەهای کۆسمۆلۆجی، کەواتە دەرفەت لەم بابەتەدا بەدەرە، وەک (ڕۆبن کۆلێنز) لە کاریگەری جێگیری بەهاکانی ئەم نەگۆڕە گەردوونییانەی کوڵیوەتەوە و باسی لەوە کردووە؛ ئەگەری پەیدابوونی ژیان بەڕێکەوت بریتییە لە ١* ١٠ بەتوانی کەم ١٢٣ کە ئەم ژمارە ئەستەمە نووسین و وێناکردنی.

پاشان ئەگەر فرەگەردوونی هەبێت؛ چەن گەردوونی شێواو هەیە، ئەوەنەش دیزایینکراو هەیە لەبەرئەوەی ناکۆتا گەردوون هەیە، کەواتە هەر لە پرسیارەکە دەربازمان نەبوو، بەڵکوو بووە هۆی ئەوەی ناکۆتا کێشەت بۆ دروست بێت.

بەڵگەی دیزایین:

کاتێک ڕۆژێکی بەهار، لەگەڵ خێزانەکەتدا دەچیتە دەرەوە بۆئەوەی چاوت تێر بکەیت لە دیتنی دیمەنەکانی سروشت و چاو لە هەرکوێیەوە دەڕوانیت، ئاڵۆزیی و بەرپرسیارێتی ئەم گێتییە زیندەوەرزانییە هەست پێ دەکەیت. هەر ئەم هەستە ناوەکییە کە وەهای کردبێت ئەم بەڵگەیە ببێتە مەزنترین بەڵگەی هەبوونی خوایەک بە درێژای مێژوویی زانداروی مرۆڤایەتی.

تەنانەت ناخوداباوەڕیش گرنگییەکی ئێجگار بەم بەڵگەیە دەدەن بە گومان خستنەسەری یان ڕەخنە لێگرتنی. ئەمەش ڕوونکەرەوەی ئەوەیە، بەڵگەکە چەند پتەوە و هاوکۆکە لەگەڵ بەڵگە نەویستییە ئاوەزییەکانی مرۆڤدا، وەک (ڕاسل) دەڵێت:»ئەم بەڵگەیە لەسەر ئەوە دامەزراوە تێبگەین کە ناکرێت ئەم بوونە ماددییە؛ بگەڕێندرێتەوە بۆ دەستی دەسەڵاتی سروشتێکی کوێر.»

دەکرێت شێوازی بەڵگەکە بەم شێوەیە دابڕێژینەوە:

١. ئەو سیستەمە ڕێکوپێکەی هەیە، ناکرێت بەرهەمی هەڕەمەکییەت بێت.
٢. زیندەوەران و ئەو گێتییەی تیایدان، هەڵگری سیستەمێکی زۆر ورد و هەستیارە.
٣. گێتی زیندەوەران، هەڕەمەکی و شپرزە نییە.
کەواتە، گێتی زیندەوەران شوێنەواری سیستەم و نەزمە.
ئا ئەمەیە کە (سوکرات) بۆمان باس دەکات و دەڵێت:» هەرشتێک بۆ بەکارهێنان بشێت، ئەوە شوێنەواری زیرەکییە.»

بۆیە پاش ئەوەی بەڵگەی نەزم بەگشتی و لە گێتی زیندەوەرزانیدا؛ بەتایبەتی پاش هاتنی (داروین) پشگوێخرا، هەتاوەکوو کۆتاییەکانی سەدەی بیستەم و دەرکەوتنی بەرگریکاران لە «دیزایینی زیرەک» و پێناسەی فەرمیشیان بۆ دیزایینی زیرەک ئەوەیە: «هۆیەکی زیرەک باشترین ڕاڤەیە بۆ دەرکەوتنی ئەم گەردوونە، نەک کردارێکی بێئاراستە.»

ئا ئەمەیە بەبڕوای من لەگەڵ کرۆکی قورئانیشدا هاوتەریبە، وەک خودای زانا دەربارەی بەجوانی ئافراندنی گەردوون دەفەرمووێت: [الذي أحسن كل شيء خلقة(٧)] السجدة.

**فەرهەنگۆک:**

ئافراندن: بەدیهێنان
ئافرێنەر: بەدیهێنەر
ئایین: ئۆل، دین
ئاوەز: عقل
ئارەزوو: حەز
ئاڵنگار: تحدی
بوون: وجود
بیروباوەڕ: ئایدۆلۆژیا
بێئایین: بێدین، لادین
پێشەوا: امام
پەرتووک: کتێب
پەرتووکی پیرۆز: پەرتووکی پیرۆزی مەسیحییەکانە لە دوو بەش پێکدێت، بەشی یەکەمی پەیمانی دێرینە، ئەویش پێکهاتووە لە تەورات و نووسراوی پەیامبەرە پێشینەکان و پەرتووکەکانی دیکەی وێژەیی ئایینیی یەهودی کە بە عیبری پێیان دەگوترێت «تەورا، نەبییم، کەتوبییم.» بەشی دووهەمیشی پەیمانی نوێیە، ئەویش هەرچوار ئینجیلی «مەتتا و مەرقۆس و لۆقا و یوحەننا»ن لەگەڵ نامەکانی پۆڵس و پەترۆس و یاقوب و

یوحەننا و بینینەکەی یوحەننا. لەڕووی تایبەتمەندیشەوە پەیمانی دێرین سیفاتی تەشریعی و یاسایی تێدایە و پەیمانی نوێش بەرەو پەروەردەی ڕۆحی هەنگاو دەنێت.

پەرەسەندن: ئیڤۆڵەیشن

تەوق: دەور، گەمارۆ

دەم: کات

دهۆ: فیڵ

دێرین: کۆن

زیندەوەرزانی: بایۆلۆژی

ژیربێژی: لۆژیک

ڕاڤە: تفسیر

ڕەوشت: اخلاق

سفر: بەشەکانی پەرتووکی پیرۆز

فرە: گەلێک

کەتوار: واقع

کۆمەڵکوژی: جینۆساید

گێتی: جیهان، دنیا

گومڕایی: ضلالة

گشت: هەموو

گەلێک: زۆر

لەهەمبەر: سەبارەت

مەزن: گەورە

ناخوداباوەڕ: ملحد، ئەیسییێست

نوێ: تازە

نازانمگەرا: ئەگنۆستیک

هزر: فکر

وەلێ: بەڵام

## سەرچاوەکان


أ. سەرچاوە ئینگلیزییەکان:

1. Knowledge of God by Alvin Plantinga
2. Is There a God?  by Richard Swinburne
3. The Design Argument  by Elliott Sober
4. The Kalam Cosmological Argument
By William L. Craig
5.. A Debate on God and Morality: What is the Best Account of Objective Moral
By William Lane Craig، Erik J. Wielenberg
6 . mark linville `the moral argument´ in the blakwell companion Good
God: The Theistic Foundations of Morality
by David Baggett and Jerry L. Walls

**ب. سەرچاوە عەرەبییەکان:**

٤. مستعدون للمجاوبة ـ وليم لين كريج
٥. الصنع المتقن – دلالات الفيزياء علي وجود الخالق ـ مصطفي نصر قديح
٦. قصة الإيمان بين الفلسفة والعلم والقرآن ـ شيخ نديم جسر
٧. كيف بدأ الخلق ـ عمرو شريف
٨. ليطمئن عقلى – احمد خيرى العمرى
٩. وهم الإلحاد ـ عمرو شريف
١٠. برهان الإمكان والوجوب بين ابن سينا وصدر الدين الشيرازى ـ عادل محمود بدر

**ج. سەرچاوە کوردییەکان:**

١١. عەقڵ و ئیمان ـ نووسینی: دکتۆر کاوە ئەحمەد
١٢. بەڵگەکانی بونی خودا ـ نووسینی: سامی عامری
١٣ حەقیقەتی ئیلاهی ـ نووسینی: هەمزە تزۆرتس.



پ.د.ئاراس محەمەد صاڵح

# هۆیەکانی گەشەکردنی
# بیری شیوعی لە کوردستاندا

لە سەرەتاکانی سەدەی بیستەم و بەتایبەتی لە چلەکان و پەنجاکاندا بیری شیوعی لە کوردستاندا بەخێرایی گەشەی کردووە، سەرەتا ئەم بیرە نوێیە زیاتر لەناو توێژە ڕۆشنبیر و خوێندەوارەکەدا بڵاوبووەتەوە، لەو سەردەمەدا بیری شیوعی توانیویەتی خەڵکێکی زۆر لە دەوری خۆی بکاتەوە، ئەوەی تێبینی ئەکرێت لە ناوەندە دینییەکەدا و لەناو بنەماڵە ناسراوە ئاینییەکانی کوردستاندا خەڵکی دیار و ناسراو تەنانەت مەلای دوانزە عیلم شوێنیان کەوتوون و بە بیر و بەرنامە و پەیڕەویان سەرسام بوون.

لێرەدا پێویستە ئەو پرسیارە بکەین: بۆچی لەناو کۆمەڵێکی ئاینداری وەکو کورددا، کە هەزاران مامۆستای ئایینی و مزگەوت و تەکیی و خانەقای تێدا بووە لەوکاتەدا، چۆن شیوعیەکان توانیان بەوشێوەیە گەشە بکەن و جێگەپێی خۆیان لە هەموو کوردستاندا بکەنەوە؟ بۆ وەڵامی ئەم پرسیارە لێرەدا هەوڵ ئەدەین ئاماژە بە هۆیەکانی گەشەکردن و زەمینەی لەباری سەرکەوتنی بیری شیوعی لە کوردستاندا بدەین، بێگومان هەندێ لە هۆیەکانی ئەو گەشەکردنە و زەمینەکەی تایبەتبووە بە ناوەندە ئاینییەکەوە، هەندێکیشی تایبەتبووە بە میتۆد و شێوەی کارکردنی شیوعییەکان خۆیانەوە.

**ئەوەی تایبەت بووە بە ناوەندە ئاینییەکەوە، دەتوانین لە چەند خاڵێکدا ئاماژەی پێ بدەین، وەک:**

**یەکەم**/ پاشکەوتوویی ناوەندە ئاینییەکە: لە نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەمدا کە زۆر گۆڕانی گەورە لە ناوچەکەدا ڕوویدابوو، هێشتا ناوەندە ئاینییە تەقلیدییەکەی کوردستان نەیتوانی بوو هیچ گۆڕانێک لە شێوازی خوێندنی ئایینی و گوتاری ڕۆژانەی خۆیدا بکات، هەژموونی دەرویشگەرایی لەلایەکەوە پرزەی لێبڕی بوو، لەلایەکی ترەوە داخران و دابڕان لە هەموو بیرێکی نوێی ڕۆشنبیریی و مەعریفی ئیفلیجی کردووە، بەجۆرێکی وەها کە جێگەی هیوای ئەوە نەبووە بتوانێت جوڵەیەک بکات و تۆزێک لەگەڵ سەردەمەکەدا بچێتە پێشەوە، هەرچەندە لەو ڕۆژگارەدا هەندێ هەوڵی چاکسازی هەبووە، بەڵام هەرزوو شاربەدەر کراون و هیچیان لەوبارەوە بۆ نەکراوە.

لەهەمانکاتدا بزاڤی خوێندەواریی و ڕۆشنبیریی و ڕۆژنامەنووسی تا ئاستێکی باش هەنگاوی نابوو، لەو ڕۆژگارەدا ژمارەی قوتابخانەی نوێ و دەرچووانی زانکۆ و پەیمانگا لە هەڵکشاندا بووە، لەگەڵ هەموو ئەو گۆڕانانەشدا گوتاری ئایینی لە بازنەی چەند باسێکی چەندبارە دەرباز نەبووە، هەرئەوەیش وایکردووە توێژی خوێندەوار زیاتر ڕوویان لە بیرە نوێیەکان بووە و لە دەوریان کۆبوونەتەوە.

**دووەم:** هەژموونی بیری خورافە بەسەر گیانی ئاینیدا: لەو ڕۆژگارەدا کە بزاڤی سیاسیی و ڕۆشنبیریی و بیرە نوێیەکان لە گەشەکردندا بووە، گوتاری ئاینی کە تەنها وتاری ڕۆژانی هەینی هەندێ مزگەوتی کەم بووە، لەگەڵ خوێندنەوەی ساڵانەی مەولودنامە لە مانگی مەولودا، وتاری هەینی سیخناخ بووە بە خورافیات و شتی پڕوپوچ، سەرچاوەی وتارەکان کتێبەکانی (بدائع الزهور) و (درة الناصحين) بووە، کە ئەمانەیش پڕن لە چیرۆکی ناڕاست و شتی بێبنەما، مەولودنامەکانیش لەبری ئەوەی باسی ژیانی پێغەمبەر (د.خ) بکات، هەندێ شتی شاخ و گوێداری داوە بە گوێی خەڵکیدا.

بێگومان دەرچووی قوتابخانەی نوێ و توێژی ڕۆشنبیر، باوەڕ بەو شتە پڕوپوچانە ناکات، هەربۆیە ئەو توێژانە زیاتر لە ئایین دوورکەوتوونەتەوە و خۆیان گوتەنی شوێنی بیرە نوێیە عەقڵانییەکان کەوتوون.

زانایەکی ئایینی مونەوەری وەک شێخ محەمەدی خاڵ لەو ڕۆژگارەدا ئەو ڕەوشەی بەچاوی خۆی بینیوە و ترسی زۆری هەبووە توێژی خوێندەوار و ڕۆشنبیری کورد بەهۆی چەقبەستوویی ڕەوشی ئایینی و بیری خورافەوە زیاتر لە دین دووربکەنەوە و ڕووبکەنە بیرە نوییەکان، لەوبارەیەوە وتویەتی:" بەڵام (موسڵمانان) ئەبێ بزانن کە ڕۆژی خورافات و پڕوپوچ پەرستی نەماوە، میللەت بەتەواوی چاوی کراوەتەوە، ئەگەر موسڵمانەکان ئیمان و باوەڕی خۆیان ڕاست و دروست نەکەنەوە، وە بە بیروباوەڕی ڕاست و دروستی ئیسلامی – وەک پێغەمبەر و یارانی– خۆیان ئارایش نەدەن خوێدەواران و تازە پێگەیشتووان ئیمان ناهێنن بەم ئیسلامییەتەی ئەمڕۆ لەسەرین، ئەو حەلە خۆشیان بە گومڕایی ئەمرن، وە ئەشبن بەمایەی گومڕایی عالەمێک)". بەڵام مەخابن کەس بەدەم بانگەواز و خەمەکانی شێخی خاڵەوە نەچووە و بارودۆخەکە بۆچوونەکانی ئەوی سەلماندووە.

**سێیەم**: داخراوی گوتاری ئایینی: لەو ڕۆژگارەدا کە بیری نوێ و بزاڤی ڕۆشنبیریی و توێژی خوێندەوار لە گەشەکردندا بووە، وتاربێژانی ئایینی نەیانتوانیوە ئاستی خۆیان بۆ ئەو ئاستە ڕۆشنبیرییە بەرزبکەنەوە و لەگەڵ توانای ژیری ئەو توێژە نوێیانەدا بدوێن، بەڵکو لەسەر ڕابردوویان خۆیان بەردەوامبوون و تەنانەت گۆڕان و بەرەوپێشچوونیان بە لەدین دەرچوون لەقەڵەمداوە، بەردەوام لە گوتار و وەعزەکانیان چەند شتێکی چەند بارەیان دووبارە کردووەتەوە.

شاعیرێک کە لەو ڕۆژگارەدا ژیاوە و ئەو بارودۆخەی بەچاوی خۆی بینیوە، لەبارەی گوتاری ئاینییەوە دەڵێت:

**هەردوو گوێم پڕ بوو لە باسی وەعز و سەرفیترە و زەکات**
**هەر هـــەواڵی حـــەشـــر و نەشرم پێ ئەڵێی تاکوو مەمات**
**بەســـــیە لــــەم مەوزوعە لادە، فێری نوێژ بوو کائیـــنات**
**خوتبەیەکی ئیجتیمـــاعیم پێ بڵـــێ بـــۆ ڕێی حـــەیات**
**ئەی مـــەلا تۆ بی خودا، لـــەم فیکـــرە کـــۆنە لابـــدە**
**فەننی تـــازەم پێ نیشادە، بۆ تـــەرەقی و ڕێی نەجـــات.**

**سێیەم**: ناوەندە دینییەکە لە خەمی خەڵکیدا نەبووە: لەو ڕۆژگارەدا کە کۆمەڵی کوردەواری لە بارودۆخێکی ئابووری نالەبار و گیرۆدەی دەستی ئاغا و دەرەبەگ و شێخایەتی بووە، مامۆستایانی ئایینی لەژێر ڕووناکی بیری ئاینیدا نەهاتوون شیعاری ڕزگاری کۆمەڵ بەرزبکەنەوە لە دژی ئاغا و دەرەبەگ، لە گوتار و فەرمایشتەکانیاندا بەخەڵکیان وتووە ڕەوشتتان جوانبێت و نوێژ بکەن و زەکات بدەن، بەڵام ڕزگاربوونی خەڵکیان لەدەست نەهامەتی و ناخۆشی و چەوساندنەوەی دەرەبەگ بە ئەرکی خۆیان نەزانیوە، هەندێ جار موجامەلەی ئەو ئاغا و دەرەبەگانەشیان کردووە، ئەمەیش وایکردووە

خەڵکە هەژارەکە بەدوای ڕێگایەکی تردا بگەڕێن بۆ ڕزگاربوویان لەو بارودۆخە سەختە، لەوکاتەشدا تەنها شیوعییەکان دژایەتی بەرەی ئاغا و دەرەبەگیان کردووە، هەربۆیە خەڵکی ڕووی تێکردوون و بە تاکە فریادڕەسی ڕزگارییان زانیون.

**پێنجەم**: ناوەندە دینییەکە هەڵگری خەمەکانی نەتەوە و نیشتمان نەبووە: لە نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەمدا ڕەوشی ئایینی کوردستان قۆناغی وەعز و بیری دەروێشی تێنەپەڕاندووە، ئەگەر هەندێ دەنگی منەوەریش هەبووبێت وەک مەلای گەورە لە کۆیە و شێخ محەمەدی خاڵ لە سلێمانی، ئەوانیش بەهۆی نەبووی هۆیەکانی ڕاگەیاندن و داخراوی ناوەندە ئاینییەکەوە دەنگیان زۆر بڕی نەکردووە.

**لە نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەمدا کە زۆر گۆڕانی گەورە لە ناوچەکەدا ڕوویدابوو، هێشتا ناوەندە ئایینیە تەقلیدییەکەی کوردستان نەیتوانی بوو هیچ گۆڕانێک لە شێوازی خوێندنی ئایینی و گوتاری ڕۆژانەی خۆیدا بکات.**

لەکاتێکدا بیری چەپ و توێژی ڕۆشنبیران دروشمی ڕزگاری نیشتمانی و نەتەوەیی بەرز دەکەنەوە و دەبنە ڕابەری ئەو ئاڕاستە سیاسیی و نیشتمانییە کە ڕۆژ بەڕۆژ لە گەشەکردندا بووە، شیوعییەکان لەناو ئۆرگانەکانی حیزبی شیوعیدا خۆیان ڕێکخستووە و لە چلەکان و پەنجاکاندا ژمارەیەک خۆپیشاندانی گەورەیان سازکردووە و لەوپێناوەشدا هەزارانیان ڕووبەڕووی زیندانی و کوشتن بوونەتەوە، هەروەها ژمارەیەک گۆڤار و ڕۆژنامە و بڵاوکراوەی تر و بازنەی ڕۆشنبیریان هەبووە.

**شەشەم**: دروستبوونی بنەماڵەی دەسەڵاتدار و خاوەن موڵک بەناوی ئاینەوە: ڕەوشی ئایینی و پشتگیری دەوڵەتی عوسمانی بەتایبەتی لە نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەدا کاریگەری هەبووە لە دروستبوونی هەندێ بنەماڵەی ئایینی کە دواتر بوونەتە شێخی خاوەن موڵک و خەڵکیان بۆ بەرژەوندی خۆیان ڕەتاندووە، کاتێک جوتیاری هەژار، بەتایبەتی نەوەی چلەکان و پەنجاکانی کوردستان بینیویانە بەناوی ئایین و شێخایەتییەوە توێژێکی تر لە دەرەبەگی خاوەن زەوی خەڵکی ئەچەوسێننەوە، ئەمەیش پاڵنەرێکی بەهێز بووە بۆ چوونە سەنگەر لەگەڵ شیوعییەکان لە دژی ناوەندە دینییە تەقلیدیەکە.

**حەوتەم**: خۆقەتیسکردنی مامۆستایانی ئاینی لەناو مزگەوت و گرنگی نەدانیان بە ڕۆشنبیری سەردەم: لە نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەمدا مونەوەرانی کورد لە هەوڵی

بێوچاندا بوون بۆ پێشخستنی بزاڤی ڕۆشنبیری کوردی، لەوپێناوەشدا ژمارەیەک گۆڤار و ڕۆژنامەیان دەرکردووە، لە چلەکان بەدواوە چەپەکان لە ناوەندە ڕۆشنبیریەکەدا تەواو باڵادەست بوون.

لەو کاتەدا ناوەندە ئایینییەکە لەسەر ڕەوشی پێشووی خۆی بەردەوام بووە و هیچ هەنگاوێکی بە ئاڕاستەی چاکسازی نەناوە، تەنانەت لەناو توێژی فەقێی مزگەوتەکاندا، فەقێ چەپەکان توانیویانە گۆڤاری (دەنگی فەقێ) دەربکەن و دابەشی بکەن بەسەر مزگەوتەکاندا، بەڵام مامۆستا و فەقێ ناشیوعییەکان نەیانتوانیوە گۆڤارێکی ڕۆشنبیری دەربکەن و لەڕێگەیەوە دەنگ و گوتاری خۆیان بە خەڵکی بگەیەنن.

**هەشتەم**: بوونی حکومەتی سەرکوتکەر و دواکەوتووی ڕۆژهەڵات: بوونی حکومەتی دواکەوتوو و سەرکوتکەر لە ڕۆژهەڵاتدا کاریگەری زۆری هەبووە لەسەر گەشەکردنی بیرە نوێیەکان، بەتایبەتی بیری شیوعی کە هەموو کات مژدەی ئازادی شۆڕشی ئۆکتۆبەریان بەگوێی خەڵکیدا چرپیوە، لە نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەمدا شۆڕشی ئۆکتۆبەر وەک فریادڕەسێکی گەورەی گەلانی ژێردەست سەیرکراوە.

دواکەوتوویی حکومەتی عێراقی لەڕووی پێشکەشکردنی خزمەتگوزاریی و لەهەمانکاتدا وەک دەسەڵاتێکی پۆلیسی سەرکوتکەر، ڕۆڵی هەبووە لە گەشەکردنی بیرە نوێیەکان لە کوردستاندا، بەوهیوای دۆخێکی باشتر و ئازادی زیاتر بۆ خەڵکی دەستەبەر بکات.

## ئەو هۆیانەی تایبەتە بەشێوازی کارکردنی شیوعیەت:

**یەکەم**: بانگەشەی بیری پێشکەوتوخوازانە و ڕزگاربوون لە دواکەوتوویی: سەدان ساڵ بووە کۆمەڵگە گیرۆدەی دواکەوتوویی و هەژاریی و چەوسانەوە بووە، کاتێک لە سەرەتاکانی سەدەی بیستەمدا بیرە نوێیە ڕۆژئاواییەکان دەردەکەون و بانگەشەی ژیانێکی باشتر و پێشکەوتنی کۆمەڵ و نیشتمان دەکەن، بێگومان خەڵکی بە تامەزرۆییەوە شوێنیان دەکەون بەوهیوایەی لە ڕەوشی هەژاریی و نەداریی و پاشکەوتوویی ڕزگاریان بکەن و ژیانێکی باشتر بگوزەرێنن.

بیری شیوعی هەر لە سەرەتای سەرهەڵدانییەوە بانگەشەی ڕزگاریی و دۆخێکی ئابووری باشتری کردووە، دروشمی دژایەتی ڕژێمە دواکەوتووەکانی بەرزکردووەتەوە، لەناو کۆمەڵیشدا دروشمی پێشکەوتنخوازی بۆخوی داناوە، هەتا ئێستاش لە گوتاری شیوعییەکاندا پێشکەوتنخواز، واتە: شیوعی و لە بەرامبەریشدا هەرکەسێک سەر بەوان نەبووبێت بە کۆنەخواز و دواکەوتوو ناویان بردووە.

**دووەم**: دژایەتی دەرەبەگ و ئاغا: لە کوردستاندا سیستمی دەرەبەگایەتی ئامادەیی تەواوی هەبووە، بەتایبەتی لە سەدەی نۆزدەدا گەشەی زۆری کردووە، دەرەبەگی کورد جگەلەوەی ڕەنجی جوتیار و پاڵەی بردووە و تیکەی چەوری بێ ئارەقی خواردووە،

جوتیار و ڕەنجبەری هەژاریش بێشێو سەریناوەتەوە، لەهەمانکاتدا هەموو کات بەچاوی سوکەوە سەیری پاڵە و جوتیارەکانی کردووە و بە ڕووتە و برسی ناوی بردوون ڕێگەیان نەداون لە کۆڕ و دیوەخانی ئاغادا دابنیشن.

ئەم دۆخە نالەبارە ساڵانە دووبارە بووەتەوە و ناوەندە دینییە تەقلیدییەکەش هیچی نەوتووە و بەگژ ئەم دۆخە نامرۆڤانەدا نەچووەتەوە، هەندێ جار بەهۆی هاوکاری ئاغاکانەوە و بۆ مەلا و فەقێ و مزگەوتەکان، موجامەلەی زۆریان کردوون و لە ئاست کارە دزێو قێزەونەکانیان بێدەنگبوون، ستەمی دەرەبەگی کورد هەندێ جار سەریکێشاوە بۆ داگیرکردنی ژن و سورانە و زۆر شتی تری قێزەون، جوتیار و پاڵەی کورد ساڵانێکی زۆر تاڵاوی ئاغا چووە بە قورگیاندا، هەتا شیوعییەکان هاتوون و چوونەتە سەنگەری دژایەتی چینی دەرەبەگەوە، لەکاتێکی وەهادا بێگومان چینە هەژار و چەوساوەکان شوێنیان کەوتوون و وەک فریادڕەس سەیریان کردوون.

**سێیەم**: خەباتی سیاسیی و ڕزگاری: لە دوای کۆتایی هاتنی جەنگی یەکەمی جیهانی کۆتایی هات، لەسەر کەلاوەی ئەو دەوڵەتە زۆربەی گەلانی ناوچەکە بوونە خاوەنی دەوڵەتی نەتەوەیی خۆیان، لەو نێوانەدا کورد هیچی پێنەبڕاوە، بۆ بەدەستهێنانی ئەو خواستەی دەستی بەخەباتی سیاسیی و چەکداری کردووە، لەوپێناوەدا هەزاران شەهیدی داوە و وڵاتی سوتاوە و وێرانکراوە، لەبەرەی ئەو خەباتەدا چەپ و عەلمانی و مونەوەرەکان ئامادەگی تەواویان هەبووە، ئەمەیش خاڵێکی بەهێزبووە و بۆ گەشەکردنی بیرە نوێیەکان و دوورکەتنەوەی خەڵکی لە ناوەندە دینییە داخراوەکە.

**چوارەم**: دژایەتی پاشکەوتوویی کۆمەڵایەتی: کاری شیوعییەکان تەنها بواری سیاسیی و ڕێکخستنی نەگرتووەتەوە، بەڵکو بەردەوام کاریان بۆ هۆشیارکردنەوەی جەماوەر کردووە و چەمکی نەهێشتنی چینایەتی و دەرەبەگیی و نەخوێندەواریی و لە زۆر بواری تردا کاریان کردووە بۆ پێشخستنی میللەت و نیشتمان.

**پێنجەم**: گرنگیدانی زۆریان بە بزاڤی ڕۆشنبیریی و ڕۆژنامەنووسی: لە نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەمدا بزاڤی ڕۆژنامەنووسیی و چاپەمەنی و ئەدەبی کوردی گەشەی زۆری کردووە، ژمارەیەک ڕۆژنامە و گۆڤار دەرکراون، لەو ناوەندە ڕۆشنبیریی و ڕۆژنامەنووسیدا شیوعییەکان و هەڵگرانی بیرە نوێیەکان ئامادەگی تەواویان هەبووە و زۆربەی قەڵەمە ناسراوەکانی ئەو ناوەندە ئەوان بوون.

لە چلەکان و پەنجاکانی سەدەی ڕابردوو بەدواوە شیوعییەکان توانیویانە جڵەوی کاروانی بزاڤی ڕۆژنامەنووسیی و ڕۆشنبیری کوردی بگرنەدەست، هەندێ ڕۆژنامە و گۆڤاری تایبەت بە خۆشیان هەبووە، هەرکەسێکیش هاوبیری ئەوان نەبووبێت بە توندی دژایەتیان کردووە و ناو و ناتۆرەی ناشیرینیان بۆ دروستکردووە، کەسێکی وەک پیرەمێردی شاعیر لەبەرئەوەی لە بەرەی چەپەکاندا نەبووە، بەردەوام دژایەتیان کردووە،

کاتێک ئەم شاعیرە مونەوەرە لە ساڵی ١٩٤٠ کتێبی (ئاوە ڕەشەی ڕووسی سوری) بڵاوکردووەتەوە، هەرزوو شیوعییەکان دێزەبەدەرخۆنەیان کردووە و ڕێگەیان نەداوە وەکو پێویست بکەوێتە بەردەستی خەڵکی و بیخوێننەوە.

**شەشەم**: پێکهێنانی ئەڵقەی ڕۆشنبیریی و خوێندنەوەی کتێب: لەبەرئەوەی کتێبە کەم بووە، یان وەک پێویست هەموو کەس نەیتوانیوە دەستی بکەوێت، لەبەرئەوە کاتێک کتێبێکیان دەستکەوتووە بەتایبەتی کتێبی بیری چەپ، بە نۆرە خوێندوویانەتەوە و لەناو خۆیاندا دەستاودەستیان پێکردووە و هانی یەکتریان داوە لەسەر خوێندنەوە و خۆڕۆشنبیرکردن، ئەم هەنگاوەیان کاریگەری زۆری هەبووە لە پێگەیاندنی ژمارەیەک نووسەر و ڕۆشنبیر لەوکاتەدا، تەنانەت هەرکەسێک ئاستی ڕۆشنبیری بەرز بووبێت و سەرقاڵی خوێندنەوە بووبێت پێیانووتووە ئەو کەسە شیوعییە.

حەوتەم/ گرنگیدان بە بواری پەروەردە و چوونیان بۆ ناو قوتابخانەکان: ناوەندەکانی خوێندن شوێنێکی زۆر باشبووە بۆ بڵاوکردنەوەی بیری شیوعی، چوونی ژمارەیەکی زۆر لە کادرانی شیوعی بۆ پەیمانگای مامۆستایان و خانەی باڵای مامۆستایان و پاشان بوونیان بە مامۆستا و بڵاوبوونەوەیان بەناوچە جیاوازەکانی کوردستاندا بەهۆی پیشەی مامۆستایەتییەوە، کاریگەری زۆری هەبووە لەسەر بڵاوکردنەوە و گەشەکردنی بیری شیوعی لەو ڕۆژگارەدا.

مەخابن لەو ڕۆژگارەدا شیوعییەکان لە ڕێگەی پرۆسەی پەروەردەوە ژمارەیەکی زۆریان چوونەتە ناوەندەکانی خوێندن و بیری خۆیان بڵاوکردووەتەوە، لەوکاتە ناوەندە دینییە تەقلیدییە داخراوەکە چوون بۆ قوتابخانەی بە حەرام زانیوە، کەسێکی وەک (د.مستەفا زەڵمی) ئاماژە بەوە دەکات کە مامۆستایانی ئایینی نەک چوونی کچ بەڵکو زۆریان چوونی کوڕیشیان بۆ قوتابخانەی نوێ بە نادروست زانیووە و ڕێگریان لێکردووە، بێگومان ناوەندێکی ئاینی ئەوەندە داخراو و دواکەوتوو بووبێت لە بەرامبەر بیری نوێ و تەوژمە خێراکانی شارستانی ڕۆژئاوادا خویناگرێت و ئەوان شوێنی دەگرنەوە و خەڵکی پشت دەکەنە ئەو ناوەندانەی توانای هەڵکردنیان نییە لەگەڵ پێشهاتەکانی ڕۆژگاردا.

### سەرچاوەکان


١. بێکەس، دیوانی بێکەس، ئامادەکردنی: محەمەدی مەلا کەریم، چ١، چاپخانەی شڤان- سلێمانی، ٢٠٠٨.
٢. پیرەمێرد، ئاوە ڕەشەی ڕووسی سور، ئامادەکردنی: د.ئاراس محەمەد صاڵح، چ٢، سلێمانی، ٢٠١٦.
٣. مستەفا زەڵمی، دکتۆر، کاروانی ژیانم، چ٢، نوسینگەی تەفسیر، هەولێر، ٢٠١٦.
٤. عیزەدین مستەفا ڕەسوڵ، دکتۆر، بەشێک لە یاداشتەکانم، بەشی یەکەم، چ١، سلێمانی، ٢٠٠٦.
٥/ شێخ محەمەدی خاڵ، تەفسیری سورەتی فاتیحە، چ١چاپخانەی المعارف- بەغداد، ١٩٥٥..



پ.ی.د.هاشم عومەر ئەحمەد

# بانکی ئیسلامی

## ناساندن و کار و چالاکی و گرێبەستەکانی لە ڕوانگەی شەریعەتەوە

## بەشی یەکەم: دەروازەیەک بۆ تێگەشتن

قسەکردن و تاوتوێکردنی بابەتێکی هەرە گرنگی هاوچەرخ و تایبەت بەژیانی تاک و کۆمەڵگە لەم سەردەمەدا کە ئەویش بابەتی بانکی ئیسلامییە لە ڕەهەند و لایەنە جیاوازییەکانییەوە، پێویستی بەڕوونکردنەوە و گفتوگۆیەکی وردی ئەکادیمیی و زانستییانە هەیە، کردنەوەی بابەتێکی هەستیاری ئاوەها و ادەخوازێت و پێویست دەکا ئەوە بڵێین: دروستی و نادروستی هەموو کردەوە و کارێکی موسڵمان بەتایبەت هەڵسوکەوتی ڕۆژانە و مامەڵە داراییەکانی سەرچاوەکەی شەریعەتی پیرۆزی ئیسلامە، کە دوا پەیام و شەریعەتی خوداییە، دروسترین و تەواوترین و گونجاوترینییەتی بۆ ژیانی مرۆڤەکان لە هەموو سەردەم و کات و شوێنێکدا، چونکە پێوەری دروست و گشت لایەنی ڕەهەندەکانی ژیانی لەخۆگرتووە، گونجاوە لەگەڵ و اقیع و خواست و داواکارییەکانی مرۆڤدا، لەهەمانکاتدا ئەم ئایینە سرووشتێکی تەندروست و گونجاوی لەگەڵ سروشتی مرۆڤدا هەیە، ئەمەش وایکردووە تەشریعات و حوکمەکانی بگونجێت بۆ مرۆڤەکان لە هەموو سەردەمەکاندا و، بتوانێت لەگەڵ گۆڕانکاریی و نوێگەریەکانی ژیانی مرۆڤدا هاوتەریب و گونجاو بێت، بەدوور نەبێت لەو ڕووداو و واقیع و تازەگەرییانەی سەردەم کە پێویستیان بە حوکم و تێڕوانینی نوێ هەیە لە ڕوانگەی شەرعەوە.

بۆیە گەر سەیری پێگەی مرۆڤ بکرێت لە ڕوانگە و چوارچێوەی تەشریعات و دەقەکانەوە ئەوەمان بۆ بەدەردەکەوێت کە خوای گەورە ئەم ئادەمیزادەی لەخۆوە دروست نەکردووە و بێ بەرنامە و پرۆگرامی ژیان بەجێی نەهێشتووە، بەڵکو ئادەمیزاد بووەتە ناوەندی دەقەکان و خاوەن تەکلیفە، وەک خوای گەورە دەفەرمێت (أَفَحَسِبْتُمْ أَنَّمَا خَلَقْنَاكُمْ عَبَثًا و أَنَّكُمْ إِلَيْنَا لَا تُرْجَعُون) (المؤمنون:١١٥) و (أَيَحْسَبُ الْإِنْسَانُ أَنْ يُتْرَكَ سُدًى) (القيامة:٣٦)، بەڵکو زیاد لەو گرنگییەش کردویەتییە جێنشینی خۆی لە زەویدا بەمەبەستی ئاوەدانکردنەوە و شارسازیی و بونیادنان و بەندایەتیکردن وەک دەفەرموێت (وَإِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلَائِكَةِ إِنِّي جَاعِلٌ فِي الْأَرْضِ خَلِيفَةً) (البقرة:٣٠) و (وَإِلَى ثَمُودَ أَخَاهُمْ صَالِحًا قَالَ يَاقَوْمِ اعْبُدُوا اللَّهَ مَا لَكُمْ مِنْ إِلَهٍ غَيْرُهُ هُوَ أَنْشَأَكُمْ مِنَ الْأَرْضِ و اسْتَعْمَرَكُمْ فِيهَا فَاسْتَغْفِرُوهُ ثُمَّ تُوبُوا إِلَيْهِ إِنَّ رَبِّي قَرِيبٌ مُجِيبٌ) (هود:٦١)و (يَادَاوُودُ إِنَّا جَعَلْنَاكَ خَلِيفَةً فِي الْأَرْضِ فَاحْكُمْ بَيْنَ النَّاسِ بِالْحَقِّ) (ص:٢٦)، ئەمانە و چەندین دەقی دیکە هەن لەقورئان و فەرمودەدا سەبارەت بەوەی چۆن خوای گەورە مرۆڤی کردووەتە جێنشین بۆ ئاوەدانکردنەوەی زەوی، بۆ بەجێهێنانی ئەم کارەش لە بەرامبەردا هەموو هۆکار و ئامراز و کەرەستەکانی ئاوەدانکردنەوەی پێ بەخشیوە، بەتایبەت لە بواری ماڵ و سامان و دارایی و مامەڵە داراییەکاندا و ەک دەفەرموێت(آمِنُوا بِاللَّهِ ورَسُولِهِ وأَنْفِقُوا مِمَّا جَعَلَكُمْ مُسْتَخْلَفِينَ فِيهِ فَالَّذِينَ آمَنُوا مِنْكُمْ وأَنْفَقُوا لَهُمْ أَجْرٌ كَبِيرٌ)(الحديد:٧)، کەواتە سامان و ماڵ پێویستییەکی گرنگی ژیانی مرۆڤە و بەکۆڵەکەی ژیانی دادەنرێت، و ناتوانرێت و بێ مەبەست و خواست بێت لە بەرامبەریدا، بۆیەش هەموو کات بۆ

بوژانەوە و گەشەی ژیان و بژێوی خۆی پێویستیەکی زۆری دەبێت بۆ پەیداکردنی ماڵ و بەدەستهێنانی سامان و خەرجکردنی لە کاری دروست و باشەدا، و خوای گەورەش مۆڵەتی داوە بەم ئادەمییە تاوەکو هەوڵبدات بۆ بەدەستهێنانی لە ڕێگەی دروست و حەلاڵەوە وەک دەفەرموێت (فَإِذَا قُضِيَتِ الصَّلَاةُ فَانْتَشِرُوا فِي الْأَرْضِ وَابْتَغُوا مِنْ فَضْلِ اللَّهِ وَاذْكُرُوا اللَّهَ كَثِيرًا لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ) (الجمعة :١٠)و(هُوَ الَّذِي جَعَلَ لَكُمُ الْأَرْضَ ذَلُولًا فَامْشُوا فِي مَنَاكِبِهَا وَكُلُوا مِنْ رِزْقِهِ وَإِلَيْهِ النُّشُورُ)(الملك:٢٣)، کەواتە ئەو هۆکارانەی پێویستە بۆ خزمەتی مرۆڤ خوای گەورە فەراهەمی کردووە و مۆڵەتی یاوە بەشێوەیەکی دروست و ڕەوا بەکاری بهێنن بێ ستەم و تەعداکردن لەسەر ماڵی یەکدی، لەهەمانکاتیشدا تەشریعات و ئەحکامە داراییەکانی ئیسلام هاندەر و گونجاون بۆ دەستخستن و بەدەستهێنانی ماڵ و سامان.

بەرمەبنای ئەوەی باسمانکرد هەوڵدان و تێکۆشانی دروست و ڕەوا بۆ بەدەستهێنانی ماڵ و سامان گرنگی خۆی هەیە لە ئیسلامدا، باشترین ڕێگا و فراوانترین دەرگاکانی بەدەستهێنانی ماڵ لە ڕێگەی مامەڵە دارایی و گرێبەستەکانەوەیە کە بەباشترین هۆکار دادەنرێت بۆ گۆڕینەوە و دەستاودەستکردنی ماڵ و سامان و دارایی لە نێوان تاکەکانی کۆمەڵگەدا و کۆنەبوونەوەی لە دەست چەند کەسێکی چاوچنۆک و هەلپەرستدا، بۆیە پێویست دەکات ئەم کارەش لەژێر سایەی سیستەمێکی دروست و حەلاڵدا ئەنجام بدرێت کە دوور بێت لە سوو و ناشەفافیەت و خواردنی ماڵی کەسی دیکە و قۆرخکردنی شتومەک، ئەویش سیستەمی دارایی ئیسلامییە وەک بەشێک لە ئابووری ئیسلامی گونجاو بۆ ئەم واقیعەی کە تیایدا دەژین، و گرنگترین و دیارترین بەرجەستەی کردەیی ئەم سیستەمەش لەم دەیانەی دواییەدا خۆی دەبینێتەوە لە دەرکەوتنی بانکی ئیسلامی و چالاکی و گرێبەستەکانی کە بەشێوەیەکی فراوان و بەرچاو توانیویەتی کار و چالاکییەکانی لە چەندین وڵاتدا ئەنجام بدات.

### هۆکاری خستنە ڕووی بابەتەکە:

لەم و اقیع و سەردەمەی ئێستاماندا جیهان بەگشتی و لەم دەیانەی دواییەدا بەتایبەتی گۆڕانکاری بنچینەیی و ڕیشەیی ڕوویانداوە لە هەردوو ئاستی ئابووریی و داراییدا ئەویش بەهۆی ئەو پێشکەوتنە گەورەی کە لە بوارەکانی گەیاندن و تەکنەلۆجیا و زانیارییدا ڕوویانداوە. ئەم گۆڕانکارییانەش کاریگەری ڕاستەخۆ و سەرەکی هەبووە لە بواری گەشەی ئابووریی و داراییدا و بووەتە هۆی فرانبووی کاری بانکەکان و بەتایبەت بانکە ئیسلامییەکان، هەر بەرمەبنای ئەمەیە دەڵێین لێکۆڵینەوە و دیراسەکردنی چڕ و وردی کارەکانی بانکی ئیسلامی و گرێبەستەکانی زەرورەتێکی و اقیعی و شەرعییە، و پێویستە گرنگی زیاتری پێ بدرێت لەلایەن کەسانی پسپۆڕ و بەئەزمونەوە لەو بوارەدا، هەروەها بەهۆی زۆری ڕیسکی ئابووریی و ترسی دارایی، و بڵاوبونەوەی چەندین

گرێبەست و مامەڵەی دارایی نادروست و حەرامەوە لەناو کۆمەڵگەدا بەتایبەت کۆمەڵگە موسڵمانەکاندا وەک: سوو و زیادە و فێڵ و غەش و قۆرخکردن و بڵاوبونەوەی چەندین دراوی ئەلیکترۆنی نادروست و چەندین مامەڵەی ناشەرعی دیکە، کە لە بەرامبەردا چەندین مامەڵە و گرێبەستی دروست و شەرعی وەلا نراوە و کاری پێناکرێت کە سوود و قازانجی دارایی بۆ کۆمەڵگە دەبێت، لەوانە گرێبەستەکانی (الاستصناع و المضاربة و المرابحة و الإجارة المنهتية بالتمليك...) چەندینی دیکەش، کە ئەم جۆرە مامەڵانە دوورن لە فڵل و سوو قۆرخکردن و ناشەرعیش نین.

لێرەدا پێویستە ئاماژەش بەوە بدەین لەگەڵ ئاڵوگۆڕ و گۆڕانکارییە نوێکانی ژیاندا چەندین دراو و مامەڵەی نوێ هاتونەتە نێو بازاڕی دراو و مامەڵە داراییەکانەوە، کە پێشتر بوونیان نەبووە یاخود گۆڕانکاری بەسەر مامەڵە و گرێبەستەکەدا هاتووە، و ناکرێت دوا ئایینی خودایی و دوا تەشریعی ئاسمانی بۆ ئەم پێشهات و مامەڵە نوێیانە قسەو باس و حوکم و بەدیلی شەرعی نەبێت، گەر هەوڵ و تێڕوانین و دیدگای نوێی نەبێت ڕێچکەی ژیان و مامەڵە دەگۆڕێت یاخود دەوەستێت بەتایبەت بۆ موسڵمانان کە ئەمەش دوورە لە مەقاصید و ڕۆح و مەغزای شەریعەتی ئیسلامەوە، بۆیە ئەم کارە گرنگ هەستیارەی ژیانی تاک و کۆمەڵگە ئەوە دەخوازێت هەوڵێکی جددی و تۆکمە بدرێت بۆ دیراسە و خوێندنەوەی بابەتە نوێکان بەشێوازێکی ئەکادیمی ڕەسەن و پرۆگرامێکی زانستی نوێ کە هەڵقوڵاوی دەق و کۆکەرەوەی هزری مەقاصدی شەریعە و بنەماگشتییەکان بێت و لەگەڵ واقیع و سەردەمدا گونجاو بێت و بتوانرێت جێبەجێ بکرێت.

لەم ڕوانگەیەوە دەمانەوێت چەند زنجیرە باسێکی بابەتیانە لەسەر بانکی ئیسلامی و چالاکی و مامەڵە و گرێبەستەکانی بخەینە خزمەتتان لەپێناو زیاتر ئاشنابوون و بەرچاوڕوونی بەبانکی ئیسلامی و کار و چالاکی و گرێبەستەکانی بەشێوەیەکی گشتی، هەروەها ڕۆڵی لە گەشە و پەرەپێدانی کەرتی بانکی و کاریگەری لەسەر ئابووری کۆمەڵگە بەگشتی. چونکە پێمانوایە تاکی موسڵمان بەتایبەت خاوە مامەڵە داراییەکان نابێت بێ ئاگا بێت لەو کردەوە و مامەڵانەی ڕۆژانە ئەنجامی دەدات، بەتایبەت ئەو بازرگان و کاسبکار و بەرێزانەی لەنێو بازاڕ و مامەڵەکاندان و بەردەوام ڕووبەڕووی مامەڵەی نوێ دەبنەوە، ئەمەش بۆ ئەوەیە تاوەکو موسڵمان بەدوور بێت لە سوو خواردن و مامەڵەی نادروست و ناشەرعی لە ژیانی ڕۆژانەیدا، و بەوشێواز و ڕێگایە مامەڵە و گرێبەستەکانی ئەنجامبدات کە گونجاو و تەبایە لەگەڵ دەقە شەرعی و بنەماکانی مەقاصید و فیقهی ئیسلامدا، چونکە ئەو دەق و بنەمایانە دانراوە بۆ ڕەچاوکردنی بەرژەوەندی و سودەکانی مرۆڤ لە ئێستا و دواڕۆژدا.

## ئامانج و گرنگی بابەتەکە:

بەدەر لەوەی لەسەرەوە باسمانکرد ئەم بابەتە گرنگییەکی زۆری هەیە بۆ کارکردن و بەردەوامیدان بەمامەڵە داراییەکان و چالاکییەکانی دیکەی باری ئابووری ژیانمان، چونکە بابەتێکی واقیعی و سەردەمیانەیە و خوێندنەوە و دیراسەیەکی نوێیە بۆ پێشهاتە نوێکان و مامەڵە هاوچەرخەکانی سەردەم کە بەردەوام لە گەشەی خێرادان و بابەتی تازە و ڕوودا و پێشهاتی نوێش دادەبەزێت، زیاتر لەمانەش لەم خاڵانەشدا چەند گرنگی و ئامانجێک ڕوون دەکەینەوە لەوانە:

١. ڕوونکردنەوە و دەرخستنی بنەما جوانەکان و گەورەیی ئاینی ئیسلامە لەڕووی پێگە و گونجاوی و پێداویستیمان پێی لە هەموو سات و کات و شوێنێکدا، کە بێ پابەندبوون و گەڕانەوە بۆ دەق و مەقاصیدەکانی مرۆڤایەتی بەرەو هەڵدێر و دارمان دەڕوات.

٢. دەرخستنی ئەو ڕاستییەی کە تەنها خوای گەورە مالیک و خاوەندار و بەخشەری سەرەکی و بنچینەیی ماڵە بە مرۆڤ، مرۆڤەکان تەنها جێنشین و ڕێکخەری کارەکانی ڕۆژانەی خۆیانن بەو ماڵەی کەخودا پێی بەخشیون وەک خوای گەورە دەفەرموێت [وَإِذۡ قَالَ رَبُّكَ لِلۡمَلَٰٓئِكَةِ إِنِّي جَاعِلٞ فِي ٱلۡأَرۡضِ خَلِيفَةٗۖ قَالُوٓاْ أَتَجۡعَلُ فِيهَا مَن يُفۡسِدُ فِيهَا وَيَسۡفِكُ ٱلدِّمَآءَ وَنَحۡنُ نُسَبِّحُ بِحَمۡدِكَ وَنُقَدِّسُ لَكَۖ قَالَ إِنِّيٓ أَعۡلَمُ مَا لَا تَعۡلَمُونَ](سورة البقرة:٣)، لەم چوارچێوەیەدا و لەم زنجیرە بابەتەی کە باسی دەکەین کۆمەڵێک بنەما و بناغەی فیقهی و مەقاصیدی حوکمی شەرعی تایبەت دەخەینە بەردەستان بۆ چۆنیەتی مامەڵەکردن بەوسامان و ماڵەی کەخودا پێیداون، و کام ڕێگایەش دروست و شەرعیە بۆ پەیداکردنی ماڵ و سامان لە شەریعەتی ئیسلامدا.

٣. باسکردنی گرێبەست و مامەڵە هاوچەرخەکان و ڕوونکردنەوەی ئەو گرێبەستانەشی کە بانکە ئیسلامییەکان ئەنجامی دەدەن لەڕووی شەرعییەوە.

٤. باسکردنی پێگەی شەرعی بانکە ئیسلامییەکان لەم ڕۆژگارەدا و ئایا تا چەندێک دروست و شەرعییە لەگەڵ هەر بانکێکدا مامەڵە بکەم؟ یان ئەو مامەڵانەی دەیکەن تا چەندە دروستە؟

٥. دەرخستن و ڕوونکردنەوەی حوکمی شەرعی کۆمەڵێک مامەڵەی هاوچەرخ کە زۆر پرسیاری لێوە دەکرێت و هەندێک جاریش مامەڵەکە بەهۆی نەزانی حوکمی شەرعییەوە بووەتە گرفت و کێشە لە نێوان مامەڵەچییەکاندا یاخود بووەتە هۆی گرفتی خێزانی.

٦. ئامانجی گرنگیش ئەوەیە بتوانین داڕشتنەوەیەکی دروست و ورد و پڕ مانا بکەین بۆ هەندێک لەو گرێبەست و مامەڵە هاوچەرخانەی ئەمڕۆ کاریان پێ دەکرێت، ئەمەش لەژێر ڕۆشنایی ڕۆح و مەقاصیدی شەریعەی ئیسلامیدا.

٧. ئامانجێکی دیکە لەم بابەتەدا وەستانە لەسەر ڕۆڵ و پێگەی بانکی ئیسلامی و کارەکانی، بەو مانایەی چی پێدەکرێت و چ پێشکەش دەکات لەپێناو پاڵپشتی ئابووریی و گەشەی بازاڕ و پەرپێدانی ئامرازەکانی دارایی و پرۆژە وەبەرهێنانەکان و گەشەی بەردەوامدا.

**کێشەی بابەتەکە:**

واتە بۆچی ئەم بابەتە باس بکەین لەم کاتەدا؟

دەکرێت بڵێین بابەتێکی هەستیاری لەم چەشنە هەڵقوڵاوی زادەی بیری زانایان و تێڕامانیانە بۆ ئەو و اقیعەی ئێستا، خەمخۆریانە بۆ ژیان و ژین و بژێوی مرۆڤەکان، لەخۆوە نووسین و دیراسەی لەسەر ناکرێت و نەکراوە، مەگەر بووبێتە غەم و کێشە و جێی پرسیاری موسڵمانان بەتایبەت لەو بەربەست و ئاڵنگارە فراوانەی ڕووبەڕووی تاک و کۆمەڵگە بووەتەوە لەڕووی دارایی و بژێویانەوە کە پێویستە وەڵام هەبێت بۆ ئەو تەنگژە ئابووریی و داراییەی ئەمڕۆمان، کەواتە بابەتی مامەڵە هاوچەرخەکان و بانکی ئیسلامی جێی سەرنج و تێبینی کۆمەڵگەیە و پێویستە ئەو کێشە و ئارێشانەی هەیە لەو بابەتەدا بەوردی چارەسەر بکرێن وەڵامبدرێنەوە تاوەکو خەڵک نەکەونە زەحمەتی و ناڕەحەتییەوە، بۆ نمونە:



**بابەتی مامەڵە هاوچەرخەکان و بانکی ئیسلامی جێی سەرنج و تێبینی کۆمەڵگەیە و پێویستە ئەو کێشە و ئارێشانەی هەیە لەو بابەتەدا بەوردی چارەسەر بکرێن وەڵامبدرێنەوە .**



١. لەگەڵ بڵاوبونەوەی بانکەکاندا و بوونی چەندین مامەڵەی هاوچەرخ و مامەڵەکردنی تاکەکانیش لەگەڵ ئەم جۆرە مامەڵانەدا و پێویستیان پێی، دەخوازێت دەرچەیەکی شەرعی و مەقاصیدی دروست و تەواو بدۆزرێتەوە بۆ ئەو جۆرە مامەڵانەی کە لەگەڵ شەریعەتدا دەگونجێن و دەکرێت مامەڵەیان لەگەڵدا بکرێت.

٢. بناغەدانان و تەئصیلی ئەو گرێبەستە نوێیانە بکرێت کە لە بانکە ئیسلامیەکاندا کاریان پێ دەکرێت، و بنچینە و تەکییفی شەرعییان بۆ بدۆزرێتەوە بەپێی بنەما فیقهی و مەقاصیدییە شەرعییە هەڵێنجراوەکان لە قورئان و سونەتی پێغەمبەر(د.خ) و ئیجماعدا.

٣. ئیشکالیەت و گرفتی وشە و زاراوە بەکارهاتووەکانی پەیوەست بە مامەڵە هاوچەرخ و بانکە ئیسلامییەکاندا چارەسەرکردنی لەڕوانگەی شەرعییەوە.

٤. چۆنیەتی بەکارهێنان و بە بەڵگەدانانی بنەما گشتییەکانی شەریعەت و جێبەجێکردنیان بەسەر مامەڵە و گرێبەستە هاوچەرخەکاندا، کە پێویستە زانستییانە مامەڵەیان لەگەڵ بکرێت.

٥. تێڕوانین و دیدگایەکی ورد و شیکەرەوانە بۆ مامەڵە و گرێبەستە بانکییەکان بەپێی بڕیار و ڕاسپاردە مەقاصیدییەکانی شەریعەتی ئیسلام، ئەمەش بەکاراکردنی مەقاصیدەکانە لەو بوارەدا تاوەکو بتوانرێت ماڵ و سامان و ژیان و گیانی خەڵک پارێزراو بێت و بەرەو هەڵدێر و لەناوچوون نەڕۆن گەر بتوانرێت ئەو بنەمایانە لە خزمەت مرۆڤایەتیدا بەکاربهێنرێن لە شوێن و جێگەی خۆیاندا بەکاربهێنرێن و بەپێی بنەمای دیاریکراو بێت.

**پێویستە بزانین:**

بانکی ئیسلامی تەنها وەک دەزگایەکی ئابووری ئیسلامی تایبەت کار و چالاکییەکانی ناکات، بەڵکو بووەتە ڕاستیی و واقیعێکی ڕاوەستاو لەناو سیستەمی ئابووری جیهانیدا، لەگەڵ ئەوەشدا بووەتە حاڵەتێکی تەندروستی ئابووریی و پشتی پێ دەبەسترێت لەم سەردەمەدا لەڕووی کار و چالاکییە ئابورییەکانەوە، و ناتوانرێت نکوڵی لە کار و گەشە و ڕۆڵی ئیجابی بکرێت، بەڵکو لە ئێستادا لەلایەن توێژەران و لێکۆڵەرەوانی چەندین دەزگا و ئەکادیمیای جیاوازی ئابوورییەوە لەنزیک و دوورەوە چاودێری و هەڵسەنگاندنی بۆ دەکرێت، بەشێوەیەکی گەشبین و ئیجابیانە مامەڵەی لەگەڵ دەکرێت، وەک ئەلتەرناتیڤێکی بانکەکانی دیکە سەیری دەکرێت، چونکە لە ماوەیەکی کەمدا ئەم دەزگایە توانیویەتی کار و چالاکییە ئابورییەکانی لە زیاد لە ٥٠ وڵات ئەنجام بدات، و زیاد لە ٢٠٠ بانکی ئیسلامی کرابێتەوە و کار بکات، کە ئەم بانکانە زیاتر لە ١٠٠ ملیۆن سەوداکار و مامەڵەکار لەگەڵیاندا سەودا و کاروچالاکی و مامەڵە ئەنجامبدات، ئەمەش وایکردووە کە ڕۆژانە سەرمایە و سەرچاوەکانی داراییان ئێجگار زیاد بکات، بەپێی هەندێک توێژینەوە کە پشتی بەستووە بە زانیاریی و بەدواداچوون بۆ بەها و نرخی سەرچاوە و ئوصوڵی دارایی ئەم بانکانە واچاوەڕوان دەکرێت بۆ ساڵی ٢٠٢٣ بگاتە ٢،٤٤ تریلیۆن دۆلار.

زیاد لەمەش ئێستا هەندێک لە بانکە گشتگیرەکان لە ئەوروپا و ئاسیادا پەنجەرەیەکی بانکیان کردووەتەوە لەناو بانکەکەیاندا بەناوی پەنجەرە و بەشی بانکی ئیسلامی کە کاروچالاکی و گرێبەستی ئیسلامی ئەنجام دەدەن، لەگەڵ ئەوەی هەندێک لە بانکە گشتگیرەکان لەناو دەوڵەتە ئیسلامییەکاندا هەوڵی گۆڕینیان دەدەن بۆ بانکی ئیسلامی ئەمەش بۆ خۆی وەرچەرخانێکی گەورە و بەرەوپێشچونێکی جۆری دیکەیە لە بانکی ئیسلامیدا، کردنەوەی دەلاقەیەکە بەڕووی ئەو کەسانەدا کە دەیانەوێت مامەڵە بکەن لەگەڵ بانکی ئیسلامیدا بەڕەچاوکردنی پابەندبوون بە شەریعەتی ئیسلام و بنەما گشتییەکانی فیقهی ئیسلامییەوە.

هەربۆیەش دەڵێین دەرکەوتنی ئاسۆی بانکی ئیسلامی بووە دەلاقە و پێگە و دەرچەیەکی ئابووری نوێ لە سیستەمی ئابووریدا کە بەپێی شەریعەتی ئیسلامی کارەکانی

ئەنجامبدات و بتوانێت سەوداکاران و کڕیاران و مامەڵەکاران ڕابکێشێت بۆ لای خۆی بەتایبەت ئەوانەی پابەندن بە یاسا و بنەماکانی شەریعەتی ئیسلامەوە و نایانەوێت سوو و زیادە وەربگرن لە مامەڵەکانیاندا، ئەویش لەڕێگەی گرێبەست و وەبەرهێنانی ئیسلامی و جۆرەکانی دیکەی مامەڵەی شەرعییەوە، کە پێویستە ئەم بانکە ئیسلامییانە پابەندبن بە سەرجەم بنەما و یاسا و ئەحکامەکانی شەریعەتەوە لە مامەڵەکانیاندا.

**دواجار بۆچی ئەمە باس دەکەین:**

ئەگەر بەشێوەیەکی ورد و زانستییانە سەیرێکی گوزەران و ژیانی زۆربەی هاوڵاتیانی زۆر لەو وڵاتە بەناو ئیسلامییەکان بکەین یان ئەو کەمینە موسڵمانانەی کە لە وڵاتەکانی دیکەدا دەژین لە ئاستی هەژاری یان ژێر هەژارییەوە دەژین و هەندێکیشیان ئاستی مامناوەندیان هەیە، ئەمەش ئەو واقیعی ڕاستییە تاڵەیە کە زۆربەمانی تیادا دەژی، هەتاوەکو چەندین ڕێکخراوی خێرخوازیی و هاوکاری دروستبوون بۆ هاوکاریی و گەیاندنی یارمەتی بۆ هەژاران لەو و ڵاتانەدا، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ناتوانن بەهانای ئەو کەسانەوە بڕۆن، کە ئەم شێوازەش لە هاوکاری -بەداخەوە-زیاتر کۆمەڵگاکان تووشی ئیفلیجی و داڕمان و شکستی ئابووری دەکات، وادەکات بەردەوام تاک و کۆمەڵگە و حکومەتەکانیش پشت ببەستن بە هاوکاری دەرەکی بۆ تێپەڕاندنی کێشە و گرفتە داراییەکانیان، هەژارانیش تووشی دەردی چاوەڕوانی دەکات، کە ئەمەش بۆ خۆی کۆمەڵگەیەکی تەمەڵمان بۆ وەبەردەهێنێت، ئەم جۆرە کۆمەڵگەیە بە کۆمەڵگەیەکی نەبوو و هەژار و نەخۆش و برسی ناوزەند دەکرێن، لێرەشەوە تاکەکانی پەنا دەبەنە بەر هەڵاتن و خۆدزینەوە لە ئەرک و بژێویی و یاسا و هێنانەوە بۆ ئەو سیستەمەی تیایدا دەژین، یان شێوازی دیکە دەگرنەبەر بۆ پەیداکردنی بژێوی، یاخود بەناچاری ڕێگای کۆچکردن لە وڵات دەگرنەبەر، کە دواجار ئەمانە هیچی چارەسەری بنەڕەتی کێشە ئابووریی و داراییەکەی تاک و کۆمەڵگەی نەکرد، بەڵکو ئاریشە و گرفتەکان کەڵەکەتر دەبن و چارەسەرەکەش دوورتر دەکەوێتەوە.

بۆیە پێمانوایە ئیدی پێویست دەکات تاکی موسڵمان و هەژارەکان پەنجە و دەستیان شل بکەن لەگەڵ مامەڵە نوێکانی هاوچەرخدا بەتایبەت ئەو گرێبەست و مامەڵانەی کە ئێستا بوونیان هەیە لەڕووی شەرعیشەوە گرفتیان نییە، زیاد لەمەش هەوڵ بدرێت تاک هۆشیار بکرێتەوە بۆئەوەی متمانەی بە مامەڵە و چالاکییەکانی بانکی ئیسلامی هەبێت، چونکە ئێستا ئەو بیرکردنەوە هەیە کە متمانە بە بانک نەماوە و خەڵکی مامەڵەی دارایی لەگەڵ ناکەن، و نایانەوێت پارەکانیان لەناو ئەو بانکانەدا بمێنێتەوە و کار و مامەڵەی پێوە بکرێت، باشترین بەڵگەش ئەو واقیعەی ئێستایە کە وڵاتی پێدا دەگوزەرێت، بەتایبەت لە پاش ئەو دابەزین و بەرزبونەوەی نرخی دراوەکانە لە وڵاتدا، کەواتە لەمەودوا وادەخوازێت تاک بۆ گەیشتن بە جێبەجێکردنی پرۆژەکانیان و بەدەستهێنانی وەبەرهێنان

و کارکردن لە پرۆژەی بچووک و نزیک مەودا هەوڵی گرێبەست بدرێت بەوشێواز و جۆرانەی کە لەڕووی شەرعییەوە دروستە، هەروەها لەگەڵ بانکە ئیسلامییە دروست و شەرعییەکاندا مامەڵ ئەنجامبدەن لەسەر ئەحکام بنەماکانی شەریعەتی ئیسلامی، چونکە ڕیسک و مەترسییەکان لەو جۆرە بانکانەدا کەمترە و متمانەی زیاتریشیان هەیە.

هەموو ئەوانەی کە باسمان کرد پێویستی بە بەدواداچوونی واقیعیی و یاسایی و شەرعی هەیە، پێویستیشە دیراسەیەکی وردی زانستییانە ئەنجام بدرێت بۆ هەر بانکێک کە هەڵگری ناوی بانکی ئیسلامی بێت، لەگەڵ ئەمانەشدا پێویستە تاک هۆشیار و بەئاگابێت و بزانێت چۆن و کەی و بۆچی کار و مامەڵە لەگەڵ ئەو بانکانە بکات کە بەناوی بانکی ئیسلامییەوە کاردەکەن نەوەک ئەو بانکانەش چەواشەکاریی و فێڵ و درۆ بکەن و سەوداکاران و مامەڵەکاران تووشی هەڵە و گرفتی یاسایی و شەرعی بکەنەوە، دواجاریش لەبری قازانج تووشی خراپە و زەرەر ببن.

بەکورتی، ئەوەی کە باسکرا سەرەتایەک بوو بۆ چوونە نێو تێگەشتن و ناسین و مێژوو مامەڵە و کارەکانی بانکی ئیسلامی بەشێوەیەکی گشتگیر و فراوان تاوەکو تێبگەین چۆن مامەڵە و کاروچالاکیمان ڕێکدەخەین و ئەنجامی دەدەین، ئەمانە و چەندین پرسیاری دیکە هەیە لای تاک و کۆمەڵگە بەگشتی لەبارەی مامەڵە داراییە هاوچەرخەکانەوە و بەتایبەتتر ئەو مامەڵە و گرێبەستانەی کە بانکە ئیسلامییەکان دەیکەن، بۆیە بەلامانەوە گرنگە و زەروریە وەڵامی ئەو پرسیار و ئاریشانە بدەینەوە لە بەشەکانی دیکەی بابەتەکانماندا وەک:

بانکی ئیسلامی چییە؟ بنەما و ئامانج و خەسڵەتەکانی چین؟ بە چ شێوازێک مامەڵە دەکەن؟ ئایا گرێبەستیان هەیە؟ لەڕووی شەرعییەوە دروستە مامەڵەیان لەگەڵ بکرێت؟ ئایا ئەم بانکانە سوو دەخۆن؟ ئەمانە و چەندین پرسیاری دیکەی کۆنکرێتی هەن لەوبارەوە کە پێویستە بەهەند وەرگیرێن وەڵامبدرێنەوە.

## سەرچاوەکان


- پاش قورئانی پیرۆز.
- أحمد،هاشم عمر: الضوابط الشرعية للعقود المصرفية الإسلامية- دراسة مقارنة مقاصدية، أطروحة دكتوراه غير منشورة، ٢٠١٤.
- الأنصاري،د.محمود وآخرون: البنوك الإسلامية،كتاب الأهرام الاقتصادي- يصدر عن مؤسسة الأهرام، مطابع الأهرام التجارية، القاهرة، ١٩٨٨م.
- نعمة،د.نغم حسين وآخرون: المصارف و المؤسسات المالية الإسلامية في دول مجلس التعاون الخليجي: الواقع و التحديات، بحث منشور في مجلة القادسية للعلوم الإدارية و الاقتصادية، مجلد ١٢، العدد ٢، ٢٠١٠.



# ئابووری

## بیبلیۆگرافیا و پێڕستی لە پڕۆژەی (کورد و کوردستان- بیبلیۆگرافیا و پێڕستیان لە کتێبی کوردیدا ١٩٢٠- ٢٠١٠)

**ئامادەکردن: بوار نوورەدین**

ئەم بیبلیۆگرافیا تایبەتییە، کەڵکی لە پرۆژەی بیبلیۆگرافیا کورد و کوردستان وەرگرتووە، کە ٥٦٨٠ کتێبی تێدا ناسێنراوە و لە ٥٢٠٦ لاپەڕە پێکهاتووە و بەسەر ١٢ بەرگ و بەشدا دابەشکراون، تایبەت کراوە بەو کتێبانەی لە نێوان ساڵانی ١٩٢٠- ٢٠١٠دا، لەبارەی «کورد و کوردستان»ەوە نووسراون، کتێبی نووسراوی بە هیچ زمانێکی تر لەخۆنەگرتووە.

کتێبەکان بە دوو ئاڕاستە خراونەتەڕوو، باری «ناسنامە»ی کتێبەکان: ناوی نووسەر، وەرگێڕ –ئەگەر هەبوو-، دەزگای چاپ، چاپخانە، نۆبەتی چاپ، شوێنی چاپ، ساڵ، ژمارەی لاپەڕە و پێوانە. دووەم ئاڕاستە، جگە لە ناونیشانی کتێبەکە، ناوەڕۆکی کتێبەکان نووسراونەتەوە، بۆئەوەی (لێکۆڵەر، خوێنەر، بەکاربەر) بزانێ کتێبەکە باسی چی دەکات.

لەم بیبلیۆگرافیایەدا، هەروەک تەواوی پرۆژەکە، کتێبەکان بە پێی ساڵ و لە هەر ساڵێکیشدا، بە پێی «تیپ»ەکانی زمانی کوردی ڕیزکراون، ناونیشانی کتێبەکانیش، وەک خۆیان نووسراونەتەوە.

**کورتکراوەکان:**

پ.: پێوانە (بە سانتیمەتر و «پانی»ی پێش «درێژی»ی نووسراوە)

چاپ.: نۆبەتی چاپ

چ.: چاپخانە

ژ.: ژمارە

ژ.س.: ژمارەی سپاردن

ز.: زانکۆ

س.: ساڵ

ش.: شوێن

کۆڕ.: چاپخانەی کۆڕی زانیاریی کورد

ل.: لاپەڕە

و.: وەزارەت

ی.ن.ک.: یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان

؟: بۆ هەر زانیارییەکی نەزانراو و نادیار دانراوە

ISBN: International Standard Book Number ژمارەی جێگیری نێودەوڵەتیی کتێب

## تەوەرەی دووەم: پێڕستی (ئابووری) لە ناوەڕۆکی کتێبی کوردیدا ١٩٥٨- ٢٠١٠

### بەشی دووەم: کتێبی ساڵانی ٢٠٠٢- ٢٠٠٦

**١- ئەنفالی گەرمیان- ڕەهەندە دیمۆگرافی، ئابوری و کۆمەڵایەتی یەکانی- لێکۆڵینەوەیەکی مەیدانی یە لە ئۆردوگای (ڕزگاری)دا**

نووسین: ناهیدە جەمال تاڵەبانی- جاسم محەمەد محەمەد عەلی

بڵاوکراوەی وەزارەتی ڕۆشنبیری- بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی چاپ و بڵاوکردنەوەی سلێمانی

چاپ.: یەکەم، چ.: وشە، ش.: سلێمانی، ژ.س.: ؟، س.: ٢٠٠٢، ل.:١٤٣، پ.:١٦×٢٢

ناوەڕۆک: باسی دووەم: ڕەوشی دیمۆگرافی/ باسی سێیەم: ڕەوشی ئابووری.

**٢- ئەنفالی گەرمیان- لێکۆڵینەوەیەک لە هۆکارەکانی زۆریی بێ سەر و شوێنکردنی خەڵکی گەرمیان**

نووسین: جاسم محەمەد محەمەد عەلی

چاپ: یەکەم، چ: زانست، ش: سلێمانی، ژ.س: ؟، س: ٢٠٠٢، ل:٧٩، پ:١٤×٢٠

ناوەرۆک: هۆکاری بەرز و نزمی زەوی- تۆبۆگرافیا/ هۆکاری ئابووری.

**٣- بزاڤا سیاسی ل کوردستانێ ١٩٠٨- ١٩٢٧**

نووسین: عەلی تەتەر

بڵاوکراوەی دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی سپیرێز

چاپ: یەکەم، چ: و. پەروەردە، ش: هەولێر، ژ.س: ٤٧٠، س: ٢٠٠٢، ل:٣٩٧، پ:١٧×٢٣

ناوەرۆک: دەروازە: کاودانی کۆمەڵایەتی- ئابووری- کەلتووری و سیاسیێ کوردستانێ پێش شۆڕەشا مەشرۆتێ ١٩٠٨.

**٤- پرۆگرام و پێڕەوی ناوخۆی یەکێتی نیشتمانی کوردستان**

ئامادەکردن و بڵاوکردنەوە: مەکتەب ڕێکخستن- بەشی ڕووناکبیریی (ی.ن.ک.)

لە چاپدانەوەی لە لایەن مەڵبەندی ڕێکخستنی یەکی سلێمانیی (ی.ن.ک.)

چاپ: ؟، چ: ؟، ش: سلێمانی، ژ.س: ؟، س: ٢٠٠٢، ل:٣٨، پ:١٠×١٧

ناوەرۆک: ئامانجە ئابوورییەکان.

**٥- تورکمان: کوردی تورکزمان- ئەم پەرتووکە هۆشدارنامەیەکە بۆ بە ئاگا هێنانەوەی خەڵکانێک، کە ڕاستیی ڕەسەنی نەتەوایەتیی خۆیان لێوونبووە- بەرگی یەکەم**

نووسین: ئیماد شێخانی

بڵاوکراوەی پرۆژەی کوردنامە

چاپ: یەکەم، چ: ؟، ش: سوێد، ژ.س: ٤٧٤، س: ٢٠٠٢، ل:١١٢، پ:١٦×٢١

ناوەرۆک: کۆڵۆنیالیستی تورک و دادۆشینی ئابووریی کوردستان.

تێبینی: کۆدی ISBN: ٩٥٢-٩٨-٣٥٨١-٨ وەرگرتووە.

**٦- ڕۆژنامەنووسیی کوردی سەردەمی کۆماری دیمۆکراتی کوردستان ١٩٤٢- ١٩٤٧**

نووسین: د.هیمداد حسێن

بڵاوکراوەی دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم

چاپ: یەکەم، چ: سەردەم، ش: سلێمانی، ژ.س: ٣٣٨، س: ٢٠٠٢، ل:٣٤٨، پ:١٦×٢١

ناوەرۆک: فەسڵی یەکەم: مێژووی ئابووری و سەربازی و پەروەردە و فەرهەنگی و





دیموکراسی کوردستانی ڕۆژهەڵات ١٩٤٢- ١٩٤٧.
تێبینی: لەم چاپەدا ١٩٤٢ و لە چاپی دووەمدا ١٩٤٣ نووسراوە؟ بۆ زانیاریی زۆرتر بڕوانە بەشی یەکەم کتێبی ژمارە ٣٨.

**٧- ڕەنگدانەوەی ئەدەب لە گۆڤاری هاواردا ١٩٣٢- ١٩٤٣**
نووسین: عەبدولسەمەد ئیسلام تەها
بڵاوکراوەی دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس
چاپ.: یەکەم، چ.: و. پەروەردە، ش.: هەولێر، ژ.س.: ٣٢٠، س.: ٢٠٠٢، ل.:١٦٨، پ.:١٦×٢٣
ناوەرۆک: بەشی یەکەم: بارودۆخی سیاسی و ئابووری و ڕۆشنبیریی کوردستان لە دوای شەڕی یەکەمی جیهانییەوە تا سەردەمی گۆڤاری هاوار/ شۆڕشی دێرسیم- باری ئابووری.

**٨- سلێمانی شارە گەشاوەکەم- بەرگی چوارەم**
نووسین: جەمال بابان
بڵاوکراوەی دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم
چاپ.: یەکەم، چ.: سەردەم، ش.: سلێمانی، ژ.س.: ٤٣، س.: ٢٠٠٢، ل.:٣٦٩، پ.:١٧×٢٤
ناوەرۆک: مێژووی کاروباری ئابووری و ڕامیاری لە سلێمانیدا.

**٩- شۆڕشی شێخ سەعیدی پیران و سۆڤیەت**
نووسین: د.ئەفراسیاو هەورامی
پێداچوونەوە: حەسەن عەبدولکەریم
بڵاوکراوەی دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم
چاپ.: یەکەم، چ.: سەردەم، ش.: سلێمانی، ژ.س.: ٣٩٨، س.: ٢٠٠٢، ل.:٢٠٦، پ.:١٥×٢٢
ناوەرۆک: باری جوگرافی و ئابووری و ئیتنوگرافی ناوچەی ڕاپەڕین.

**١٠- کوردستانی ئێران- لێکۆڵینەوەیەکی مێژوویی لە جوڵانەوەی ڕزگاریخوازی نەتەوەی گەلی کورد (١٩٣٩- ١٩٧٩)**
نووسین: د.یاسین سەردەشتی
بڵاوکراوەی دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم
چاپ.: یەکەم، چ.: سەردەم، ش.: سلێمانی، ژ.س.: ٥١٠، س.: ٢٠٠٢، ل.:٤٨٣، پ.:٢٠×٢٨
ناوەرۆک: دووەم: بارودۆخی ئابووری و کۆمەڵایەتیی ڕۆشنبیریی کوردستانی ئێران.

**١١- كوردستان و پرۆسەی بە ئیسلام کردنی کورد- لێکۆڵینەوەیەکی مێژوویی سیاسی** یە
نووسین: شوان عوسمان مستەفا
لە بڵاوکراوەکانی سەنتەری چاپ و پەخشی تەما
چاپ: یەکەم، چ: تەما، ش: سلێمانی، ژ.س: ٣٩٦، س: ٢٠٠٢، ل:٣٤٠، پ:١٦×٢٢
ناوەرۆک: ئەنجامە ئابوورییەکان.

**١٢- کورد لە پارێزگای مووسڵ**
نووسین: خەسرۆ گۆران
بڵاوکراوەی دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس
چاپ: یەکەم، چ: و. پەروەردە، ش: هەولێر، ژ.س: ٣٨١، س: ٢٠٠٢، ل:٢١٤، پ:١٦×٢٣
ناوەرۆک: بەشی پێنجەم: کەناری ڕۆژئاوای ڕووباری دیجلە/ قەزای تەلەعفەر/ گرینگی ئابووریی قەزای تەلەعفەر و سیاسەتی بەعەرەبکردنی.

**١٣- کوردستان لە ساڵی ٢٠٠١دا**
ئامادەکردن: بەدران ئەحمەد و هەڵمەت حەمید
بڵاوکراوەی دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس
چاپ: یەکەم، چ: و. پەروەردە، ش: هەولێر، ژ.س: ١٣٦، س: ٢٠٠٢، ل:٣٣٤، پ:٢٠×٢٧
ناوەرۆک: لە بواری دارایی- ئابووریدا/ باری تەرخانکراوی دارایی/ ڕاپۆرتی وەزیری دارایی و ئابووری.

**١٤- کورد و کەرکوک- کورتە خوێندنەوەیەکی دیرۆکییانەی کەرکوک- بەرگی یەکەم**
نووسین: لەتیف فاتیح فەرەج
بڵاوکراوەی دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم
چاپ: ؟، چ: سەردەم، ش: سلێمانی، ژ.س: ٤٤، س: ٢٠٠٢، ل:١٩٠، پ:١٧×٢٤
ناوەرۆک: بەشی دووەم: نەوتی کەرکووک/ نەوت و ئابووریی عیراق و شەڕی کورد.

**١٥- کۆمەڵگا لە سایەی دەوڵەتی خەلافەتدا**
نووسین: فوئاد مەجید میسری
چاپ: دووەم، چ: ؟، ش: سلێمانی، ژ.س: ٣٤، س: ٢٠٠٢ ، ل:٤٩١، پ:١٦×٢٢
ناوەرۆک: پێشەکیی چاپی دووەم/ هەمان ناوەرۆکی چاپی یەکەمی هەیە، بڕوانە بەشی یەکەم کتێبی ژمارە ٣٤.

**١٦- مێژووی شاری هەولێر لە کۆنەوە تا ساڵانی شەست**

نووسین: یووسف ئەحمەد دەرگەڵەیی

لە بڵاوکراوەکانی دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم

چاپ.: یەکەم، چ.: سەردەم، ش.: سلێمانی، ژ.س.: ٤٢، س.: ٢٠٠٢، ل.:١٨٦، پ.:١٥×٢٠

ناوەرۆک: باری ئابووری.

**١٧- یەکێتیی نیشتمانی ی کوردستان ١٩٧٥- ١٩٧٦ دامەزراندن و دەستپێکردنەوەی** شۆڕش

نووسین: سەروەر عەبدولڕەحمان عومەر

چاپ.: یەکەم، چ.: تەما، ش.: سلێمانی، ژ.س.: ؟، س.: ٢٠٠٢، ل.:٣٥٤، پ.:١٦×٢٢

ناوەرۆک: بەشی یەکەم: بارودۆخی سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتیی باشووری کوردستان لە ساڵی ١٩٧٥دا.

**١٨- بەرهەم هێنانی گەنم لە هەرێمی کوردستاندا (١٩٨٩- ١٩٩٨) پارێزگای سلێمانی وەک نمونەی پراکتیزەکردن**

نووسین: مەحموود کەریم ئەحمەد

بڵاوکراوەی سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیجیی کوردستان

چاپ.: ؟، چ.: ؟، ش.: سلێمانی، ژ.س.: ١٩٧، س.: ٢٠٠٣، ل.:١٧٦، پ.:١٦×٢١

ناوەرۆک: بەشی سێیەم: تاووتوێکردنی قازانجی ئابووری و هەڵسەنگاندنی کارایی بەرهەمهێنانی گەنم لە پارێزگای سلێمانی لە وەرزی کشتوکاڵی ١٩٩٧-١٩٩٨دا.

**١٩- پرۆگرام و پێڕەوی ناوخۆی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان- پەسەندکراوی دووەمین کۆنگرەی گشتی- سلێمانی ١/٣٠- ٢٠٠١/٢/٥**

ئامادەکردن و بڵاوکردنەوە: مەکتەبی بیر و هۆشیاریی (ی.ن.ک.)

چاپ.: ؟، چ.: ؟، ش.: سلێمانی، ژ.س.: ؟، س.: ٢٠٠٣، ل.:٤٠، پ.:١٢×١٧

ناوەرۆک: ئامانجە ئابوورییەکان.

**٢٠- پەیامی هەورامان- کورد: ڕەوپێکردنی، سەرەداوی مێژوویی.. کوردستان: سنووری، دابەشکردنی.. گۆران و هەورامان: مێژووی، جوگرافیای، زمانی. ئەردەڵان و بابان: سەرەتا، سەجەرە، سنوور.. دین: زەردەشت، یارسان، ئیسلام..**

نووسین: هادی ڕەشید بەهمەنی

چاپ.: دووەم، چ.: بەدرخان، ش.: سلێمانی، ژ.س.: ٢٣٥، س.: ٢٠٠٣، ل.:٤٨٠، پ.:١٦×٢٢

ناوەرۆک: ئابووری. تێبینی: ناوەرۆکی چاپی یەکەم کورتترە، لەبەر ئەمە ناوەرۆکی ئەم چاپەشمان نووسییەوە.

**٢١- خەرمان- شارا- تۆماری تەمەن- ئەرشیف ٣**

نووسین: کەریم زەند

چاپ: یەکەم، چ: ئەزمەڕ، ش: سلێمانی، ژ.س: ١٧٥، س: ٢٠٠٣، ل: ٦٢٠، پ: ١٧×٢٤

ناوەرۆک: ئابووریی سیاسی- جوگرافیا: چەند بابەتێک بە زمانی عەرەبی.

**٢٢- ڕەشەبای ژەهر و ئەنفال- بەرگی دووەم**

نووسین: عەبدوڵلا کەریم مەحموود

بڵاوکراوەی وەزارەتی ڕۆشنبیری- بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی چاپ و بڵاوکردنەوەی سلێمانی

چاپ: یەکەم، چ: ؟، ش: سلێمانی، ژ.س: ١٨٦، س: ٢٠٠٣، ل: ١٢٠٢، پ: ٢١×٢٩

ناوەرۆک: جینۆسایدی ئابووری.

**٢٣- سیمای شیعری کوردی دوای ڕاپەڕین ١٩٩٢- ٢٠٠٢ بەنموونەی شیعرەکانی ڕۆژنامەی (کوردستانی نوێ)وە**

نووسین: د.ئەرسەلان باییز

بڵاوکراوەی دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم

چاپ: یەکەم، چ: سەردەم، ش: سلێمانی، ژ.س: ٣٨٠، س: ٢٠٠٣، ل: ٢٢٢، پ: ١٦×٢٢

ناوەرۆک: بەشی یەکەم: باری سیاسی و ئابووری و ڕووناکبیری و کۆمەڵایەتی لە ماوەی ئەم باسەدا.

**٢٤- مێژووی ئەدەبی کوردی- بەرگی سێیەم/ ئەم بەرهەمە هێنانەدی پرۆژەی نووسینەوەی مێژووی ئەدەبی کوردییە لە سەرەتاوە تا ناوەڕاستی سەدەی بیستەم**

نووسین: د.مارف خەزنەدار

بڵاوکراوەی دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس

چاپ: یەکەم، چ: و-پەروەردە، ش: هەولێر، ژ.س: ٢٨٢، س: ٢٠٠٣، ل: ٤٤٠، پ: ١٧×٢٤

ناوەرۆک: پێشەکی/ بەشی یەکەم: نەخشەی جوگرافیی کوردستانی باشوور و میرنشینی بابان/ بەشی دووەم: ژیانی ئابووری- کۆمەڵایەتی- ڕۆشنبیری- خوێندەواریی میرنشین/ ژیانی ئابووری- کۆمەڵایەتی.

**٢٥- مێژووی بروسکە (مێژووی کوردستان)**

نووسین: ئیسماعیل ئەییوبی (سمکۆ ئەپرام)

بڵاوکراوەی (انتشارات تابش فرهنگ)

چاپ: یەکەم، چ: گنج شایگان، ش: ئێران، ISBN: ٩٦٤-٧٩٥٩-٠٧-٩، س: ١٣٨٢ (٢٠٠٣)، ل: ٢٥٢، پ: ١٧×٢٤

ناوەرۆک: ئابووری/ ئابووری.




**٢٦- نرکەی قەرەداغ- چەند لاپەڕەیەک لە تێکۆشان و سەروەرییەکانی خەڵکی قەرەداغ**

نووسین: ئەکرەم حەمە ئەحمەد

بڵاوکراوەی مەکتەبی بیر و هۆشیاریی (ی.ن.ک.)

چاپ.: یەکەم، چ.: ؟، ش.: سلێمانی، ژ.س.: ؟، س.: ٢٠٠٣، ل.:٢٢٠، پ.:١٥×٢٠

ناوەرۆک: لایەنی ئابووریی قەرەداغ.

**٢٧- ئەڤەیە بامەرنێ!**

نووسین: مستەفا نووری بامەرنی

چاپ.: ؟، چ.: زانا، ش.: دهۆک، ژ.س.: ١٤٨، س.: ٢٠٠٤، ل.:٣٣٨، پ.:١٧×٢٤

ناوەرۆک:  ڕەوشا ئابووری.

**٢٨- بابەتەکانی یەکەمین کۆنفرانسی زانستی نێودەوڵەتی بۆ نۆژەنکردنەوەی قەڵاتی هەولێر**

The First International Scientific Conference

المؤتمر العلمي الدولي الأول لأعمار قلعة هەولير (أربيل)

ئامادەکردن و بڵاوکردنەوە: وەزارەتی ڕۆشنبیری- بەڕێوەبەرایەتیی گەشتوگوزار

چاپ.: یەکەم، چ.: و-ڕۆشنبیری، ش.: هەولێر، ژ.س.: ٥٩٩، س.: ٢٠٠٤، ل.:١٣٦+٤٧، پ.:٢٢×٣٢

ناوەرۆک: قەڵای هەولێر سومبولی ڕەسەنایەتی و زەمینەی گەشت و گوزار و ئابووری: نەسرەت سابیر شێخە خۆشناو.

**٢٩- تاڤگەی هەڤیقەت- بەشێک لە بەرهەمەکانی دوکتور قاسملوو- بەرگی یەکەم**

نووسین: د.عەبدولڕەحمان قاسملوو

کۆکردنەوە: کاوە بەهرامی

چاپ.: ؟، چ.: ؟، ش.: سلێمانی، ژ.س.: ؟، س.: ١٣٨٣ (٢٠٠٤)، ل.:٣٨٦، پ.:١٦×٢٢

ناوەرۆک: فەسڵی دووەم: ئابووریی سیاسی/ چەمکە گشتییەکان/ ئابووریی سەرمایەداری/ سۆسیالیزم و ئابووریی سۆسیالیستی/ ئابووریی تێکەڵاو.

**٣٠- سەربوردێکی هەورامان و سەردانێکی تەوێڵە**

نووسین: عەبدولڕەزاق عەبدولڕەحمان محەمەد

بڵاوکراوەی نەشری ئیحسان

چاپ.: یەکەم، چ.: مەهارات، ش.: تاران، ژ.س.: ISBN: ٩٦٤-٣٥٦-٤٢٦-٦، س.: ٢٠٠٤، ل.:١٣٤٧، پ.:١٧×٢٤

ناوەرۆک: ئابووریی هەورامان/ تەوێڵە لە ڕووی ئابووری و گوزەرانەوە.

**٣١- کورد گەلی مەینەتییەکان- ڕەوشی دیمۆگرافی ئابوری و کۆمەڵایەتی کوردەکانی لوبنان**

نووسین: سەلاح عیسام ئەبوشەقرا

وەرگێڕانی لە ؟: جاسم محەمەد محەمەد عەلی

بڵاوکراوەی خانەی وەرگێڕان

چاپ: ؟، چ: ڕوون، ش: سلێمانی، ژ.س: ٦٢٥، س: ٢٠٠٤، ل: ١٩٠، پ: ١٤×٢٠

ناوەرۆک: بەشی سێیەم: لێکۆڵینەوەی دیمۆگرافی (دانیشتوان)/ بەشی چوارەم: ڕەوشی ئابووری.

تێبینی: ساڵی لەسەر نییە و بە پێی لیستی بڵاوکراوەکانی خانەی وەرگێڕان، لەم ساڵەدا دانراوە.

**٣٢- کوردستان لە سەردەمی دەوڵەتی عوسمانی دا- لە ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەهەمەوە تا جەنگی یەکەمی جیهانی (لێکۆڵینەوەیەک لە بواری مێژووی سیاسیدا)**

نووسین: د.عەبدوڵڵا عەلیاوەیی

بڵاوکراوەی سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیجی کوردستان

چاپ: دووەم، چ: ئاوێر، ش: هەولێر، ژ.س: ٤٣٢، س: ٢٠٠٤، ل: ١٩٨، پ: ١٦×٢٣

ناوەرۆک: پێکهاتەی دانیشتوان و ژیانی ئابووری لە کوردستاندا.

**٣٣- مانیزم- لێکۆڵینەوەیەکی (مێژوویی ئاینی)یە**

نووسین: کەیوان ئازاد ئەنوەر

بڵاوکراوەی سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیجی کوردستان

چاپ: یەکەم؟، چ: ؟، ش: سلێمانی، ژ.س: ١٨٩، س: ٢٠٠٤، ل: ٤٢٢، پ: ١٧×٢٤

ناوەرۆک: بەشی یەکەم: بارودۆخی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست بەر لە دەرکەوتنی مانیزم/ بارودۆخی ئابووری.

**٣٤- مێژووی بەردەڕەش لە نێوان دوێنێ و ئەمڕۆدا- بەرگی یەکەم**

نووسین: سەعید مەموزینی

بڵاوکراوەی گۆڤاری خازر

چاپ: یەکەم، چ: منارە، ش: هەولێر، ژ.س: ٤٥٣، س: ٢٠٠٤، ل: ١٣٤، پ: ١٦×٢٣

ناوەرۆک: ئابووریی دەڤەری بەردەڕەش/ ئێدیەمەکانی ئابووریی دەڤەری بەردەڕەش.

**٣٥- هاونەتەوەیی قەومی کورد و ماد- بەرگی یەکەم**
نووسین: حەبیبوڵڵای تابانی
وەرگێڕانی لە زمانی فارسییەوە: جەلیل گادانی
بڵاوکراوەی بەڕێوەبەرایەتیی خانەی وەرگێڕان
چاپ.: یەکەم، چ.: تیشک، ش.: سلێمانی، ژ.س.: ٢٥٣، س.: ٢٠٠٤، ل.:٣٢٢، پ.:١٦×٢٢
ناوەرۆک: ڕێکخستنی ئیداری و دۆخی ئابووریی مادەکان.

**٣٦- باری ئەدەبی کوردی لە شاری هەولێر- لە نێوان ساڵانی ١٩٣٥- ١٩٥٨**
نووسین: گۆران سۆران فەیزی
بڵاوکراوەی دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس
چاپ.: یەکەم، چ.: و-پەروەردە، ش.: هەولێر، ژ.س.: ٢٢٣، س.: ٢٠٠٥، ل.:٢٣٢، پ.:١٧×٢٤
ناوەرۆک: بەشی یەکەم: باری سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئابووری و ڕۆشنبیریی شاری هەولێر لە نێوان ساڵانی ١٩٣٥- ١٩٥٨/ باسی دووەم: باری ئابووری و کۆمەڵایەتیی شاری هەولێر لە نێوان ساڵانی ١٩٣٥-١٩٥٨.

**٣٧- باشووری کوردستان لە نێوان دوو هەڵبژاردندا ١٩٩٢- ٢٠٠٥**
نووسین: حامید گەوهەری
چاپ.: یەکەم، چ.: بڵاوکراوەی کاوە، ش.: سوید- ستۆکهۆڵم، ISBN:٩١-٦٣١-١٨٨٩-٠، س.: ٢٠٠٥، ل.:٦٤٢، پ.:١٥×٢١
ناوەرۆک: فەسڵی دوانزەیەم: ڕووداوەکانی ساڵی ٢٠٠٣ – هەندێ بابەتی وەک: قەیرانی ئابووری و دارایی لە هەرێمی کوردستاندا.
تێبینی: ساڵی لەسەر نییە و بە پێی ناونیشانی کتێبەکە، لەم ساڵەدا دانراوە.

**٣٨- پرادیگمای ژن**
نووسین: ماردین جەلال
بڵاوکراوەی وەزارەتی ڕۆشنبیری- بەڕێوەبەرێتیی گشتیی چاپ و بڵاوکردنەوە
چاپ.: یەکەم، چ.: تیشک، ش.: سلێمانی، ژ.س.: ٤٢٧، س.: ٢٠٠٥، ل.:٢٣٠، پ.:١٥×٢٠
ناوەرۆک: خێزان- ئابووری- یاسا لە ئێران و ڕۆژهەڵاتی کوردستاندا.

**٣٩- پێشهاتە سیاسییەکانی کوردستانی عیراق ١٩٤٥- ١٩٥٨**

نووسین: مەهدی محەمەد قادر

بڵاوکراوەی سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیجیی کوردستان

چاپ: ؟، چ: ؟، ش: سلێمانی، ژ.س: ٤١٢، س: ٢٠٠٥، ل: ٤٧٠، پ: ١٤×٢٠

ناوەرۆک: دەروازە- بارودۆخی کۆمەڵایەتی و ئابووریی سیاسی.

**٤٠- دەستورە عێراقییەکان و لێکۆڵینەوەیەکی بەراوردکاریی بە پێی پێوەرەکانی مافە دەستورییە نێودەوڵەتییەکان**

ئامادەکردن و بڵاوکردنەوە: پەیمانگای نێودەوڵەتی یاساکانی مافی مرۆڤ- کۆلێژی یاسای زانکۆی دیپۆڵ

چاپ: یەکەم، چ: بینایی، ش: سلێمانی، ژ.س: ؟، س: ٢٠٠٥، ل: ٢٦٨، پ: ٢٠×٢٧

ناوەرۆک: دووەم: مافە ئابوورییەکان.

**٤١- رۆژهەڵاتی کوردستان لە بەڵگەنامەکانی وەزارەتی دەرەوەی بریتانیادا (وەرگێڕاوی کوردی ١٣٠ بەڵگەنامە)**

وەرگێڕانی لە زمانی ئینگلیزییەوە: ئەنوەر سوڵتانی

بڵاوکراوەی بنکەی ژین

چاپ: یەکەم، چ: شڤان، ش: سلێمانی، ژ.س: ٩٠٥، س: ٢٠٠٥، ل: ٤٦٢، پ: ١٦×٢٢

ناوەرۆک: بابەتی جۆربەجۆری ئابووری، سیاسی و کۆمەڵایەتیی ناوچەی ئازربایجانی رۆژهەڵات و رۆژئاوا تا شاری بۆکان یان گرتۆتەبەر).

**٤٢- رۆژنامەی برایەتی- برایەتی (١٩٦٧- ١٩٧٤) رۆڵی لە پێشخستنی ئەدەب و رۆشنبیریی کوردیدا**

نووسین: ئاریان ئیبراهیم

بڵاوکراوەی وەزارەتی رۆشنبیری- بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی چاپ و رۆژنامەگەری و دابەشکردن و بڵاوکردنەوە

چاپ: یەکەم، چ: و-رۆشنبیری، ش: هەولێر، ژ.س: ٦٥٦، س: ٢٠٠٥، ل: ٥٧٠، پ: ١٦×٢٣

ناوەرۆک: بەشی یەکەم: بارودۆخی سیاسی- کۆمەڵایەتی- ئابووری و رۆشنبیریی کوردستانی عیراق (١٤ی تەمووزی ١٩٥٨- ١١ی تا ئازاری ١٩٧٤).

**٤٣- رەدووکەوتن لە کەلتووری کوردیدا**

نووسین: بوار نوورەدین

بڵاوکراوەی ئنستیتیوتی کەلەپووری کورد- لەسەر ئەرکی بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی چاپ و بڵاوکردنەوەی سلێمانی و هاوکاریی رێکخراوی نەرویجی N.P.A. چاپکراوە

چاپ: یەکەم، چ: شڤان، ش: سلێمانی، ژ.س: ٥٦٦، س: ٢٠٠٥، ل: ٤٠٢، پ: ١٧×٢٤

ناوەرۆک هۆکاری چوارەم: ئابووری (چینایەتی)/ تەوەری سێیەم: ئاکامەکان- کێشەی ئابووری.

**٤٤- فیمینستناسی و جڤاکی کوردی- لێکۆڵینەوەیەکی هەمەلایەنە و تیۆرییەکی فیمینستیانەی گونجاوە بە ژنی کورد**

نووسین: کازیوە ساڵح

بڵاوکراوەی دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس

چاپ: یەکەم، چ: و–پەروەردە، ش: هەولێر، ژ.س: ٢٠٦، س: ٢٠٠٥، ل:٢٠٠، پ:٢١×١٥

ناوەرۆک: کاریگەریی ئابووری و ژنانی فیمینست.

**٤٥- کوردستانی هاوچەرخ**

نووسین: چەند نووسەرێک

وەرگێڕانی لە زمانی ڕووسییەوە بۆ زمانی فارسی: کامەران ئەمین ئاوە

وەرگێڕانی لە زمانی فارسییەوە: گوشاد حەمەسەعید

بڵاوکراوەی دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس

چاپ: یەکەم، چ: و. پەروەردە، ش: هەولێر، ژ.س: ٢٢٢، س: ٢٠٠٥، ل:١٥٢، پ:٢١×١٤

ناوەرۆک: هۆکاری نەتەوەیی و دانیشتوان/ هۆکاری کۆمەڵایەتی و ئابووری.

**٤٦- کەلار لە لادێوە بۆ شار- گەشەکردنی شاری کەلار- کێشە و دەرەنجامەکانی**

نووسین: جاسم محەمەد محەمەد عەلی

بڵاوکراوەی مەکتەبی بیر و هۆشیاریی (ی.ن.ک)

چاپ: ؟، چ: ؟، ش: سلێمانی، ژ.س: ٩٠٠، س: ٢٠٠٥، ل:٥٧، پ:٢٠×١٥

ناوەرۆک: بەشی چوارەم: قەیرانەکانی گەشەکردنی و فراوانبوونی شاری کەلار/ باسی دووەم: کێشە کۆمەڵایەتی و ئابوورییەکان.

**٤٧- ناوچەی پێنجوین لە ئاوێنەی ڕۆژگاردا**

نووسین: ئەحمەد عەلی پێنجوێنی (مەلا ئەحمەدی کادیریان)

بڵاوکراوەی وەزارەتی ڕۆشنبیری- بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی چاپ و بڵاوکردنەوەی سلێمانی

چاپ: یەکەم، چ: شڤان، ش: سلێمانی، ژ.س: ٢٣٩، س: ٢٠٠٥، ل:٢٨٨، پ:٢٠×١٤

ناوەرۆک: پێنجوین لەڕووی ئاوەدانی و ئابوورییەوە/ ناوچەی پێنجوین لە نێوان ساڵانی ١٩٤٥- ١٩٥٨دا کورتەیەک لەبارەی ئابووریی ناوچەی پێنجوێن/ کورتەیەک لە مێژووی باری ئابووریی ناوچەی پێنجوین.

**٤٨- هۆنراوەی بەرگری لە بەرهەمی چەند شاعیرێکی کرمانجی سەروودا ١٩٣٩- ١٩٧٠**

نووسین: د.عەبدوڵلا یاسین عەلی ئامێدی

بڵاوکراوەی کۆڕی زانیاریی کوردستان

چاپ: یەکەم، چ: و. پەروەردە، ش: هەولێر، ژ.س: ٦٠٢، س: ٢٠٠٥، ل: ٣٢٠، پ: ١٦×٢٣

ناوەرۆک: بەشی دووەم: مێژووی کوردستانی سەروو لە نێوان ساڵانی ١٩٣٩- ١٩٧٠دا/ مێژووی کوردستانی سەروو لەڕووی ئابوورییەوە.

**٤٩- وەبەرهێنانی نیشتەجێبون لە کوردستان- قەیران و ئاسۆکانی چارەسەر- الأستثمار السكني في كوردستان- الأزمة وآفاق الحلول**

نووسین: محەمەد کەریم محەمەد

وەرگێڕانی لە زمانی عەرەبییەوە: سەلام کەریم

بڵاوکراوەی دەزگای هاندانی وەبەرهێنان

چاپ: یەکەم، چ: ؟، ش: ؟، ژ.س: ٧٦٤، س: ٢٠٠٥، ل: ١٤٧، پ: ١٤×٢٠

ناوەرۆک: کارتێکەری ئابووری.

**٥٠- پرۆژەی دەستووری هەرێمی کوردستان- عێراق**

ئامادەکردن و وەرگێڕانی لە زمانی عەرەبییەوە: لیژنەی پێداچوونەوەی دەستووری هەرێمی کوردستان- عیراق

بڵاوکراوەی ئەنجومەنی نیشتمانیی کوردستان- عیراق

چاپ: یەکەم، چ: کۆمەڵگای چاپەمەنیی شەهاب، ش: هەولێر، ژ.س: ؟، س: ٢٠٠٦، ل: ١٦٥، پ: ١٥×٢٢

ناوەرۆک: بەشی دووەم: مافە ئابووری و کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیرییەکان.

**٥١- تورکیا نەبەرد لە پێناوی مانەوەدا**

نووسین: فەرۆز ئەحمەد و چەند نووسەرێکی تر

وەرگێڕانی لە ؟: خەلیل بەکر مەحموود، کەمال ڕەشید شەریف، ئەبوبەکر خۆشناو، نەجدەت عەبدولکەریم، فەیسەڵ محەمەد عەزیز، شوان پێنجوێنی، ئازاد میرخان

بڵاوکراوەی سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیجیی کوردستان

چاپ: ؟، چ: ؟، ش: سلێمانی، ژ.س: ٢١، س: ٢٠٠٦، ل: ٤١٦، پ: ١٤×٢٠

ناوەرۆک: ئابووریی سیاسیی کەمالیزم: فەرۆز ئەحمەد.

**٥٢- جوگرافیای دانیشتوانی قەزای کۆیە (١٩٥٧- ٢٠٠٢)**

نوسینی: هیوا سادق سەلیم

بڵاوکراوەی دەزگای ڕۆشنبیری و بڵاوکردنەوەی کوردی- وەزارەتی ڕۆشنبیریی عیراق

چاپ: یەکەم، چ.: دار الشؤون الثافیة العامه، ش.: بەغدا، ژ.س.: ٢١٦، س.: ٢٠٠٦، ل.:٢٨٠، پ.:١٧×٢٣

ناوەرۆک: بەشی چوارەم: فاکتەرەکانی کار دەکەنە سەر دابەشبوونی دانیشتوان/ - فاکتەرە ئابوورییەکان.

**٥٣- جوڵانەوەی ڕزگاریی نیشتمانیی کوردستان**

نووسین: د.عەزیز شەمزینی

وەرگێڕانی لە ؟: فەرید ئەسەسەرد

بڵاوکراوەی سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیجیی کوردستان

چاپ: چوارەم، چ.: ؟، ش.: سلێمانی، ژ.س.: ٢٠، س.: ٢٠٠٦، ل.:٣٧٤، پ.:١٤×٢١

ناوەرۆک: بەشی یەکەم: باری ئابووری و سیاسیی کوردستان تا سەرەتای یەکەم جەنگی جیهانی.

**٥٤- چەردە باسێک لەبارەی کوردانەوە**

نووسین: میهرداد ئیزەدی

وەرگێڕانی لە زمانی ئینگلیزییەوە: ئەمین شوان

بڵاوکراوەی دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم

چاپ: یەکەم، چ.: سەردەم، ش.: سلێمانی، ژ.س.: ١٠٢٥، س.: ٢٠٠٦، ل.:٥٩٦، پ.:١٦×٢٤

ناوەرۆک: فەسڵی نۆیەم: ئابووری/ سەرچاوە سروشتییەکان/ نەوت/ کانزاکانی دیکە/ ئاو/ کشتوکاڵ/ ئابووریی کۆچەری/ پیشەسازییەکان/ بازرگانی/ دەرفەتی کارکردن/.

**٥٥- حکومەتی کوردستان لە ناو مەتەڵی سیاسەتی بریتانیادا**

نووسین: مەحموود مەلا عیزەت

بڵاوکراوەی لیژنەی ئامادەکردنی ڕێوڕەسمی (پەنجاهەمین ساڵیادی کۆی دوایی یەکەم مەلیکی کوردستان شێخ مەحموودی حەفید) و بنکەی ژین

چاپ: یەکەم، چ.: شڤان، ش.: سلێمانی، ژ.س.: ١٠٥٤، س.: ٢٠٠٦، ل.:٢٦٨، پ.:١٥×٢٠

ناوەرۆک: بەشی دووەم: ڕێبازی یەکەم: بنەما سیاسی و ئابووری و ستراتیجی و تیۆرییەکانی بەرپرسانی ئەم ڕێبازە.



**٥٦- دادوەری جێندەری و مافەکانی ژنان لە عێراق**

ئامادەکردن: پەیمانگای نێودەوڵەتی مافەکانی مرۆڤ لە زانکۆی دیپۆڵ لە شیکاگۆ

وەرگێڕانی لە زمانی عەرەبییەوە: سەلام کەریم- کارزان عەلی

پێداچوونەوە: ڤیان مەجید

بڵاوکراوەی سەنتەری نیشتمانی بۆ لێکۆڵینەوەی جێندەر

چاپ.: یەکەم، چ.: بینایی، ش.: سلێمانی، ژ.س.: ؟، س.: ٢٠٠٦، ل.:٤٢٢، پ.:١٧×٢٤

ناوەرۆک: ١٠- ئەو کێشانەی ژنان لە ژیانی گشتی و تایبەتی و بواری ئابووری و سیاسی لە عیراقدا ڕووبەڕوویان دەبنەوە: ئەزهار عەبدولموحسین ئەلشعرباف.

**٥٧- داستانا عێن زالا... ل شەڤا ١٩٦٢/١٠/١١**

نووسین: وەسفی حەسەن ڕدێنی

چاپ.: یەکەم، چ.: پاک، ش.: هەولێر، ژ.س.: ١٩٩، س.: ٢٠٠٦، ل.:٢١٧، پ.:١٧×٢٣

ناوەرۆک: ژ ئەنجامێت داستانێ بێت ئابووری.

**٥٨- ڕۆژنامەی ئەهلی لە باشوری کوردستان ١٩٩٤- ٢٠٠٢**

نووسین: هێرش ڕەسووڵ

بڵاوکراوەی دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی بەدرخان

چاپ.: یەکەم، چ.: ڕوون، ش.: سلێمانی، ژ.س.: ٣١٧، س.: ٢٠٠٦، ل.:٨٧، پ.:١٥×٢٠

ناوەرۆک: هەلومەرجی سیاسی و ئابووری و کومەڵایەتی و ڕۆشنبیریی باشووری کوردستان ١٩٩٤- ٢٠٠٢.

**٥٩- ڕۆلێ ڕۆژنامەگەریا کوردی د پێشڤەبرنا هزرا نەتەوەیی یا کوردی دا ١٨٩٨-١٩١٨**

نووسین: هۆگر تاهیر تۆفیق

وەرگێڕانی لە ؟: موحسین عەبدولڕەحمان

بڵاوکراوەی دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی سپیریز

چاپ.: یەکەم، چ.: حاجی هاشم، ش.: هەولێر، ژ.س.: ٧٩٨، س.: ٢٠٠٦، ل.:٣٢٧، پ.:١٧×٢٤

ناوەرۆک: پشکا ئێکێ: کورتەیەک لدۆر بوارێ جڤاکی و ئابووری و ڕەوشەنبیری ل کوردستانێ و پەیدابوونا هوشیاریا نەتەوەیی یا کوردی یا هەڤچەرخ/ بارێ جڤاکی و ئابووری.

**٦٠- ڕۆڵی ڕێکخراو لە کۆمەڵگەی مەدەنیدا**

ئامادەکردن و بڵاوکردنەوە: وەزارەتی وەرزش و لاوان

چاپ: یەکەم، چ: و-ڕۆشنبیری، ش: هەولێر، ژ.س: ٩٤٧، س: ٢٠٠٦، ل:٦٢، پ:١٦×٢٣

ناوەڕۆک: ئابووری و ژمێریاری.

**٦١- ڕەنگدانەوەی بیری لیبراڵی لە باشوری کوردستان ١٩٠٠- ١٩٥٨**

نووسین: هیوا عەزیز سەعید

بڵاوکراوەی وەزارەتی ڕۆشنبیری- بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی چاپ و بڵاوکردنەوەی سلێمانی

چاپ: یەکەم، چ: یاد، ش: سلێمانی، ژ.س: ١٥٠، س: ٢٠٠٦، ل: ٣٣٠، پ:١٦×٢٢

ناوەڕۆک: لیبرالیزمی ئابووری/ ئابووریی ئازاد/ لیبرالیزمی ئابووری.

**٦٢- ڕەواندز- لێکۆڵینەوەیەکی مێژوویی- سیاسی ١٩١٨- ١٩٣٩**

نووسین: ئەحمەد حەمەد ئەمین هۆمەر

بڵاوکراوەی سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیجیی کوردستان

چاپ: یەکەم؟، چ: ؟، ش: سلێمانی، ژ.س: ٤٧٠، س: ٢٠٠٦، ل:١٨٤، پ:١٥×٢٠

ناوەڕۆک: تەوەری دووەم: ڕەوشی کۆمەڵایەتی و ئابووریی ڕواندز.

**٦٣- شاری سلێمانی ململانێی گرووپە کۆمەڵایەتییەکان ١٨٢٠- ١٩٢٠**

نووسین: م.جەعفەر

بڵاوکراوەی (پەنجاهەمین ساڵیادی کۆچی دوایی یەکەم مەلیکی کوردستان شێخ مەحموودی حەفید) و بنکەی ژین

چاپ: دووەم، چ: شڤان، ش: سلێمانی، ژ.س: ٨١٧، س: ٢٠٠٦، ل: ٣١٠، پ:١٦×٢٢

ناوەڕۆک: پێڕست/ باری ئابووریی سلێمانی لە نیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەدا/ هەشت کەسایەتیی ئابووری و سیاسیی سەرەتای سەدەی بیستەم/ تەرازووی هێزی ئابووری.

ناوەڕۆکی ئەم چاپە لەگەڵ چاپی یەکەمدا جیاوازە، لەبەر ئەمە ناوەڕۆکی هەر دوو چاپەکە نووسراوەتەوە.

**٦٤- قڵیشانی بەرد- ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست لە بەردەم گۆڕانی دیموکراسیدا**

نووسین: سامی شۆڕش

بڵاوکراوەی دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس

چاپ: یەکەم؟، چ: و-پەروەردە، ش: هەولێر، ژ.س: ٦٣، س: ٢٠٠٦، ل:١١١، پ:١٥×٢١

ناوەڕۆک: ئابووری فاکتەرێکی گرینگی دیموکراسییە.

**٦٥- کورد لە دیدی ڕۆژهەڵاتناسەکانەوە**

نووسین: د.فەرهاد پیربال

بڵاوکراوەی دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس

چاپ: یەکەم، چ: و. پەروەردە، ش: هەولێر، ژ.س: ٥١٠، س: ٢٠٠٦، ل:٢١٦، پ: ٢٠×٢٧

ناوەرۆک: ستراتیژیەتی بازرگانی و ئابووریی مەڵبەندی کوردستان.

**٦٦- کۆیە- لێکۆڵینەوەیەکی مێژوویی، سیاسی، کۆمەڵایەتییە**

نووسین: جەمال فەتحوڵڵا تەیب

بڵاوکراوەی مەکتەبی بیر و هۆشیاریی (ی.ن.ک.)

چاپ: یەکەم، چ: ؟، ش: سلێمانی، ژ.س: ٤٥٠، س: ٢٠٠٦، ل:٢٧٨، پ:١٦×٢٢

ناوەرۆک: بەشی یەکەم: سەرنجێکی گشتی یان مێژوویی لە هەلومەرجی سیاسی و ئابووری و فەرهەنگی کۆیە/ بارودۆخی ئابووری و کۆمەڵایەتی/ بەشی دووەم: کۆیە لە نێوان ساڵانی ١٩١٨- ١٩٤٥دا/ بارودۆخی ئابووریی کۆمەڵایەتی.

**٦٧- مێرگەها بۆتان د چاخێ بەدرخانێ (١٨٢١- ١٨٤٧)دا- ڤەکولینەکا دیرۆکی سیاسی**

نووسین و وەرگێڕانی لە ؟: د.سەلاح محەمەد سەلیم هروری

بڵاوکراوەی بەڕێوەبەرایەتیی خانەی وەرگێڕان

چاپ: یەکەم، چ: منارە، ش: هەولێر، ژ.س: ٤٧٨، س: ٢٠٠٦، ل:١٨٧، پ:١٦×٢٣

ناوەرۆک: سەروبەرێ ئابووری.

**٦٨- مێژووی شارستانێتی- بەرگی یەکەمی چاپی کوردی**

نووسین: ویڵ دورانت

وەرگێڕانی لە ؟: ئازاد بەرزنجی- نەبەز کەمال نووری- دانا ئەحمەد مستەفا

بڵاوکراوەی دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم

چاپ: یەکەم، چ: سەردەم، ش: سلێمانی، ژ.س: ١٠٢٤، س: ٢٠٠٦، ل:٢٣٥، پ:١٦×٢٢

ناوەرۆک: باسی یەکەم: فاکتەرەکانی ژیار/ باسی دووەم: توخمە ئابوورییەکانی ژیار/ لە ڕاووشکارەوە بەرەو کێڵان/ بناغەکانی پیشەسازی/ ڕێکخستنی ئابووری.

**٦٩- هەورامان- لێکۆڵینەوەیەکی سۆسیۆئەنترۆپۆلۆجی**

نووسین: عیزەت فەتاح حەمەساڵح

بڵاوکراوەی سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیجیی کوردستان

چاپ: یەکەم، چ: ؟، ش: سلێمانی، ژ.س: ٥٨٣، س: ٢٠٠٦، ل:٣٠٤، پ:١٤×٢٠

ناوەرۆک: باسی دووەم: ژیانی ئابووریی هەورامان/ کاریگەریی ژیانی ئابووری لەسەر پێکهاتەی ژیانی کۆمەڵایەتیی هەورامان/ باسی دووەم: ژیانی کۆمەڵایەتی/ باسی سێیەم: ژیانی ئابووری.



ئیمداد تەها

# ڕیشەی ڕیفۆرم لەژێر ڕووناکی کتێبی:

## (زانایانی ئیصلاح و نوێکردنەوەی ئایینی لە کوردستان)

(زانایانی ئیصلاح و نوێکردنەوەی ئایینی لە کوردستان)، ناوی کتێبێکە، لە نوسینی «د. ئاراس محەممەد صاڵح». بابەتی کتێبەکە دەچێتە بواری لێکۆڵینەوە، لە دوتووێی٢٣٢ لاپەڕەدا. چاپی یەکەم ٢٠١٨.

نوسەر باس لە ڕیشەی هزری نوێکردنەوە و ڕیفۆرم لە کوردستان دەکات و نمونە بەشەش کەسایەتی لە مەلای بلیمەت و زاناکانی کوردستان دەهێنێتەوە کەوا هەڵگری بیری ڕیفۆرمی ئایینی بوون، کە ئەوانیش بریتین لە: (مەلای ئیبنو ئادەمی باڵەکی، مەولانا خالیدی نەقشبەندی، حاجی قادری کۆیی، مەلای گەورە، شێخ محەممەدی خاڵ).

نوسەر هەر لە پێشەکی ئەم کتێبەوە کورتەباسێکی مێژووی سەرهەڵدانی هزری ڕیفۆرمی ئایینی دەکات لە جیهانی ئیسلامی کە لە میسر سەریهەڵداوە لەسەر دەستی جەمالەدینی ئەفغانی و محەمەد عەبدە برەوی پێدراوە و گەیەندراوەتە لوتکە. بەڵام ئەم هزری ڕیفۆرمی ئاینییە پێش وڵاتانی دیکە سەریهەڵداوە و مەلایانی کورد دژی ڕەوشی ئایینی چەقبەستووی پڕ ستەمکاری بەناوی ئایین لەلایەن هەندێک دەرەبەگ و شێخ و ئاغاکانیان ڕەتکردوەتەوە و هەوڵی چاکسازییان تێدا داوە و قوربانی زۆرگەورەشیان لەپێناویدا داوە.

دەستپێکی کتێبەکە بە کورتەباسێکی مێژوویی خوێندنی ئایینی لە کوردستان دەستپێدەکات و پاشان دێتە سەر شیکرنەوەی چەمک و واتای نوێکردنەوە و چاکسازی ئایینی، بەم پێشەکییە نوسەر بەرکولێک بە خوێنەر دەدات و دەیخاتە سەر ئەو ڕێگەیەی کە بەرەو مەبەستی دیاریکراوی دەبات. پاشان دێتە سەر باسکردنی ژیانی هەریەکە لەو پێنج کەسایەتییەیانەی کە باسمان کردن. هەر لە قۆناغی سەرەتای دەستپێکردنی خوێندن و تێکەڵبوونیان بەزانستی شەرعی باسی ژیانیان دەکات هەتاکو دەگاتە قۆناغی کامڵبوون و هەوڵە چاکسازیخوازەکانیان.

١. (مەلای ئیبنو ئادەمی باڵەکی)، لە نێوان ساڵانی(١٧٥٠-١٨٢٢) ژیاوە. خاوەن کەسایەتی و پێگەی تایبەتی خۆی بووە و لەسەر داوای میری سۆران بووەبە قازی و موفتی گشتی ئەو شارە. بەڵام دواتر بەهۆی بەرهەڵستیکردنی لە ستەم و ناڕەواییەکانی میر محەمەد لە حکومڕانییەکەیدا نێوانیان تێکدەچێت و میر ناچاری دەکات ڕەواندز جێ بهێڵێت. پێگەیەکی بەرزی زانستی کەم وێنەی هەبووە.

زانایان ستایشی توانای زانستی زۆریان کردووە و پەسنی زۆریان وتووە. مامۆستای چەندین زانای بلیمەت بووە و پێی گەیاندوون لە نێویاندا (مەولانا خالیدی شارەزووری).

٢. (مەولانا خالیدی نەقشبەندی)، لە نێوان ساڵانی(١٧٧٦-١٨٢٧) ژیاوە. ناوبراو لە پاش بەدەستهێنانی ئیجازەی زانستی و چوونی بۆ هیندستان و وەرگرتنی تەریقەتی نەقشبەندی و گەڕانەوەی بۆ سلێمانی، لەلایەن مەحمود پاشای میری بابانەوە مزگەوت و خوێندنگە و خانەقای مەولانای لە سلێمانی بۆ دروستکراوە.

کەسایەتییەکی زیرەک و بلیمەت و ئازا بووە، ئەدیب و زمانپاراو و گوفتار جوان بووە و دەستی باڵای لە زانستە جۆربەجۆرەکاندا هەبووە.

٣. (حاجی قادری کۆی) لە نێوان ساڵانی(١٨١٧-١٨٩٧) ژیاوە. شاعیرێکی گەورەی کوردە، هەوڵیداوە لە ڕێگەی شیعرەکانییەوە گەلەکەی پێش بخات. بەمەبەستی خوێندن و وەرگرتنی زانست ناوچەکانی هەولێر، سلێمانی، سەردەشت، سابڵاخ، شنۆ، خۆشناوەتی، باڵەکایەتی گەڕاوە و لە کۆیە لەگەڵ مەلا عەبدوڵڵای جەلیزادە دوو مەلای هاوڕێی خوێندن بوون و نێوانیان زۆر خۆشبووە.

٤. (مەلای گەورەی کۆیە) کە لە ماوەی نێوان ساڵانی(١٨٧٦-١٩٤٣) ژیاوە. زانایەکی لێهاتووی کوردە و پێش تەمەنی بیست ساڵی لە خزمەت باوکیدا (مەلای عەبدوڵڵای جەلیزادە) ئیجازەی زانستی لە زانستە شەرعییەکاندا وەردەگرێت و دەبێتە جێگرەوەی باوکی و وانە بە فەقێیان دەڵێتەوە. لە دوای ئەوەی کراوە بە سەرۆکی زانایانی کۆیە، نازناوی مەلای گەورە وەردەگرێت.

٥. (شێخ محمدی خاڵ)، لە نێوان ساڵانی(١٩٠٤-١٩٨٩) ژیاوە. لەلای زانایان خوێندوویەتی و لەکۆتایدا لەلای شێخ عومەری قەرەداغی ئیجازەی زانستی وەرگرتووە. پاش ئەوەی ڕوو لە شاری کۆیە دەکات، دەچێتە حوجرەی مەلای گەورە و دووبارە لەلای مەلای گەورەش ئیجازەی زانستی پێ بەخشراوە.

**لەگەڵ باسکردنی پوختەیەک لە ژیانی ئەم پێشەوایانەدا، نوسەر دێتە سەر باسکردنی هۆیەکانی پێگەیشتن و دەرکەوتنی هەریەکێکیان.**

ئێمەش بەکورتی لەبەر هاوبەشی و نزیکیان لە یەکترەوە کردومانن بەخاڵی هاوبەش بۆ هەموویان هۆیەکانی پێگەیەشتنی ئەم مەلایانە:

١. زیرەکی و بلیمەتی مەلایانی کورد و بەرزی ئاستی تێگەیشتن و لێهاتوویان.

ئەم مەلایانە هەر لە تەمەنی منداڵییانەوە بەهرەیان لێ دیارکەوتووە و توانیویانە دەستی باڵا پەیدا بکەن لە زانستە جۆراوجۆرەکاندا (زانستە عەقڵانی و نەقڵانییەکان).

٢. خێزان و بنەماڵەکانیان، هەموو ئەم مەلایانە هۆکارێکی سەرەکی لە پێگەیشتنیان و ئاستی ڕۆشنبیریی و زانستخوازییان بۆ خێزان و بنەماڵەکەیان دەگەڕێتەوە.

هەر لە سەرەتاوە لەلایەن باوک و کەسوکاری نزیکیانەوە بە زانستخوازی گۆش کراون و زانستە جۆربەجۆرەکانیان پێ وتونەتەوە و کەشوهەوایەکی لەباری پێگەیشتنیان بۆ ڕەخساندوون. بەشێوەیەکی گشتیش تێکڕا ناوچەجیاوازەکانی کوردستان بوونەتە لانکەی خوێندن و فێربوونی بڵاوکردنەوەی زانست و چەندین زانای بەتوانای لەخۆگرتبوو.

هەروەک کۆمەڵێک بنەماڵەی کورد کۆچیان کردبوو بۆ کوردستان و لەژێر دەسەڵاتی سەفەوی هەڵاتبوون. لەوانە بنەماڵەی (حەیدەرییەکان)، کە ئیجازە زانستی کۆمەڵێک لە مەلایانی کوردستان و عێراقیش دەچێتەوە سەر ئەوان.

٣. کاریگەری ڕۆڵی میر و فەرمانڕەوا کوردەکان لە برەوپێدانی زانست و خزمەتکردنی زانایان. پشتگیریی و هاوکاریکردنی هەریەکە لە میر محەمەدی میری سۆران و کردنەوەی خوێندنگە لە کاولۆکان. هەروەها گرنگیدانی میرانی بابان بە زانست و زانیاری، لە دروستکردنی مزگەوتی گەورە کە دەبێتە جێگەی کۆبونەوەی زانایان و کتێب و دەستنووسەکان. ئەمانە دوو نمونەی بەرجەستەن لە ڕۆڵ و کاریگەری فەرمانڕەوایانی کورد لە پێگەیاندن و دەرخستنی دوو کەڵە پیاوی کورد کە ئەوانیش مەلای ئیبنو ئادەمی

باڵەکی و مەولانا خالیدی نەقشبەندین، بە ڕەخساندنی کەشی خوێندن و فێربوون بۆیان.

مەلای ئیبنو ئادەم بە هاوکاری میر محەمەد دەتوانێت ناوچەی باڵەکیان بکاتە مەڵبەندی زانست و زانیاری. لەولاشەوە بەهۆی پشتگیرییەکانی میرانی بابانەوە، مەولانا ڕەگی تەریقەتەکەی لە سلێمانی دادەکوتێت و خوێندنگە و خانەقای بۆ دروست دەکرێت.

٤. بوونی چەندین زانای لێهاتوو و شارەزا کە مامۆستای ئەم مەلایانە بوون و ڕۆڵیان لە پێگەیاندنیادا هەبووە. بەربڵاوی زانست و زانیاری لە ناوچە جیاجیاکانی کوردستان و، هەبوونی چەند مەلای بلیمەت و چەند بنەماڵەی زانستپەروەر و سەرقاڵ بە خوێندنەوە، هەروەها هەبوونی کەلەپورێکی دەوڵەمەند لە دەستنووس و کتێب، وایکردوە چەندین مەلا پێبگەیەنن و ئەم زنجیرەیە بەردەوام بێت. ئەم زانایانە کاریگەرییان لەسەر یەکتری هەبووە و توانیویانە شۆڕشێکی هزری بێننە کایەوە و کاری هەرەوەزی بکەن و یاریدەی یەکتری بوون بۆ بڵاوکردنەوەی زانست و ڕۆشنبیریی و بەرەوپێشبردنی ڕەوشی ئایینی بەرزکردنەوەی ئاستی ڕۆشنبیرییان.

بۆ نمونە مەولانا خالید خوێندکاری مەلای ئیبنو ئادەم بووە و بە هزری ئەو کاریگەر بووە. حاجی قادری کۆیی بەهەمانشێوە لە ڕێگەی ناسینی نەوەکانی ئیبنو ئادەمەوە کەوتووەتە ژێر کاریگەری هزرییەوە. هەروەها بەهۆی نزیکی و ناسراویشی لەگەڵ بنەماڵەی جەلیزادە، بەهەمان شێوە کاریگەری هزری مەلا عەبدوڵڵای جەلی و مەلای گەورەی لەسەر بووە و بەهەمانشێوە بەهۆی نزیکییانەوە مەلای گەورەش کەوتووەتە ژێر کاریگەری بۆچوونەکانی ئەمەوە. هەرچەندە حاجی قادر و مەلا عەبدوڵڵای جەلی ڕاستەوخۆ لەلای ئیبنو ئادەم نەیانخوێندووە، بەڵام نەوەی ئەویان ناسیوە لە گەشتکردنیان بۆ ناوچەی باڵەکایەتی بەمەبەستی خوێندن و لەو ڕێگەیەوە بە هزری ئیبنو ئادەم ئاشنا بوون. هەروەها شێخ محەمەدی خاڵیش کەوتووەتە ژێر گاریگەری هزر و بیری بنەماڵەی جەلییەوە.

٥. چاوکراوەیی و زیرەکی مەلایانی کورد و کاریگەربوونیان بە پرۆژە نوێخواز و ڕیفۆرمیستەکانی چواردەور و کاریگەری ڕووداوەکانی ناوچەکە لەسەریان و هەستکردن بە بەرپرسیارێتی بەرامبەر دین و ژین و نیشتمان. کە زۆرجار ئەم کاریگەربوون و دروستبونی هەستی بەرپرسیارێتییە لە ئەنجامی گەشت و گەڕان و بینینی ناوچە جیاوازەکانەوە دروستبووە بۆیان. گەڕانە بەردەوامەکانی مەولانا خالید بۆ فێربوون و دەستخستنی زانست کاریگەری زۆری لەسەری هەبووە. هەر لە سەرەتای خوێندنەوە ڕوو لەسلێمانی دەکات و ڕوو لە ناوچەکانی باڵەکایەتی و سنە دەکات. دواتر ڕوو لە وڵاتی شام دەکات و لەوێوە سەفەری حەج دەکات و بۆماوەی زیاتر لە ساڵێک لە مەککە و مەدینە دەمێنێتەوە و دوای گەڕانەوەی لە ڕێگەی ئێرانەوە بەناو ئەفغانستاندا تێدەپەڕێت و خۆی دەگەیەنێتە هیندستان.. بەدرێژای ئەم سەفەرانەی، مەولانا چاوی بە ژمارەیەک لە زانایانی سوننە و شیعە دەکەوێت و گفتوگۆ و دیالۆگیان لەگەڵ

دەبەستێت.. تاوەکو دواجار لە هیندستان تەریقەتی نەقشبەندی دێنێتەوە و ئیجازەی دین و دونیای پێدەبەخشرێت. هەروەها کەسایەتییەکی وەک حاجی قادری کۆیی، کاتێک ڕوو لە ئەستەنبوڵ دەکات کە لەو دەمەدا پێگەیەکی تایبەتی هەبووە و پایتەختی جیهانی ئیسلامی بووە. لەو ڕۆژگارەدا ئەو شارە شوێنی کۆبونەوەی ڕۆشبیر و زانایان و خاوەن هزرە جۆراوجۆرەکان بووە. شوێنی کۆبونەوەی ئازادیخواز و ڕۆشبیرییە جیاوازەکان بووە. حاجی قادر بە تێکەڵاوبوونی ئەم کەشە تایبەتییە کاریگەری قوڵ لەسەر هزری دروستبووە و زیاتر چاوکراوەی کردووە و دونیابینییەکی تری پێبەخشیوە. هەواڵ و دەنگوباسی زیاتری گەلان و ناوچەکەی بیستووە و پێیان کاریگەر بووە.

هەروەها کەسایەتیەکی وەک مەلای گەورە کە بەهۆی پێگەی بنەماڵەکەیەوە توانیویەتی لە کوردستان بمێنێتەوە و برەو بەهزری نوێخوازی خۆی بدات، وەک مەولانا و حاجی قادر بێکەس نەبووە تاوەکو ئاوارەی دەرەوەی بکەن.. بەڵام ئەو لێرە زۆرباش ئاگاداری گۆڕانکارییەکان بووە و بەردەوام بەدواداچوونی هەبووە لە ڕێگەی ڕۆژنامە و گوێگرتن لە ئێزگەی ڕادیۆ و ...هتد. دانەبڕاوە لە جیهان و کەوتووەتە ژێر کاریگەری بزوتنەوەی ڕیفۆرمخوازی لە میسر.

**هەموو هەنگاوەکانی شێخی خاڵ نوێگەری بوون لە هزری چینی ئاینخوازدا و خزمەتێکی دیار و بەرچاویش بووە بە زمان و ئەدەب و فەرهەنگ و کەلەپووری نەتەوەکەی خۆی.**

مەلای گەورە کاریگەر بووە بە محەمەد عەبدە و جەمالەدینی ئەفغانی، کە دوان لە سەردەستەکانی بزوتنەوەی ڕیفۆرمخوای بوون لە میسر و گۆڤاری (ئەلمەنار) زمانحاڵیان بوو. هەروەها مەلای گەورە توانیویەتی لە گۆڕانکارییە گەورە و ڕیشەییەکان تێبگات کە ڕوویان لە ناوچەکە کردووە و مامەڵەی واقیعی و گونجاویان لەگەڵ بکات و بەشێوازێکی تەقلیدیی و چەقبەستوو ڕوبەڕویان نەبووەتەوە. پشتگیری ئەو بۆ کردنەوەی قوتابخانەی نوێ لە کۆیە و ناردنی کچ و کوڕ پێکەوە بۆ خوێندن بەڵگەیەکی ڕوونە لە فراوانی هزری مەلای گەورە.

شێخ محەمەدی خاڵیش بەهەمان شێوە یەکێکی ترە لەو کەسایەتییە دەگمەنانەی کورد کە هەمان ئەو هۆکارانەی زەمینەی هەڵکەوتنی مەلاکانی دیکەیان ڕەخساند، زەمینەیان بۆ

ئەمیش ڕەخساندووە. هەر لەمنداڵییەوە لەلای باپیری دەست بە خوێندن دەکات و دواتر دەست بەگەشت و گەڕان دەکات بۆ پتەوکردنی کەسێتی خۆی. لە سلێمانییەوە ڕوو لە کۆیە دەکات و لەلای چەند زانا دەخوێنێت و زانست وەردەگرێت.

ئەتوانین بڵێین ئەوەی باسمان کرد ڕێنوارێکی پتەوە ئاماژە بە زانستدۆستی میللەتی کورد دەدات. هێمایە بۆ ڕۆشنبیری میللەتی کورد و ئەگەر وڵاتانی دراوسێ و ناوچەکە چەند ناوەند و زانستگەیەکیان هەبووبێت بۆ پێگەیاندنی زانایان، ئەوە بەڕێژەیەکی زیاتر لە کوردستان بەدی کراوە و کارامەتر بووە و زانستخواز تر بووە. لە سەرجەم ناوچە جیاوازەکانی کوردستان حوجرە و خانەقا هەبووە و کارگەری بەرهەمهێنی زانایانی شارەزا بە سەرجەم زانستە جۆراوجۆرەکان بوون. چەندین بنەماڵە و خانەوادە هەن لە مێژووی کورددا کە بە بنەماڵەی زانستی ناسراون و بەدرێژای مێژوو ئیجازەی عیلمیان بەخشیوەتەوە.. کە ئەمەش ڕەنگە شتێکی تایبەت بە گەلی کورد بێت، یان هاوشێوەی کەم بووبێت. پاشان ئاماژەیە بۆ گرنگی گەشت و گەڕان و ئاگاداربوون لە بارودۆخ و گۆڕانکارییەکانی ناوچەکە تاوەکو زانایان بە چەقبەستوویی نەمێننەوە. گرنگە ئەمڕۆ بۆ بەرەوپێشبردنی ڕەوشی ئایینی و بەرزکردنەوەی ئاستی ڕۆشنبیری، هەماهەنگی لە نێوان زانایان و لایەنی دەسەڵاتداردا هەبێت. بە کردنەوەی خولی بەرەوام و کۆنفراسی زانستی، بەردەوام کەسایەتییە ئایینییەکان خۆیان نوێ بکەنەوە.

**هەوڵە نوێخوازیی و چاکسازییەکانی ئەم مەلایانە:**

١. مەلایانێکی تەقلیدی نەبوون و ئیجتیهادی نوێیان کردووە. بەئاسانی خۆیان ڕادەستی وتە و بۆچونێکی تایبەت بە ڕێبازێکی دیاریکراو نەکردووە. بەڵکو، هاتوون شەنوکەوی بۆچونەکانیان کردووە و وەک زانایەکی بێ دەمارگیر و لێهاتوو بژاردەی وتە و بۆچونەکانیان کردووە. خاوەنی ڕاو بۆچوونی سەربەخۆ و تایبەت بە خۆیان بوون. کە ئەمەش نوێخوازێکی یەکجار گرنگ و لێهاتووانە بووە لەو چاخەدا، کەوا زۆرینەی مەلایانی کورد شافیعی مەزهەب بوون و لێیان لا نەداوە. بەڵام، ئەم مەلایانە لە زۆر جێگە بەرپەرچی وتەی ئیبنوحەجەر و نەوەویان داوەتەوە و کاریان پێنەکردووە و ڕەخنەیان لێگرتوون، لەبری ئەوە بۆخۆیان ئیجتهادیان کردووە و حوکمیان لە بەڵگەکان هەڵگۆزیوە.

٢. ڕیفۆرم لە ڕەوشی ئایینی، لە سەردەمی ئەم مەلایانەدا ڕەوشی ئایینی لە کوردستان تاڕادەیەکی زۆر تووشی چەقبەستوویی و لادان هاتووە لە بنەما و مەبەستە سەرەکییەکانی خۆی. هەرچەندە نکۆڵی لەوە ناکرێت کەوا ڕێبازی سۆفیگەری بۆ سەردەمانێکی زۆر کەباڵی بەسەر کوردستاندا کێشابوو، خزمەتی زۆریان بە ڕەوشی ئاینی کردبوو، بەڵام لەو دواییانە و لە سەردەمی ئەم مەلایانەدا تووشی قەیرانێکی قوڵ ببوو.

ئەم مەلایانە هەرزوو هەستیان بەوەکرد کەوا ڕێبازی سۆفیزم لە مەبەستە

سەرەکییەکەی خۆی لادراوە و لەبری خزمەتی ئایینی بە کورد، کەچی کراوە بە بارێک بەسەر شانی خەڵکەوە و کەوتووەتە بڵاوکردنەوەی خورافیات بەناوی ئاین و چینایەتی هێناوتە کایەوە و نادادی کۆمەڵایەتی لێ کەوتووەتەوە. هەریەکە لە (ئیبنو ئادەم و مەولانا خالید و حاجی قادر و مەلای گەورە و شێخی خاڵ)، لە ڕێگەی نوسین و شیعر و وەسیەتنامەوە بۆ گوێگرانی خۆیان هەوڵی چاکسازیان داوە لەم بوارەدا.

پێیانوابووە ئەو وێناکردنەی تەسەوف بەوشێوەیەی کە هەبووە، کۆمەڵێک کەس بەناوی شێخایەتییەوە ماڵ و موڵکی خەڵکیان بۆخۆیان قۆرخ کردووە و بەناوی ئاینەوە ڕەنج و دەستمایەی خەڵکیان خواردووە.

ئەمەیان بە ناڕەوا و دوور لە ڕۆحی شەریعەت و تەسەوفی ڕاستەقینە لەقەڵەمداوە. هەروەها پێیانوابووە کەوا سۆفیگەری ئەو ڕۆژگارە، بەندایەتیان بەپێی سەرچاوە ڕەسەنەکانی ئیسلام ئەنجام نەداوە کە بریتین لە قورئان و فەرموودەی ڕاستی پێغەمبەر (د.خ). ئاماژەیان بۆ ئەوە کردووە کەوا لەبری خۆسەرقاڵکردن بە شتی لاوەکیی و تەکیە و خانەقا و بەندایەتیکردن بەبێ بەڵگە، خۆیان سەرقاڵی زانست و خواپەرستی دروستبکەن و ڕوو لە مزگەوت و حوجرە و خوێندنگەکان بکەن.

گرنگی بە سووننەت بدەن و خۆیان خەریکی بیدعە و شەتەحاتی سۆفی نەکەن. ئەم زانایانە بەتوندی بەگژ (زۆرداری ئایینی، ئەفسانە و خورافەپەرستی، بیدعە و نەزانین و بەپیرۆزکردن و پەرستنی شێخەکاندا) چوونەتەوە و پێیانوابووە ئێستە بەناوی تەسەوفەوە، بەندایەتی بۆ شێخ و پیاوچاکان دەکرێت و لە ئاستی خۆیان پتر پیرۆز ڕادەگیرێن. چەندین ئەفسانە بەناوی ئاینەوە بڵاو دەکرێنەوە و هۆکارن بۆ مێشک وشکیی و نەمانی جوڵەی هزر و سەرهەڵدانی تەمبەڵی و دواکەوتن لە ژیان.

نوسەری کتێب، هاتووە بۆ ڕوونکردنەوەی زیاتری بابەتەکە نمونەی بە کتێبە چیرۆکی (فڕی فڕی قەل فڕی)، مەلای گەورە هێناوەتەوە کە بەشێوازێکی گاڵتەجاڕانە ئاماژە بە ڕەوشی دینداری ئەو دەمە دەکات. هەروەها نمونەی بە کۆپلە شیعرەکانی حاجی قادر هێناوەتەوە کە تێیدا حاجی قادر باس لەوە دەکات بۆ سەردەمانێک فریوی دەستی تەسەوفی خواردووە و چیتر شێخ هەڵگری نازناوی قوتب نییە کە پێی بەخشراوە. هەروەها وەسیەنامەکەی مەولاناخالیدی نەقشبەندی بە نموونە هێناوەتەوە کە وەسیەت بۆ موریدانی دەکات خۆیان بە زانستی فەرمودەوە خەریک بکەن، نەک بە شتی لاوەکییەوە.

٣. ڕیفۆرم لە بواری سیاسی، نووسەر هاتووە ئاماژەی بەوەداوە کەوا بەشێک لە پرۆژەی ڕیفۆرمخوازی ئەم زانایانە خۆی لە بواری سیاسیدا دەبینێتەوە و ئەم مەلایانە وەک کەسایەتییەکی کارای کۆمەڵگە نەیانتوانیوە چاو لە نادادی سیاسییەکان بپۆشن و بەناوی دینەوە پەردەپۆش بکرێت. لەمبارەیەوە نموونە بە هەڵوێستی جوامێرانە و دونیانەویستانەی ئیبنو ئادەمی باڵەکی دێنێتەوە لە بەرامبەر ستەمەکانی پادشای کۆرە

لە خەڵکی ناوچەکە. ئاماژە بەوە دەکات، هەرچەندە لە سەرەتاوە پەیوەندییەکی باش هەبووە لە نێوان پاشای کۆرە و ئیبنو ئادەمدا و لەکاتێکدا دەبێت بە موفتی میرایەتی سۆران، بڕیار وایە دەست لە کاروباری یەکتر وەرنەدەن. بەڵام ئیبنوئادەم ناتوانێت چاو لەوە بپۆشێت کەوا میری سۆران نارەوایی و سنووربەزێنی بەرامبەر خەڵکی بێدەسەڵاتی ناوچەی خۆشناوەتی دەکات و پەلاماریان دەدات و ئاغاکەیان دەکوژێت. هەروەها هەوڵە پاوانخوازییەکانی میری بابان ناچار دەکات داوای هاوکاری لە عوسمانییەکان بکات بۆ پاراستنی نفوسی خۆی.

ئیبنو ئادەم بێدەنگ نابێت و ئەم کارانەی میر محەمەد بە نارەوا دەزانێت، بەوهۆیەشەوە کێشە دەکەوێتە نێوانانەوە، تاوەکو کار دەگاتە ئەوەی دەردەکرێت لە رەواندوز و روو دەکاتەوە ناوچەکەی خۆی. هەرچی مەولاناخالیدیشە، توانیویەتی ریفۆرمێکی بەرچاو و ریشەیی لەگەڵ خۆی بێنێتەوە لە هیندستان و بە وەرگرتنی ئیجازەی دین و دونیا لەلایەن شێخ عەبدوڵڵای دیهلەویەوە پێی بەخشرابوو، مەولانا بە خاوەن دوو باڵەکە ناوبانگ پەیدا دەکات. ئەو ڕێبازە نەقشبەندییەی مەولانا هێنای تەنیا لایەنی دەروونی سۆفی و موریدەکانی تێراو نەدەکرد و گۆشەگیری کونجی خواپەرستیان بکات و لە دونیا دایان بڕێت. بەڵکو چاکسازێکی بواری سیاسیش بوو. نوسەری کتێب، نموونە بە هەوڵەکانی مەولانا بۆ ئاشتەوایی نێوان میرەکانی بابان دێنێتەوە کە ناکۆک بوون لەنێوخۆیاندا.

هەروەها مەولانا نامە دەنێرێت بۆ والی بەغدا تاوەکو ئاشتەوایی بکات لە نێوان ئەو و میرانی باباندا. مەولانا، خانەقای کردە بارەگایەک بۆ ڕێکخستنەوەی رەوشی ئایینی و دونیایی خەڵک. تەسەوفی کردە هێزێکی ڕێکخراوەیی بەرهەڵستیکاری ستەمکاری بابان کە لە خەڵکیان دەکرد و لەو دەمەدا سیستەمە حکومڕانییەکە جۆرێک لە پشێوی و بێسەروبەری ڕووی لێ کردبوو. ئەمەش وایکرد خەڵکێکی زۆر تەریقەتی نەقشبەندی بگرنەبەر و موریدی مەولانا بن.

بەهۆی هەڵوێستە بەردەوامەکانیشی دژی ستەمی بابانی و عوسمانییەکان لە خەڵکی و بەرپەرچدانەوەی پێشنیازی عوسمانییەکان بۆئەوەی موڵک و ماڵی لێ وەربگرن و چاوشۆڕیان ببێت، مەولانا تووشی دەربەدەری دەبێت.

نوسەر، لەم لێکۆڵینەوەیەدا ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کەوا عوسمانییەکان برەویان بە سیستەمی شێخایەتی و دەرەبەگی داوە. ماڵ و موڵکیان لەسەر شێخ و دەرەبەگەکان تاپۆ کردووە تاوەکو پشتگیریان بکەن و شۆڕشیان لە دژ ئەنجام نەدەن. بەڵام مەولانا بە گژ هەموو ئەمانەدا دەچێتەوە و بۆ خۆی لەو سیستەمە دورەپەرێز دەگرێت داوا لە موریدەکانیشی دەکات نەچنە نێو سیستەمێکی ئاوهاوە و نەبنە داردەستی ستەمکارانێک لە بەرامبەر چەند دەستکەوتێکی دونیایی چاو لە خراپەکانی بنوقێنن. ئاوێتەکردنی ئایین لەگەڵ پرسە نیشتیمانییەکان و بەرەوپێشبردنی گوزەران و ئاستی ڕۆشنبیری

خەڵک. لەمبارەیەشەوە دیسان هەنگاوی یەکەم مەلای بوێر ئیبنوئادام ناویەتی و شکۆی پێشڕەوی بۆ ئەوە.

نوسەر، لە باسێکدا لەژێر ناوی (مەلای ئیبنوئادەم و نیشتیمان و زمانی کوردی)، دەڵێت ئیبنوئادەم یەکەمین کەسە پەخشانی بە زمانی کوردی نوسیوە. هەرچەندە لەوکاتەدا مەلایانی کورد ڕەخنەیان لە ئیبنوئادەم گرتووە لەسەر ئەم کارەی و بە بیدعە ناویان بردووە. بەڵام ئیبنوئادەم بوێرانە وەڵامیان دەداتەوە. دەڵێت: ئەوانە وەک هێلکە وان لە توێکڵی خۆی هاتبێتە دەرەوە و بۆگەنی کردبێت.

نوسەر، پێیوایە ئەگەر مەولانا خالید بەهۆی چاکسازی ئاینییەوە ئاوارە بوبێت، ئەوا حاجی قادری کۆیی قوربانی دەستی چاکسازی کۆمەڵایەتییە. حاجی، بەتوندی بەگژ نادادی کۆمەڵایەتیدا بچێتەوە کە کۆمەڵگەی کوردی بەسەر چینی ئەرستۆکراتی کە خۆی لە شێخ و ئاغا و دەرەبەگەکان و چینی ڕەنجەردا دابەشبووە. ویستووشیەتی ئەو ڕیفۆمە لەڕێگەی ئایینەوە بکرێت، چونکە بەناوی ئایینەوە کراوە. نوسەر ئاماژە بەوەدەکات: حاجی قادر لە ڕێگەی شیعری نەتەوەیی و نیشتمانییەوە هزری ڕزگاریخوازی جوڵاندووە و هانیداون بۆ خوێندن و وەرگرتنی نیشانەکانی نوێی شارستانیبوون و هۆیەکانی چاوکراوەیی وەک ڕۆژنامە و گۆڤار و کتێب. تاوەکو لە ئەفسانە و خورافە ڕزگاریان بێت. حاجی، بۆ کاریگەربوونی شیعرەکانی فەرمودەی تێدا بەکارهێناوە و هەستی خەڵکی جوڵاندووە تاوەکو ڕوو لە خوێندن بکەن و دەشڵێت هەر مەلایەک ڕێگەی خوێندنی لێگرتی دینی نییە. دیارە لەو کاتەدا مەلایانێک هەبوون خوێندنی دەرەوەی حوجرەیان بە ناڕەوا زانیوە و خەڵکیان لێ سارد کردووەتەوە. هەروەها نوسەر چەند کۆپلەیەکی دیکە لە شیعرەکانی حاجی دێنێت کە باس لە خۆشەویستی بۆ نیشتیمان دەکات و هانی گەلی کورد دەدات یەک بگرن. هانیان دەدات ئامانجیان یەک بخەن و ئاسۆی بیریان فراوان کەن، کەلتوور و پۆشاک و نووسین و زمانی خۆیان بپارێزن. حاجی بەگژ ئەو بۆچوونانەدا دەچێتەوە کە بە پێویست و شیاوتری دەبینێت، سرووتە ئاینییەکان تەنیا بە عەرەبی بخوێنرێن.

نوسەریش لەمبارەیەوە نزا و موناجاتێکی حاجی بە نمونە دێنێتەوە کە بە زمانی کوردی کردوویەتی و دەڵێت:" مەعلومە حاجی بۆچی مەدحت دەکا بە کوردی** تا کەس نەڵێ بە کوردی نەکراوە مەدحی باری"، هەروەها حاجی بەتەواوەتی ئەو بۆچوونە ڕەتدەکاتەوە کە خوێندن بە زمانی کوردی بە ناڕەوا دادەنێت.

نوسەر هاتووە لەمبارەیەوە چەند کۆپلە شیعرێکی حاجی دەکاتە نموونە کە ئاماژە دەکات حاجی بەگژ ئەوانەدا چووەتەوە خوێندن و نووسین و ئامۆژگاریی و وتاردانیان بە ناڕەوا زانیوە و ڕەخنەیان لەو مەلایانە گرتووە کە کارێکی وا بکەن. پاشان لە باسکردنی هەوڵی مەلایانی کورد بۆ خزمەتی گەل و نیشتیمانەکەیان، لێکۆڵەر نمونە بە نامەکەی

مەلای گەورە دەهێنێتەوە کە بەزمانێکی زۆر سیاسیی و کوردپەروەرانە دەینوسێت و بۆ ئەفسەری سیاسی ئینگلیزی دەنێرێت لە ساڵی ١٩٢٠. لەو نامەیەدا مەلای گەورە داوای دەستەبەرکردنی مافەکانی گەلی کورد و دروستکردنی قەوارەیەکی سەربەخۆ و ئازاد بۆ کوردستان دەکات.

لێکۆڵەر دەڵێت: مەلای گەورە بەبیانووی کوفر و ئیمان دژایەتی بەریتانیای نەکردووە و زانیویەتی مافەکانی کورد لە ڕێگەی ئەوانەوە بەدەست دێت. مەلای گەورە زانیویەتی دەوڵەتی عوسمانی کەوتووەتە دەستی تورکە تۆرانییەکان و چیتر کەڵکی ئەوەی نییە وەک خەلافەت سەیر بکرێت.

٤. کەڵکوەرگرتن لە پێشکەوتنە نوێیەکان و ڕۆیشتن لەگەڵ گۆڕانکارییەکان، وەک پێشتر ئاماژەی پێدرا، حاجی قادری کۆیی، هانی گەلی کورد دەدات لە شیعرەکانیدا بەرەو خوێندن و وەرگرتنی زانیاری هەنگاو بنێن و چاوکراوە بن و خۆیان لە ئەفسانە و خورافات ڕزگار بکەن. بۆ ئەو مەبەستەش بەکارهێنانی ڕۆژنامە و گۆڤاری وەک هۆیەکی سەرەکی ناساند. بە بۆچوونی نووسەر، بەهۆی ئەوەی حاجی قادر کاریگەر بووە بە بزوتنەوەی ڕیفۆرمخوازی لە میسر و هاوچوونییەکی تەواو لە شێوازی بیرکردنەوەی حاجی قادر و ڕابەرانی ئەو قوتابخانەیەدا هەیە.

لە گرنگترین تایبەتمەندییەکانی ئەم قوتابخانەیەش بانگەشەکردنە بۆ کەڵکوەرگرتن لە شارستانیەتی ڕۆژئاوا. لێکۆڵەر نموونەش بە پارچە شیعرێکی حاجی دەهێنێتەوە کە تێیدا بە ڕاشکاوی بە سەرسامییەوە باس لەوە دەکات گەلانی تورک، ئینگلیز، ڕووس... هتد شۆڕشیان کردووە و لە کاروباری سیاسیی و پرسی چارەنووسسازدا هاوڵاتیان بەشداری پێدەکەن. هەروەها حاجی، لە شیعرەکانی دیکەیدا ڕوو لە وانە دەکات کەوا خەریکی فاڵگرتنەوە و خورافیاتن و دەڵێت واز لەو کارە پڕوپوچە بێنن و چاو لە ئەوروپا بکەن لە ڕێگەی زانستەوە خەریکی پێشکەوتنن و هێڵی ئاسن ڕادەکێشن و بورجی ئیڤڵ بەرز دەکەنەوە. هەوڵەکانی مەلای گەورەش لەمبارەیەوە هیچی لە حاجی قادر کەمتر نییە. لێکۆڵەر، ئاماژە بە چەند جێگەیەکی تەفسیرەکەی مەلای گەورە دەکات کەوا تێیدا مەلای گەورە بانگەشە بۆ کەڵکوەرگرتن لە شارستانیەتی ئەوروپا دەکات. بەڵام هیچ نوسینێکی لێوە نەگواستووەتەوە.

هەرچی مامۆستای خاڵیشە، وەک کەسایەتییەکی کاریگەر بە قوتابخانەی ڕیفۆرم، بیرۆکەی وشیارکردنەوەی میللەتەکەی کردەیی دەکات. مامۆستای خاڵ، چالاکانە ڕوو لە کاری ڕۆژنامەنووسی دەکات. لە ڕێگەی گۆڤاری گەلاوێژەوە (١٩٣٩-١٩٤٩)، هزرە نوێخوازییەکانی بڵاودەکاتەوە. گۆشەیەکی گۆڤارەکە تایبەت دەکات بە تەفسیر و هەرجارە و تەفسیری ئایەتێک دەکات لەسەر ڕێبازی قوتابخانەی ڕیفۆرمخوازی شێخ عەبدۆ. جگە لە گۆڤاری گەلاوێژ، شێخی خاڵ، گوتاری ڕۆژنامەنووسی لە گۆڤارەکانی(بڵێسە، ڕۆژی

نوێ، ژین، هیوا، ژیان) بڵاودەکاتەوە.

هەروەها مامۆستای خاڵ، هەستاوە بە نووسینەوەی فەرهەنگی خاڵ و خزمەتێکی باشی زمان و ئەدەبی نەتەوەکەی خۆی کردووە. پەندی پێشینانی کۆکردوەتەوە و لێکدانەوەی بۆ کردووە و چاپی کردووە. لێکۆڵینەوەی لەسە دیوانی شێخ ڕەزا کردووە. دەکرێ بڵێین هەموو هەنگاوەکانی شێخی خاڵ نوێگەری بوون لە هزری چینی ئاینخوازدا و خزمەتێکی دیار و بەرچاویش بووە بە زمان و ئەدەب و فەرهەنگ و کەلەپووری نەتەوەکەی خۆی.

٦. نوێکردنەوەی گوتاری ئیسلامی و هەوڵدان بۆ گۆڕینی پڕۆگرامی خوێندن و ئاسانکردنی زانستەکان.

زۆرن ئەو زایانەی کەوا لە جیهانی ئیسلامیدا هەوڵی ئاسانکردنی زمانی خوێندن و زانستیان داوە. بە پاڵفتەکردنی کتێب و سەرچاوە ئیسلامییەکان لە وشە و چەمکە فەلسەفییە قوڵەکان کە کاتێکی زۆری دەوێت بۆ تێگەیشتن. لێکۆڵەر لەم کتێبەدا ئاماژە بەوە دەکات کەوا ئیبنوئادەمی باڵەکی لە پێشەنگی ئەو زانایانەی کوردە کە بەم کارە هەستاوە. ئەویش لە ڕێگەی نوسینی کتێب بە کوردی، پاڵفتەکردنی کێب و بچوککرنەوەی قەبارەکەیی و بەکارهێنانی وشەی ئاسان تێیدا. دواتر لێکۆڵەر، لەم بوارەدا دێتە سەر هەوڵەکانی مەولانا خالید.

مەولانا هەستاوە بە نوسینی کتێبێک بە زمانی کوردی. تێیدا باس لە عەقیدەی ئیسلامی دەکات و بە زمانێکی زۆر سادە و بەبێ گەڕانەوە بۆ بابەتەکانی زانستی کەلام، بنەماکانی ئیسلام شی دەکاتەوە و بەجۆرێک هەموو کەس تێی بگات. پاشان دێتە سەر حاجی قادری کۆیی، ئەویش بە هەمانشێوە هەستی بەوە کردووە کە دەبێت چاوخشاندنەوە بە پڕۆگرامی خوێندندا بکرێت. نموونەی بە چەند پارچە شیعرێکی حاجی هێناوەتەوە کەوا خوێندکار نابێت تەنیا خۆی تەرخان بکات بە خوێندنی هەندێک کتێبی کۆن و زۆر ڕۆچوون لە زمانی عەرەبی و بەسەربردنی تەمەن لەگەڵ حاشییە و قەید و تەزبیب. بەڵکو دەبێت بەگرنگییەوە سەیری زانستە گەردوونی و پیشەسازییەکانیش بکرێت. هەرچەندە نوسەری کتێب، نوسینی تەفسیر بە زمانی کوردی لەلایەن مەلا محەمەدی کۆییەوە و تایبەتمەندییەکانی ئەم تەفسیرە، ناخاتە ئەم خانەیەوە، و لە خانەی هەوڵی نوێخوازی لەسەر ڕێبازی ڕیفۆرم هەژماری کردووە. بەڵام، بێگومان دەتوانین ئەم کارەش هەر لەم چوارچێوەیە دابنێین. هەروەها لە چوارچێوەی ئەم تەفسیرەدا بە کۆمەڵێک کار هەستاوە کەوا، هەر دەکرێت لە خانەی نوێکردنەوەی گوتاری ئایینی و گۆڕینی پڕۆگرامی خوێندن و نووسینەوە.

مەلای گەورە تەفسیرەکەی کردووەتە مەوسوعەیەکی هزریی و زیاتر بابەت و پرسە هزرییەکانی تێدا دەوروژێنێت. بەپێچەوانەی زۆربەی تەفسیرەکانی پێشوو کە زیاتر گرنگییان بە لایەنی زمانەوانی، فیقهـ داوە. هەروەها دژایەتی گێڕانەوەی ئیسرائیلیات دەکات و پێیوایە لەمپەرێکن لە بەردەم تێگەشتنی دروست بۆ ئایەتەکان و لە مەبەستی سەرەکی دورتدەخەنەوە.

نووسەر، هەوڵەکانی مامۆستای خاڵ لەم بوارەدا بەرز دەنرخێنێت و بەباشی تیشکیان دەخاتە سەر. ئاماژە بەوە دەکات کەوا لە سەردەمی شێخی خاڵدا ڕەوشی ئاییندارى لە کۆمەڵگەی کوردیدا لە قەیرانی قوڵدابووە، وتاری ئایینی زۆر بێ مانا بووە و نەیانتوانیوە ڕۆحی گوێگران تێر بکەن و شتی سوودبەخشیان پێ بگەیەنن. بەڵام شێخی خاڵ بیرکردنەوەی لە سەروو ئەوە بووە و، هەوڵە نوێخوازییەکانی لە ئاستێکدا بووە، بووەتە جێگەی ئومێدی ڕۆشنبیران. قانعی شاعیر یەکێک بووە لەو کەسایەتییانەی نامەی دەستخۆشی و پێهەڵدانیان لەمبارەیەوە بۆ نووسیوە.

> **مەلای گەورە تەفسیرەکەی کردووەتە مەوسوعەیەکی هزریی و زیاتر بابەت و پرسە هزرییەکانی تێدا دەوروژێنێت. بەپێچەوانەی زۆربەی تەفسیرەکانی پێشوو کە زیاتر گرنگییان بە لایەنی زمانەوانی، فیقهـ داوە.**



نمونە بەوە دەهێنێتەوە شێخی خاڵ، ڕازی نەبووە چی تر ئەو مەولودنامەیە بخوێنرێتەوە کە ١٥٠ ساڵ لەوەو پێش نوسراوە و پڕی بووە لە شتی پڕوپوچ. هەستاوە بۆخۆی کورتەیەک لە ژیاننامەی پێغەمبەری نووسیوەتەوە و کردوویەتی بە مەولودنامە. هەروەها نوسەر، وتەیەکی خاڵ دەنوسێت کە پوختەی ئەوەیە بەشێک لەو وتارانەی ڕۆژانی هەینی پێشکەش دەکرێن خۆراکێکی تەمیز نین بۆ موسڵمانان و بەکەڵکی سەردەم نایەن. بەپێچەوانەوە ئەیچوێنێت بە خۆراکێکی گەنیو کە هەرکەس بیخوات وەک ژەهری خواردبێت وایە. پاشان لێکۆڵەر، دێتە سەر باسکردنی تەفسیرەکەی مامۆستای خاڵ و گرنگترین تایبەتمەندییەکانی دیاری دەکات. کە ئەویش خۆی دەبینێتەوە لە: گرنگیدان بە باسکردنی حیکمەتەکانی تەشریعی ئیسلامی، گرنگیدان بە لایەنی ئەدەبی و چاکسازی کۆمەڵایەتی، باسکردنی ئیعجاز، کەمتر لا کردنەوە بەلای جیاوازییە فیقهییەکان، دورکەوتنەوە لە خورافیات و ئیسرائیلیات و ڕاستکردنەوەی هەڵەکانی بیروباوەڕی مسوڵمانان و لادانەکانیان، بەراوردکردنی بیروباوەڕی ئیسلامی لەگەڵ بیرە نوێیەکان و بەرز ڕاگرتنی بیری ئیسلامی.

ئەوەی تائێستە باسمان کرد، گرنگترین خاڵی هاوبەشی نێوان هەوڵ و کۆششەکانی ئەم مەلایانەیە کە لە بواری نوێکردنەوەدا کردوویانە. نووسەری کتێب، هاتووە لێکۆڵینەوەکەی بەش بەش کردووە و هەربەشە تایبەتە بەیەکێکیانەوە. هەر لە سەرەتای لە دایکبونییانەوە

تاوەکو دەستپێکردنی خوێندن و پێگەیشتن و پاشان هەوڵە نوێخوازیەکانیانی نووسیوە. بەڵام وام بینی کەوا بۆئەوەی پوختەیەک بە خوێنەر بگەیەنرێت کورتەی ژیاننامە لێ گەڕێم و پوختەیەک لە هۆیەکانی پێگەشتنی هەموویان بنووسم. بەهۆی نزیکی هۆکارەکان لە یەکتری چەند ناونیشانێکم هەڵبژارد کارم لەسەر کرد. پاشان هەوڵە ڕیفۆرمخوازییەکەشیانم بەوشێوەیە لێ کرد.

چەند ناونیشانێکم دانا و هەوڵی هەریەکەیانم لەو بوارەدا نووسییەوە کە لێکۆڵەر هێناویەتی. ئەوەی تاوەکو ئێستا بۆمان ساغ بووەتەوە دەتوانین ئیبنوئادەمی باڵەکی بە باوکی ڕۆحی پێشەوایانی ڕیفۆرمخوازی نێو نەتەوەی کورد هەژمار بکەین. ڕیفۆرمخوازێک کە چەندین مەلای بلیمەت و زانای لێهاتووی وەک مەولانا خالید و حاجی قادر و مەلای گەورە و چەندانی تر ئیلهام لە بۆچوو ن و تێڕوانینەکانی وەردەگرن و مەشخەڵی ڕێگەیان پێ دەتروسکێننەوە.

ئیبنوئادەم نموونەی بەرزی مەلایانی کوردە، چەندین ساڵ پێش زانایانی جیاواز لە زمانەکەی هەستی بە کەموکورتییەکان کردووە و وەک کەسێکی بوێر ڕیفۆرمی ئاینی هێناوەتە کایەوە. ئەمەش شاهیدی زیرەکیی و لێهاتوویی و پێشەنگی مەلایانی کوردە لە زانستە ئسلامییەکاندا و بەرزی گیانی بەرپرسیارێتییانە.

ئێمە ئەمڕۆ پێویستی زۆرمان بە زیندووکردنەوەی ئەم کەلەپوورە هەیە و پێویستە سەرچاوەکانی بیرکردنەوە و هزرمان خۆماڵی بکەین و پێشەنگەکانی خۆمان لە هاوزمانەکانمان بەدی بکەین. تاوەکو ڕەنجی ئەوانیش بە خەسار نەچێت و ڕیفۆرمێکیش خۆمان پێی هەستین کاریگەریی و سەنگێکی زیاتری بۆ پەیدا دەبێت. ئەوەی لە ژیانی ئەم مەلایانە تێبینی دەکرێت جوامێری ئەم مەلایانەیە کە بۆ خزمەتی ئایین و ژیانی میللەتەکەیان لە هیچ شتێک نەسڵەمیونەتەوە و هەوڵی چاکسازی ڕیشەییان داوە بۆ قەیرانە قوڵەکان کە بەرۆکی نەتەوەی کوردیان گرتووە لە قۆناغە جیاوازەکاندا. لەم پێناوەشدا باجی زۆریان داوە، تا گەیشتووەتە ڕادەیەک خۆشیان دەربەدەر و ئاوارە بوون لەسەری.

لێکۆڵەر، لە باسی ژیانی هەریەکێکیاندا، بە ناچارییەوە بابەتێکی ئازاربەخشی نوسیوە لەژێر ناوی (کۆسپەکانی بەردەم پرۆژە چاکسازییەکەی، یان هۆییەکانی سەرنەکەوتنی). ئێمەش بە کورتی دەیاننوسین. پشتگیری کردنی بابانی و عوسمانییەکان لە تەریقەتی قادری لە بەرامبەر پرۆژەکەی مەولانا خالید دا. هەروەها مەولانا خالید بۆخۆشی لە ڕەچەڵەکێک نیە شێخ و سەید بێت. بەڵکو لە تیرەی میکایەڵییە عەشیرەتی جاف بووە. ئەمەش وایکرد شێخەکان لە پێگەی مەولانا کەم بکەنەوە. لە سەردەمی مەلای گەورەشدا گرنگترین هۆکارەکان بریتی بوون لە: پاشکەوتوویی کۆمەڵگەی کوردی و داخراوی ناوەندە ئاینییەکان. نەبوونی هۆیەکانی چاپکردن و بڵاوکردنەوە کە تاوەکو ساڵی ٢٠١٠ تەفسیری مەلای گەورە بەتەواوەتی بەچاپ نەگەیەنرا بوو. ڕوودانی کۆمەڵێک ڕووداو

بەسەر ڕەوشی ڕۆشنبیری کوردستان و هاتنی داگیرکەران و کەنارخستنی ناوەندە ئاینییەکان. نائارامی سیاسیی و دواکەوتوویی ڕەوشی ئابووری. کۆسپەکانی بەردەم پرۆژەی مامۆستای خاڵ بریتین: داخراوی ناوەندە ئاینییەکان و قەبوڵنەکردنی ڕیفۆرم، بنەماڵەی خاڵ کە سەر بە ڕێبازی نەقشبەندی بوون نەیدەتوانی زۆر ئازادانە بیروڕاکانی دەربڕێت، وەزیفە و قازیەتی، نائارامی سیاسی.

ئەنجام: ئەوەی باسمان کرد بریتی بوو لە پوختە و ناوەڕۆکی کتێبەکە، هەرچەندە لە هەندێک شوێن تێبینیم هەبوو دەربارەی ڕێکخستنی کتێبەکە و لە چەند جێگەیەک چەند پارچە نوسینێکم بە تێهەڵکێشێکی ناپێویست دەبینی. بەڵام ئەوەندە بە گرنگم نەبینی لێرەدا لەسەری بدوێم و خوێنەری پێوە سەرقاڵ بکەم. بەڵام بە پوختی چەند تێبینیەک دەنووسم کە پێموایە جێبەجێکردنیان، جوانییەکی زیاتر بە کتێبەکە دەبەخشێت و ڕێکوپێکتری دەکات.

نوسەر هەر لە سەرەتاوە کەمێک دەربارەی ڕیفۆرمی ئایینی دەدوێت، دواتریش دەچێتە سەر ئیبنوئادەم و لە چەند جێگەیەک کەمێکی تر دەربارەی ڕیفۆرم دەنوسێت. پێموایە ئەم بچڕبچڕییە لاببرێت و لە سەرەتاوە باسێکی پوختی ڕیفۆرم بکرێت تاوەکو کەسی خوێنەر بکەوێتە سەر ڕێگەی مەبەست و چی تر پێویست نییە بە بچڕبچڕی باسی لێوەبکرێت.

پاشان نووسەر لە ژیاننامەی هەریەکە لە حاجی قادر و مەلای گەورە و مامۆستای خاڵ، چەند جار ئەماژە بەوە دەکات کەوا بزوتنەوەی ڕیفۆرمخوازی لە میسر لەسەر دەستی ئەفغانی و عەبدە، کاریگەری لەسەریان هەبووە. کەچی نووسەر هیچ دەربارەی ئەم بزوتنەوەیە و سەردەستەکانی نالێت. تاوەکو دەگاتە چەند لاپەڕەیەکی پێش کۆتایی لەگەڵ باسی مامۆستای خاڵدا تێکهەڵکێشی دەکات. تاڕادەیەک تێکەڵییەک دروست دەبێت. ئەگەر نووسەر ئەم پارچە نووسینەی تایبەت بە ئەفغانی و عەبدەی بهێنایەتە سەرەتا و لە پاش باسکردنی ڕیفۆرم و ڕێ و شوێنەکانی. وەک نمونەیەکی بەرجەستەی کردەیی کردنی ڕیفۆرم لە جیهانی ئیسلامیدا، نوسیبای و نموونەی بە ئەفغانی و عەبدۆ هێناباوە باشتر دەبوو. پاشان برۆیشتایەتە سەر ڕیشەی ڕیفۆرم لە کوردستان. ئەو کات هەر لە ژیاننامەی حاجی قادرەوە خوێنەر زانیاری دەبوو دەربارەی ئەو بزوتنەوەیەی کە کاریگەری لەسەری هەبووە و زانیارییەکان بێ خوێ نەدەبوون. نەک لەکۆتاییەوە، بیزانێت.

هەروەها بەڕێزیان ئاماژە بەوە دەدەن کە مەلای گەورە کاریگەر بووە بە محەمەد عەبدە و قوتابخانەی ڕیفۆرم لە میسر. بەڵام ئاشکرایە کە مەلای گەورە بۆخۆی خاوەنی بۆچوون و تێروانینی تایبەت بە خۆی بووە و خۆی پێشڕەوی نوێخوازیی و ڕیفۆرمە و هیچی لە عەبدۆ کەمتر نییە و ناتوانم بڵێم پێی کاریگەرە. بەڵکو دەکرێت بڵێین بیرکردنەوەیان لەیەکەوە نزیکە.





سەلاح سالار

## سواڵەیەک بۆ سەر خەرمانی ژیانی میری شاعیرانی کورد

# هێندێ زانیاریی نوێ سەبارەت بە نالی

شاعیری مەزنی کورد، مەلا خدری نالی، ناوی زۆر دەهێرێت و باسوخواسی هەمیشە گەرموگوڕە، کوانووەکەی سارد نەبووەتەوە و ڕەنگە هەتا هەتایە هەر میوانی خوانەکەی هەبن و کۆتایی نەیەت. نالی توێژینەوە و لێکۆڵینەوەی زۆری لەسەر کراوە و دەکرێت، لەگەڵ ئەوەشدا حەقی خۆیەتی چەندین کاری دیکەشی لەسەر بکرێت. جگەلەوەی شیعرەکانی بەردەوام لێکدانەوە و خوێندنەوەی نوێی بۆ دەکرێت، ژیانی تایبەتیی ئەم شاعیرە گەورەیە تەمومژی زۆری لەسەرە و لێرە و لەوێ شەنوکەوی خەرمانی ژیانی دەکرێت و ناوبەناو زانیاری زیاترمان دەستدەکەوێت.

ساڵانی پێشتر ئەوەندەمان دەزانی نالی ناوی (خدری کوڕی ئەحمەدی شاوەیسی ئالی بەگ)ی میکائیلی جاف بووە. ژین و مەرگی نالی، گومانی زۆری لەسەر بوو، خۆشەویست و هاوسەری نالی فرەی لەسەر نووسرا، ئایا ئەسڵەن حەبیبەیەک بوونی هەبووە، یان ڕەمز و نیشانەیە؟ ئایا ئەم شاعیرە گەورەیە هاوسەرگیریی کردووە، یاخود بە ڕەبەنی ژیاوە و مردووە؟ تەنانەت لەسەر نازناوەکەشی ڕاجیایی زۆرمان بۆ دروستبوو، هەرکەسە و کۆمەڵێ بەڵگەی دەخستە ڕوو کە ئایا (ناڵی) بووە، یان (نالی)؟ زۆر گۆشەی تری ژیانی نالی تاریک و نووتەکە. نالییەک بەو گەورەییەی خۆی دڵ و دەروون و ماڵی هەموو کوردێکی ڕۆشنکردەوە، کەچی ماڵەکەی ئەو ئەنگوستەچاوە و لە دەلاقەی بچووکەوە نەبێت ڕووناکایی کۆشکە گەورەکەی نابینین!

## ڕەچەڵەکی نالی

لە دیوانی نالییدا تەنیا ئەوە باس کراوە نالی، ناوی خدری کوڕی ئەحمەدی شاوەیسی ئالی بەگی میکایەڵییە. باب و باپیرانی نالی هەر ئەوەندەمان دەناسیی و دەزانی. بەڵام ساڵی ٢٠١٩ نووسەر خوسرەو جاف ڕۆمانی (شازادە و شاعیر)ی بڵاوکردەوە. ئەو ڕۆمانە باسی ژیانی شاعیری گەورە نالییە. لە پێشەکی ڕۆمانەکەیدا نووسەر دەڵێت: چوار ساڵ سەرقاڵی نووسینی ئەو ڕۆمانە بووم و سەردانی کەسوکاری نالییم کردووە و زانیاریی زۆرم لەسەر ئەو شاعیرە دەستکەوتووە. سەبارەت بە باب و باپیرانی نالی، خوسرەو جاف دەڵێت: نالی (خدری کوڕی ئەحمەد، کوڕی شاوەیس، کوڕی قەرەوەیس، کوڕی مستەفابەگ، کوڕی وەیس، کوڕی عەلی بەگە.

لێرەدا، پاش زیاتر لە یەک سەدە، ئینجا زانیمان ڕەچەڵکی نالی کێیە و باپیرانی ناویان چییە. سەبارەت بە کەسایەتییە دیارەکانی ئەو خانەوادەیە هێشتا زانیاریی ئەوتۆمان لەبەر دەست نییە و تازبەتازە هەندێ تەپوتۆز لەسەر ژیاننامەیان ڕادەماڵرێت و کەمێ زانیارییمان بەردەست دەکەوێت. ساڵی ٢٠٢٠ هەواڵێکی نوێم دەستکەوت کەوا زانای گەورە مەولانا خالیدی نەقشبەندی ئامۆزازای نالیی مەزنە. ئەویش لە پەڕەی تایبەتی نووسەر و شارەزای مێژووی هۆزی جاف (خالید شاسوار یاخیانی)، لە تۆڕی کۆمەڵایەتیی فەیسبووک، کە کورتە نووسینێکی نووسیبوو سەبارەت بە مەولانا خالید و نالی. لەو نووسینەی ئەودا بەم شێوەیە باسی باپیرانی نالی دەکات: خدری کوڕی ئەحمەد، کوڕی شاوەیس، کوڕی قەرەوەیس، کوڕی مستەفابەگ، کوڕی وەیس، کوڕی ئێل بەگی جاف، کوڕی موراد بەگ.

سەبارەت بە مەولانا خالیدیش دەڵێت: خالید، کوڕی ئەحمەد، کوڕی حسێن، کوڕی قەرەوەیس، کوڕی مستەفابەگ، کوڕی وەیس، کوڕی ئێل بەگی جاف، کوڕی موراد بەگ. بەم پێیە مەولانا خالید و نالی ئامۆزازا (بنئامۆزا)ن. لەگەڵ نووسینەکەی خوسرەو

جافدا تەنیا یەک جیاوازیی هەیە ئەویش لە کۆتا ناودا لای خوسرەو جاف عەلی بەگە و لای ئەویش ئێل بەگی جافە. تەنانەت لەگەڵ نووسینەکەی دیوانی نالی لای کۆچکردوو مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیسیش نزیکە، چونکە ئەویش دەڵێت: کوڕی ئەحمەدی شاوەیسی ئالی بەگییە. ئەم ئالی بەگەش هەر لەو دوو ناوەی دیکەوە نزیکە. من لە ڕێگەی نامەی ئەلیکترۆنییەوە پەیوەندییم بە نووسەری مێژووی هۆزی جاف کاک (خالید شاسوار یاخیانی)یەوە کرد و پرسیاری سەرچاوەی ئەو زانیارییەی بنەماڵەی مەولانا خالید و نالییم کرد، گوتی: نووسراوی ماڵی (لالۆ بەکری گوندی بێستانسوور)مان لایە و ئێمە و بێستانسوورییەکان لەگەڵ نالی و مەولانا خالید شەجەرەمان هەیە کە نەوەی قەرەوەیسین.

بۆ دڵنیابوونەوەی زیاتر پەیوەندییم بە کاک ئەسکەندەر مام بەکری سەرۆکی تیرەی ئاڵی بەگییەوە کرد لە گوندی بێستانسوور، سەبارەت بەو شەجەرەیەی مەولانا خالید و نالی، ناوبراو جەختی کردەوە کە ئەو دوو کەسایەتییە گەورەیە ئامۆزازای یەکترن و لەگەڵ ئەواندا لە قەرەوەیسدا بەیەک دەگەنەوە. ئەڵبەت دەربارەی تیرەی میکایەلی، کەریم بەگی فەتاح بەگی سەرۆکی پێشووتری هۆزی جاف، لە کتێبەکەی خۆی (تەئریخی جاف) دا دەڵێت: تیرەی میکائیلی چوار فیرقەیە: محەمەدئەلی وەیسی، ڕەشوبۆری، شوانکارە، ئاڵی بەگی. لە شوێنێکی دیکەدا دەڵێت: ئەم فیرقەیە پیاوی مسوڵمانی زۆریان هەبوو، حەزرەتی مەولانا خالید و نالی لە فیرقەی ئاڵی بەگیین.

سەبارەت بە مەولانا خالید هەرچی سەرچاوەیەک هەیە کە باسی ژیانی ئەو زانایەی کردووە تەنیا گوتوویانە: خالیدی کوڕی ئەحمەدی کوڕی حوسێن. لەوە بەدەریان باس نەکردووە و نەزانیوە. بەڵام ساڵی لەدایکبوون و مردنەکەی زانیاریی لەسەری هەیە، کە لە ١٧٧٧ یان ١٧٧٩ لەدایکبووە و لە ١٨٢٧\٦\١٨ لە شام، بە نەخۆشیی تاعوون کۆچی دوایی کردووە. نالییش لە ١٧٩٩ یان ١٨٠٠ لەدایکبووە و لە ١٨٧٧\١١\٢٣ کۆچی دوایی کردووە. واتا مەولانا خالید بیست ساڵێک لە نالی گەورەتر بووە و ٥٠ ساڵیش پێش نالی کۆچی دوایی کردووە.

ساڵانی ڕابردووتر دکتۆر زرار سدیق تۆفیق، کە توێژەرێکی دیار و خامە بەبڕشتە لە مێژوودا، لە گۆڤاری (خاڵ، ژمارە ٢٥ی تشرینی یەکەمی ٢٠١٩) بابەتێکی لەسەر باپیرانی مەولانا خالید بڵاوکردەوە، کۆمەڵێ زانیاریی تری خستە سەر مەڵۆی باوانی ئەم زانا گەورەیە. پاشتر ئەو توێژینەوەیە و چەند توێژنەوەیەکی دیکەی لە دووتوێی کتێبێکدا بەناوی (لەبارەی مێژوو و کولتووری کوردییەوە) بڵاوکردەوە، کە نووسینەکەی دەوڵەمەندتر کردووە. دکتۆر زرار ئەگەرچی باسی باپیرانی مەولانا خالید دەکات، بەڵام باسی باپیرانی دوورتر و ڕەنگە لە پشتی شەشەم بەولاوەی باسکردبێت و زانیارییەکانی ئەو نێوەندە پچڕا بێت و ئەویش دەستی پێی ڕانەگەیشتبێت، چونکە خۆی ئاماژەی پێکردووە بەهۆی نەبوونی سەرچاوە و باسنەکردنی باوانی مەولانا خالید لە بەڵگەنامە

و نووسراوەکانی ئەو سەردەمانەدا، زانیاریی بەردەست نین و بەو سانایيە پەیدا نابن.

ئەوەی دکتۆر زرار پێیگەیوە و باسی دەکات باپیرە هەرە گەورەی مەولانا ناوی ئیسماعیلی گۆرانییە. لەو توێژنەوەیەدا بەناونیشانی (پیرمیکائیل و باپیرانی دی مەولانا خالید) نووسەر دەڵێت: ئیسماعیلی گۆرانی، باپیرە هەرە گەورەی مەولانا خالید، خۆی بە نەوەی عوسمانی کوڕی عەفان زانیوە، لە ساڵی ٦٤٤ک - ١٢٤٦ز لە دیمەشق مردووە و لە گۆڕستانی سۆفییان نێژراوە. کوڕەکەی ناوی میکائیل بووە بەڵام هەواڵ و زانیاریی دەربارەی نییە، کوڕی میکائیل ناوی فەخرەدین ئیبراهیمە، کوڕی ئیبراهیمیش ناوی قوتبەدین میکائیلە. ئەمانە هەموو خۆیان بەنەوەی خەلیفەی چوارەم عوسمانی کوڕی عەفان دەزانن.

ئەم میکائیلە ناسراوە بە پیرمیکائیلی شەش ئەنگوست، کە باپیرەی تیرەی میکایەڵییە، کە عەشرەتەکەی نالی و مەلاونا خالیدە.

بەهەرحاڵ من نامەوێت بابەتەکەی خۆم بە باسکردنی ڕەچەڵەکی مەولانا خالیدەوە درێژ بکەمەوە، ئەمەشم بۆ ئەو مەبەستە نووسی تاکو بیبەستمەوە بە نالییەوە و ئەوە بسەلمێنم کە نالی و مەلانا خالید بنئامۆزا (ئامۆزازا)ن. تەنیا ئەوە دەخەمە ڕوو کە نووسینەکەی دکتۆر زرار زانیاریی باشی پێداوین لەسەر باوانی مەولاناخالید و ئەو ئەڵقە پچڕاوەی پاش خالیدی ئەحمەدی حسێن تا دەگاتە میکائیلی کوڕی ئیبراهیمی کوڕی میکائیلی کوڕی ئیسماعیلی گۆرانی، پڕکردووەتەوە. ئەو بۆشاییەی کە نووسەر دەڵێت: چوار بۆ پێنج سەدەیەک دەبێت، ڕەنگە ئەو چەند ناوە بێت کە باسمان کردن. ئەگەریش زۆرە ئەم ناوانە لەو زەمەنە زیاتربن و شیمانەی ئەوە دەکەم هەندێکی نازناو بێت و بووبنە ناوی حەقیقی، یاخود لە تەمەنێکی زووتردا هاوسەرگیرییان کردبێت و وەچەیان زووتر خستبێتەوە.

لەو سەردەمەدا باوبوو خەڵک ڕەچەڵکی خۆی بباتەوە سەر هاوەڵانی پەیامبەر (د.خ)، کە ئەمەش وایکردووە خەڵک نەک ڕەچەڵەک، بەڵکە نەژادی خۆیشی گۆڕیوە، واتا لە کوردەوە بۆ عەرەب، یان هەر نەتەوەیەکی تر.

لەو توێژینەوەیەدا دکتۆر زرار زانیارییەکی دیکەمان پێدەدات، کە من بە مەبەست لێرە باسی دەکەم، چونکە ئەویش هەر دەرژێتە سەر جۆگەلەی ژیانی نالی. ئەو دەڵێت: (ژێدەرە مێژووییەکان هیچیان باسی ئەوەیان نەکردووە، کە نەوەیەکی عوسمان هاتبێتە کوردستان و نیشتەجێ بووبێت، ئەوەندە هەیە لە دەستپێکی سەردەمی عوسمانییدا ماڵباتی (خادم السجادة)ی کورد دەرکەوتن و خۆیان بە نەوەی ئەبانی خەلیفە عوسمان دادەنا، گوایە ئەو بەرماڵەی لە کنیانە و خۆیان بە خزمەتکاری دەزانن، هەمان بەرماڵی پێغەمبەرە (د.خ) کە بەخشیبووی بە عوسمان و پاشان بۆ ئەبانی کوڕی مابووەوە ).

ماڵباتی خادم سوجادە باوانی (دڵدار)ی شاعیرە. لە دیوانی دڵداریشدا لە ژیاننامەکەیدا کە بەدەستوخەتی خۆی نووسیویەتییەوە تیشکی خراوەتە سەر، بەڵام ئامادەکاری دیوانەکە (عەبدولخالق عەلادین)، بەهەر پاساوێک بێت، ئەو بەسەرهاتەی نەگواستووەتەوە

و لایبردووه، له پەراوێزیشدا ئاماژەی پێداوە و دەڵێت: (دڵدار بە درێژی باسی ئەو بەرماڵەی پێغەمبەر دەکات، کە چۆن کەوتووەتە دەست بنەماڵەکەیان و بەهۆی ئەوەوە نازناوی (خادم السجادة)یان وەرگرتووە. بەپێویست نەزانرا لەم دیوانەدا باس بکرێت ).

لەم ڕۆژانەی پێشوودا کتێبێکی نوێ بەناوی (دیوانی ڕەئووف ١٨٧٠ ـ ١٩٤٣) چاپکرا. مەلا ڕەئووفی خادم سوجادە باوکی دڵداری شاعیرە، لەم کتێبەدا دوو زانیاریی نوێمان بەردەست کەوت: یەکەم: پەیوەندیی بە ڕەچەڵەکی نالی و خۆیانەوە هەیە. دووەم: پەیوەندیدارە بە هاوسەرگیریی نالییەوە.

مەلا ڕەئووف کوڕی مەحموودی کوڕی مەلا سەعدە. لەم شیعرەدا باسی خزمایەتی خۆیان و نالی و مەولانا خالید و حاجی قادری کۆیی دەکات. ڕوونیشی دەکاتەوە لە نالییەوە نزیکترن. لە شیعرەکەدا بۆمان ڕوون دەبێتەوە کە مەلا سەعد و نالی ئامۆزازان. شاعیر دەڵێت:

لە جوابی مەلەکدا دەڵێم

**لە جوابی مەلەکدا دەڵێم: من عەبدێکی کوردی زوبانم**
**هەزار هێندەم لێ ڕا بخوڕن، غەیری ئەوە هیچ نازانم**
**تەوەلودم لە کۆیە بووە، کوردستانە مەفتەنی من**
**پیرمیکائیل جەدی منە و دەڵێن لە ئالی عوسمانم**
**عەللامە سەعدی باپیرەم بنمامی حاجی نالی بوو**
**هەم کیژی خۆیشی پێدابوو، هەر ئەوەندەی لێ دەزانم**
**مەولانا خالد قەدەمێک، لە نالی دوورتربوو لێمان**
**خزمایەتی حاجی قادر، لە دایکم خاڵە و خاڵوانم**
**پوورزای مەحموودی باوکمە و هەم دوو قەندیلەی کۆییانم**
**ئامۆزای باوکی زەهوەیە، هاوحەیات نووری چاوانم**
**(ڕەئووف)ێکم عەبدی خودا و خزمەتچی قاپی کۆیەمە**
**هەروەک باوکیشم فەرمووی: کۆیە نەسەبە و عینوانم**

ئەم شیعرە شەش بەیتە، بەڵام هێندەی شەست لاپەڕەی توێژینەوەکان زانیاریی خێرای پێبەخشین. بۆ نموونە:

یەکەم: بنەماڵەی خادم سوجادەی کۆیە نەوەی میکایەڵی جاف و پشتی نالیین.

دووەم: دەیسەلمێنێت کە نالی و مەولانا خالید یەک پشت و نزیکن، بەڵام خۆیان لە نالییەوە هەنگاوێک نزیکترن. واتا خزمایەتییەکە زۆر نزیکە.

سێیەم: نالی لە کوردستان هاوسەری هەبووە، کە پووری مەلا ڕەئووفە.

چوارەم: نالی حاجی بووە. ڕەنگە ئەوکاتەی پووری مەلا ڕەئووف هاوسەری بووبێت

نالی حاجی بووبێت. واتا بەرلەوەی کوردستان بەیەکجاریی بەجێبهێڵێت حاجی بووبێت.

پێنجەم: ئەوەش باس دەکات کە بیستوویەتی نەوەی عوسمانی کوڕی عەفانن.

شەشەم: حاجی قادری کۆیی پوورزای مەحموودی باوکیەتی.

حەوتەم: حاجی قادر هاوکات ئامۆزای خەزووریشی بووە. وەک دەڵێت: ئامۆزای باوکی (زەهوە)یە.

هەشتەم: حاجی قادری کۆیی بە خزمایەتی بە نالی گەشتووەتەوە، لە ڕێگەی هاوسەرییەوە، چونکە پوورزای زەینەب خاتوونی هاوژینییەتی.

لە دیوانی دڵداریشدا باسی ئەم خزمایەتییە کراوە، (دڵدار ١٩١٨ ـ ١٩٤٨) دەڵێت: (دایکم ناوی زەهوەی کچی خورشید ئەفەندییە، فامیلیای دایکم عەلەمزادەن و لە زەهاوەوە هاتوونەتە قەراغ زێی کۆیە، وە ئیسکانیان کردووە، تا حاجی قادری کۆیی مەشهوور لەم فامیلیایەیە). بەپێی شیعرەکە بێت، حاجی قادری کۆیی ئامۆزای خورشید ئەفەندی باوکی زەهوەیە، کە دەکاتە خەزووری مەلا ڕەئووفی شاعیر و باپیری دڵداری شاعیر لە سەری دایکەوە.

## نالی و هاوسەرگیری

پێشتر تەنیا ئەوەمان دەزانی کە نالی خۆشەویستێکی هەبووە بەناوی (حەبیبە)، ئەمەش جێگەی گومان بوو، هەندێک ئەوەیان تەنیا بە ئاماژە و ڕەمزی شیعریی دەزانی. مامۆستای مودەڕیسیش وەک خۆشەویستی نالی دەیسەلماند. تەنانەت حەبیبەی ماڵیاوا، ئایا هەم حەبیبەیەک هەیە وەک کەسی دیاریکراو؟ هەم ماڵیاوا هەیە وەک گوندێک؟ ئەمەش جێگەی مشتومڕی کۆن و نوێ بووە. هەندێکی تر دەیانگووت: نالی هەر بە ڕەبەنی ژیاوە و مردووە و لە پاش ئەوەی حەبیبەی وەدەست نەهێناوە، ئیدی سەری خۆی هەڵگرتووە و ژنیشی نەهێناوە. ئەم گێرەوکێشەیە لەسەر تەمەنی نالیش هەبوو، هەردووکی بەهەڵواسراویی هێڵرابووەوە تا ساڵی ٢٠١٧، دکتۆر هێمن عومەر خۆشناو هەردووکی یەکلایی کردەوە. د.هێمن عومەر لەناو بەڵگەنامەکانی عوسمانییدا بەڵگەی دۆزییەوە کە ساڵی مەرگی نالی یەکلایی کردەوە، هەروەها بەڵگەشی دۆزییەوە کە نالی ژنی هەبووە و ناویشی (زەینەب) بووە.

د.هێمن لە بەڵگەنامەکانی عوسمانییدا ناوی زەینەبی وەک هاوسەری نالی هێناوە و لەکتێبەکەیدا باسیکردووە، بەڵام زانیاریی دەستنەکەوتووە کە زەینەب کێیە و کچی کێیە و خەڵکی کوێیە و تەنانەت چی نەتەوەیەکیشە، کورد، یان تورک، یاخود عەرەبە. بۆیە هەرخۆیشی چەند ئەگەر و پرسیارێکی بەجێهێشتووە کە ئایا زەینەب کێیە و ئەرێ نالی لەکوێ ژنی هێنابێت و...هتد.

کۆشش و ڕەنجە زۆرەکەی دکتۆر هێمن جێگەی ڕێزی هەموان بوو، تەمومژێکی

یەکجار زۆری لەسەر نالی ڕەواندەوە. بەڵام هەوڵەکەی ئەویش بەهۆی نەبوونی بەڵگەی سەلمێنەرەوە نەگەیشتە پایان.

ئێستا ئەم پارچە شیعرە دەچێتە پاڵ هەوڵەکانی د.هێمن عومەر و پێمان دەڵێت: نالی هەرگیز ڕەبەن نەبووە و تا مردووە هاوسەری هەبووە و پاش مەرگی ئەویش هاوسەری هێشتا لەژیاندا بووە، وەک لە کتێبەکەی نالی لە بەڵگەنامەکانی عوسمانییدا ئەوە هاتووە، کە زەینەبی هاوسەری داوای مووچەی هاوسەرەکەی کردووە، ئەوکاتە زەینەب لە مەککە بووە و پێنج ساڵیش پاش مەرگی نالی داوای مووچەکەی کردووەتەوە. ئێستا پاش ١٤٤ ساڵ لە کۆچی دوایی شاعیری گەورە نالی، لە بن دەستی خۆمان و لە هەولێرەوە بەهۆی دیوانی (ڕەئووف)ـەوە زانیمان نالی هەر لە کوردستان، هاوسەری هەبووە و لە پشت و ڕەچەڵەکی خۆی بووە و تەقریبەن ئامۆزازای خۆیشی بووە. ماوەتەوە ئەوەی بزانین هاوسەرەکەی نالی، کە کەنیشکی مەلا سەعدی زانا بووە ناوی چی بووە؟ ئەمە ئەو مەتەڵەیە ساڵانێکە نەزانراوە.

عوسمان موفتی پێشەکییی بۆ دیوانی ڕەئووف نووسیوە و هەندێ زانیاریی بەنرخی خستووەتە بەردەستمان کە بەهایەکی زۆری تێدایە و وەک چرایەک ڕێگەی تاریکیی بەرەو ماڵی نالیی و مەولانامان بۆ ڕۆشن دەکاتەوە. عوسمان موفتی، کوڕی خوالێخۆشبوو ڕەشاد موفتییە، ڕەشاد موفتییش برازای زانای گەورەی هەولێر مەلا ئەفەندییە. مەلا ئەفەندی و مەلا ڕەئووفی خادەم سوجادە خاڵۆزاوپوورزان، ئەم خانەوادەیە خاوەنی پێگەی زانستیی و کۆمەڵایەتیی بەرزن. لەو پێشەکییەدا لە زاری عیزەدین مەلا ئەفەندی ئامۆزای باوکییەوە باسی ئەوەمان بۆ دەکات کە مەلا ئەفەندی گوتوویەتی نالی و مەولانا خالید خزمی مەلا سەعدن و لەلای ئەو دەرسیان خوێندووە و تەنانەت  مەلا خدری نالی کچی عەللامە مەلاسەعد خێزانی بووە، کە ناوی خاتوو زەینەب بووە.

ئێستا تەمی سەر پەنجەرەکەمان سڕییەوە و بەتەواوی بەرچاومان ڕوون بووە، کە ئەو زەینەب خاتوونەی لە بەڵگەنامەکانی عوسمانییدا ناوی هاتووە، کە هاوسەری شاعیری گەورەی کورد، نالی بووە و پێنج ساڵ پاش مەرگی نالی، لە شاری مەککە داوای مووچەی هاوسەرەکەی کردووە، کوردە و خەڵکی شاری کۆیەیە و کچی مەلا سەعدی خادم سوجادەیە و ئامۆزازای نالی خۆیەتی.

ئەگەرچی د.هێمن عومەر خۆشناو، ڕەنجی باشی داوە و توانی جارێکی دی نالی بە کورد بناسێنێتەوە، کە هەوڵەکانی ئەو جێگەی نرخاندنی زۆرە و کارئاسانیی بۆ لێکۆڵەران کرد، ساناتر دەست بۆ خوێندنەوە و شیکردنەوەی ژین و مەرگی نالی ببەن. بەڵام لەپاڵ کۆششە زۆرەکەیدا داخی ئەوەی خواردبوو زانیاریی تەواوی لەسەر هاوسەرگیریی نالیی دەستنەکەوت و نازانرێت زەینەب خانم کێیە.

ئەمڕۆ پاش ئەم زانیارییە نوێیە و بەبێ ئەوەی بچین ئەرشیفی ئەستنەبووڵ و ئاستانە

و هەگبەی عوسمانییەکان بگەڕێین و ڕێگەی وشکی بیابانی عەرەبستان تەی بکەین، هەر لە پیرە هەولێری خۆمان لە کن قەراتێ، یاخود لە کۆیە و لە کوچەیەکی بەفری قەندی، زانیاریی خۆماڵییمان چنگکەوت و زانیمان زەینەب خانمی هاوسەری نالی خاتوونێکی کوردی تیرەی ئاڵی بەگی عەشیرەتی میکایەڵیی و کیژێکی ڕەسەنی گەڕەکی بەفری قەندی شاری کۆیەیە.

کچەکەی مەلا ڕەئووف کە ناوی زەینەب خانە و ناسراوە بە کچە کورد، ئەم خاتوونە هەم شاعیر و هەم نووسەریش بووە و خوشکی گەورەی دڵداری شاعیرە، دوور نییە مەلا ڕەئووفی خادم سوجادە زینەبی کچی بەناوی زەینەب خاتوونی پوورییەوە ناونابێتەوە، کە کچی مەلا سەعدەدین (مەلا سەعد)ە و هاوسەری نالیی شاعیرە.

مەلا سەعدەدینی خادم سوجادە، کە ناسراوە بە مەلا سەعد ئەگەر ئامۆزازای نالییش بێت، بەڵام جیاوازیی تەمەنیان هەیە، بەگوێرەی ئەو پێشەکییەی عوسمان موفتی بێت مەلا سەعد ساڵی ١٨٣٧ لە شاری کۆیە و لە گەڕەکی بەفری قەندی کۆچی دوایی کردووە. نالی لە ١٨٧٧ شەربەتی مەرگی نۆشیوە، واتا ٤٠ ساڵ پاش خەزووری مەلی گیانی لە شەقەی باڵی داوە، بەڵام مەولانا خالیدی ئامۆزازایان زووتر مەرگ بەرۆکی گرت، مەولانا ١٠ ساڵی ڕێک بەر لە کۆچی دوایی مەلا سەعدەدەین مردووە، هاوکات ٥٠ ساڵی ڕەبەقیش بەر لە مەرگی نالی کۆچی دوایی کردووە.

ئینجا کاتی خۆی هەموو سووربوون لەسەر ئەوەی نالی نیو سەدەیەک ژیاوە و ساڵی ١٨٥٦ لە ئەستەنبووڵ کۆچی دوایی کردووە، لەکاتێکدا مامۆستا مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس لە دیوانی نالییدا چەند بۆچوونێکی گواستووەتەوە سەبارەت بە لەدایکبوون و مردنی نالی. لەو هەموو نووسەرە دیارانەی کورد تەنیا مەسعوود محەمەد بۆچوونەکەی پێکابووی، کە گوتبووی: باپیرم، (حاجی مەلا عەبدوڵڵای جەلیزادە، باوکی جەنابی مەلای گەورەی کۆیە گێڕاویەتەوە و بێگومان قسەشی جێگای متمانەیە، کە وا لە ساڵی ١٢٨٨ک (١٨٧١ ـ ١٨٧٢) نالیی لە مەککە دیوە و زۆریش پیربووە). بەڵام لەگەڵ ئەوەی مەسعوود محەمەد خۆی و باب و باپیریشی لە ڕووی زانستیی و ڕاستگۆیی و هەموو بوارەکانەوە جێگەی متمانەی تەواو بوون، کەچی هیچ نووسەرێک ئەو قسەیەی مەسعوود محەمەدی نەسەلماند و هەموویان کە باسی نالییان دەکرد ساڵی ١٨٥٦یان بە مەرگی نالی دادەنا.

ئەم بابەتەم بۆیە گواستەوە تا بڵێم هەندێکجار مێژووی سینە بە سینە و زارەکی لە سەرچاوە نووسراوەکان زانیاریی باشترمان دەدەنێ و وردەکارییەکانیان دروستترە. بۆیە پاش ١٤٠ ساڵ لە مەرگی نالی، دکتۆر هێمن عومەر خۆشناو، لە بەڵگەنامەکانی عوسمانییدا دەستی گەیشت بە سەرچاوەی تەواو سەبارەت بە ساڵی مردنی نالی و تەنانەت مانگ و ڕۆژەکەیشی بۆ دۆزینەوە. بەڵگەنامەکان گوتیان نالی لە ١٨٧٧\١١\٢٣ لە ئەستەنبووڵ کۆچی دوایی کردووە.

پاش ساڵانێکی زۆر لە مشتومڕ، بەڵگەنامەکان گوتیان قسەکەی مەسعوود محەمەد ڕاستە و ئەو هەموو نووسەرەی تر نەیانپێکابوو.
مەبەستمە بڵێم: دەگونجێت سەرچاوە زارەکییەکانی خزمانی گوندی بێستانسوور و تیرەی ئالی بەگی میکایەڵی ڕاستبن و نالی و مەولانا خالید ئامۆزازای یەکتربن، چونکە ئەم بۆچوونانە یەکتر بەهێز دەکەن، ئەوەی خوسرەو جاف چووەتە ناو کەسوکاری نالی و چوار ساڵ سەرقاڵی کۆکردنەوەی زانیاریی بووە بۆ نووسینی ڕۆمانەکەی.
بەڵگە و نووسراوەکانی لێکۆڵینەوەکەی دکتۆر زرار سدیقیش کە بەردەوام هەوڵی باش دەدات و لەناو کونوقوژبنی سەرچاوە دێرینەکاندا زانیاریی لەسەر کەسایەتییە دیارەکانی کورد دەدۆزێتەوە و ساغیان دەکاتەوە، لێکۆڵینەوەکەی ئەویش لەگەڵ ئەم زانیارییانەی ئێرە نزیکن و یەکتر بەهێزتر دەکەن.

### نالی و حاجی قادری کۆیی

حاجی قادری کۆیی، قادری کوڕی مەلا ئەحمەدی کوری مەلا ساڵحی کوڕی حاجی ئەحمەدی گەورە ١٨٢٥ ـ ١٨٩٧. ئەم شاعیرە زۆر سەرسام بووە بە نالی و ستایشی بەرزیشی کردووە، تەنیا ئەو نموونەیە بەسە کە دەڵێت:

**نالی ئوستادەکی گەلێ چا بوو**
**خدری ئابی حەیاتی مەعنا بوو**

ئەم بەیتەشیعرە لێکدانەوەی زۆر هەڵدەگرێت: یەکەم: وەسفی نالی بە مامۆستایەکی بەرز (ئوستاد) دەکات. دووەم: خدر کە ناوی نالییە، ئاماژەیە بۆ خدری زیندە، واتا ئەم ناوە و ئەم پیاوە هەرگیز نامرێت و ناوی هەمیشە زیندووە. سێیەم: ئاوی حەیاتی مەعنا، واتا مانای وشەکانی نەمرن، چونکە قووڵن لە واتادا و بەرزن لە وشەئارا و بەلاغەتدا.
حاجی قادر نزیکەی بیست و پێنج ساڵێک لە نالی بچووکترە، هەروەها بیست ساڵیش پاش نالی کۆچی دوایی کردووە. ئەم بنەماڵەیە لەناوخۆیاندا زۆر تێکەڵن و لە چەند سەرێکەوە پەتی خزمایەتیی بە یەکیانەوە دەبەستێتەوە و کالای بالایان دەچنێت و دەدوورێت.
ساڵانی ڕابردوو پرسیارێک وەک مارە تۆپیو لە بەردەمی کۆڵەر و توێژەراندا بوو، ئایا حاجی قادر نالی بینیوە؟ چ لە کوردستان و چ لە ئاوارەیی و دەرەوەی نیشتمان؟ ئێستا گومانەکە هێدی هێدی دەڕەوێتەوە و ئەگەر نالی لای مەلا سەعد خوێندبێتی و کچی ئەویشی خواستبێت، حاجی قادریش خوشکەزای مەلا سەعد بووبێت یان خوشکەزای هاوسەرەکەی بووبێت، چونکە لەگەڵ مەحموودی کوڕیدا دەبنە پوورزا، واتا حاجی قادری کۆیی و زەینەب خاتوونی هاوسەری نالی پوورزای یەکن، کەواتە نالی و حاجی قادر هەر لە کۆیە یەکتریان دیتووە و ڕەنگە نالی هەندێ وردە دەرسیشی پێ گوتبێت،




هاوکات هەردووکیان لە ئەستەنبووڵیش کۆتایی ژیانیان بەڕێ کردبێت، حەتمەن لەوێش ئاگایان لەیەک بووە و کورد هەمیشە لە غەریبایەتییدا باوانی کوردە و دەست بەیەکەوە دەگرن، جگە لەوەی هەردووکیان خزمن، هاوکات شاعیر و ئەهلی زانست و ڕۆشنبیرێکی بەرز و دوو پیاوی کوردپەروەریشن، ئەمەش هۆکارێکە بۆئەوەی هەمیشە پەیوەندییان بەیەکەوە هەبووبێت. بۆیە بەدووریشی نازانم حاجی قادر ئەو شیعرەی پاش مەرگی نالی نووسیبێت و یادی ئەو شاعیرە بەرزە جگەری سووتاندبێت، کە هەمیشە پێی سەرسام بووە و سەنا و ستایشی کردووە.

لە شوێنێکی دیکەدا ناوی نالی پێش ناوی خستووە و دەڵێت:

**نالی و خاکی بەبە، حاجی و کۆیە بە مەسەل**
**عەینیی حــافز و شــیرازە کەلیم و هـەمەدان**

لە شیعرێکی تردا شانازیی بە نالییەوە دەکات و دەڵێت:

**بەیتی نالی و بەیتی من گەر تێکەڵی یەکتر دەکەن**
**ئەحمەقی سوورەتپەرست و جاهیلی مەعنانەزان**
**حاجی لەکلەک لەک بە لەک فەرقی لەگەڵ تووتی هەیە**
**وەک هەزاری نەوبەهار و بولبولی فەسڵی خەزان**

لە شیعرێکی دیکەش دیسانەوە خۆی بە نالی نزیک دەکاتەوە و دەبێژێت:

**زاهیرەن بەیتم لە نالی و کوردی زۆر کەمتر نییە**
**تالعم بەرگەشتەیە، بەدبەختە بەختم نووستووە**

لە شیعرێکی دی، باڵابەرزیی و گەورەیی نالی دەخاتە ڕوو، دەڵێت:

**سەد قوببەیی خەوەرنەق و سەددی سکەندەری**
**ناگـاتە بەیتەکـاولی نالــی و مــەتانەتی**

لە شیعرێکی تردا بۆ ئەوەی خۆی بنوێنێت، بەراورد بە نالی و کوردی دەکات و بە گەورەیی ئەواندا خۆی گەورە پیشان دەدات:

**بەجێما نالی وەک ناڵی، بە پاش کەوت کوردی وەک گەردی**
**کە حــاجی غاری دا ئەســپی لە مــەیدانی سوخەندانی**

لە شیعرێکی تریشدا دیسانەوە نالی دێتەوە سەر زاری و باسی دەکاتەوە:

**ونی مەکەن وەکوو ئاساری نالی و کوردی**
**لە سەهوی دیدە بپۆشن، گوزەر بکەن لە خەتا**

ئەم هەموو باسکردن و سەرسامبوونە بە نالی، ڕەنگە جگە لە لووتکەی شاعیریی

نالی، خزمایەتییەکەش گەرموگوڕیی خستبێتە سەر زمان و پەنجەی حاجی قادر لە بەرانبەری ئەو شاعیرە مەزنەدا.

بەرلەوەی دەرگای لێکۆڵینەوەکە دابخەین، ڕەنگە پرسیارێک وەک کارگ قوت ببێتەوە، باشە بۆچی تائێستا کەس نەیگوتووە: مەولانا خالید ئامۆزازای نالییە؟ بۆچی باسی خزمایەتی حاجی قادر و نالی نەکراوە؟! ئەم پرسیارانە حەقی خۆیەتی، بەڵام ئەوەتا پاش ١٤٤ ساڵ لە کۆچی دوایی نالی، ئینجا خەڵکی سلێمانی و کۆیە و هەولێر دەزانن ماڵباتی نالی و خادم سوجادە بڕبڕەپشتی یەکن، ئینجا دەزانین نالی لە کن ئەوان خوێندوویەتی و لەوێش هاوسەرگیریی کردووە و بە ڕەبەنی ئاوارەی ئەستەنبووڵ و حیجاز نەبووە.

ئەم گریمانەیە بۆئەوەش درووستە کە ڕاستبێت مەولانا خالیدی شارەزووریی و نالی ئامۆزازای یەکتربن و ئەو درەختی بنەماڵەیەی لای خزمانی ئاڵی بەگییە لە گوندی بێستانسوور و خزمانی دیکەی میکایەڵی دۆڵی جافایەتی ڕاست و دروست بێت و تەنیا ئەوەی تیا هەبێت بەهۆی فەرامۆشکردنیەوە درەنگ درکی پێکرابێت، ئەم گلەییەش دەکەوێتە سەرشانی هەموو نووسەر و لێکۆڵەرانی پێشتری ئەم گەلە، چما کاری مەیدانییان نەکردووە و تەنیا ملیان لە بەڵگەنامە و نووسراوەکان ناوە و بەتەنێ ئەوانەیان کردووەتە چاوگی بابەتەکانیان؟

لە کۆتاییدا دەبێت بڵێمەوە ئەم لێکۆڵینەوەیە خاکەڕایە بۆ ئەو بابەتە سەختە، تەنیا هەوڵێکی سەرەتایە و ئەم بابەتە کاری وردتر و قووڵتری دەوێت. دڵنیام هەموومان بگەڕێین هەر لە ناوچەکانی خۆمان شتی باشمان دەست دەکەوێت، وەک چۆن ئەم دیوانە شیعرە پاش ٧٨ ساڵ لە مەرگی شاعیرەکەی (ڕەئووف مەحموود مەلا سەعد) چاپکرا و لە یەک پەڕەدا باوەشێ زانیاریی پێداین و کوڵێ دڵخۆشی کردین. ئەگەر شەجەرەی ماڵباتی (خادم السجادة) دەستبکەوێت و تەماشای بکرێت، ڕەنگە ئاماژەی تێدا هەبێت بۆ ژیانی نالی و هەندێ گۆشەی تاریکی دیکەی ئەو شاعیرە مەزنەمان بۆ ڕوون بکاتەوە و بمانگەیەنێت بە زانیاریی زیاتر.

لەکۆتایی ئەم لێکۆڵینەوەیەدا من ددانی پێدا دەنێم ئەوەی کردوومە و نووسیومە کارێکی خاکەڕایە، دەبێت زێتر بکۆشین خەرمانی ژیانی نالی و مەولانا خالیدی شارەزووریی نەقشبەندی شەنوکەو بکەین. هەموومان دەزانین خەرمان لە شارا و شارا لە مەڵۆ و مەڵۆ لە سواڵە پێکدێت.

من سواڵەیەک گەنمم دروێنە کردووە، بەو هیوایەی هەموومان گوڵەوچنییەکی ژیانی ئەم زانا گەورانەی خۆمان بکەین و بتوانین باشتر ئەو باڵابەرزانەی لەناو ئەم گەلە بەشمەینەتدا هەڵکەوتوون بناسین و هێندەی ئەوان تەقەلایان بۆ نەوەی پاش خۆیان هەبووە، ئێمەش چنگێ لەو قەرزەیان بدەینەوە.

## پەراوێزەکان

– مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس و فاتیح عەبدولکەریم، دیوانی نالی، چاپی سێیەم، چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد – بەغدا، ١٩٧٦، ل ٢٣.

٢ – خوسرەو جاف: شازادە و شاعیر، ژیانی نالی. ناوەندی ئاوێر، چاپی یەکەم: چاپخانەی ڕۆژهەڵات، هەولێر. ٢٠١٩. ل ٧.

٣–پەڕەی تایبەتیی نووسەر: خالید شاسوار یاخیانی، لە تۆڕی کۆمەڵایەتیی فەیسبووک: https://www.facebook.com/profile.php?id=100038283451094

٤ – پەیوەندیی لەگەڵ خالید شاسوار یاخیانی، لە ڕێگەی نامەی فەیسبووکە، ڕۆژی ٢٠٢٠\٩\١٠.

٥ – پەیوەندیی تەلەفۆن لەگەڵ کاک ئەسکەندەر ئەبوبەکر، سەرۆکی تیرەی ئاڵی بەگی جاف، شەوی ٢٠٢١\٩\١٧.

٦ – کەریم بەگی فەتاح بەگی جاف: تەئریخی جاف، چاپی یەکەم، ب.ش، ١٩٩٥ بەغدا. ل ١٢٥.

٧ – کەریم بەگی فەتاح بەگی جاف، س.پ. ل ١٢٧.

٨ – د. زرار سدیق تۆفیق: لەبارەی مێژوو و کولتووری کوردییەوە. ناوەندی ڕۆشنبیریی جەمال عیرفان، چاپخانەی تاران، ٢٠٢١، ل ٢٠٢ ـ ٢١٣.

٩ – دکتۆر زرار سدیق تۆفیق: لەبارەی مێژوو و کولتووری کوردییەوە. س، پ.

١٠ – دکتۆر زرار سدیق تۆفیق:. س، پ. ل ٢٠٧.

١١ – عبدالخالق علاء الدين: دڵدار، شاعیری شۆڕشگێڕی کورد. بغداد ١٩٨٥. ل ١٣.

١٢ – دکتۆر کەمال غەمبار: دیوانی ڕەئووف، مەلا ڕەئووفی خادم سوجادە. چاپی یەکەم، چاپخانەی فێربوون، هەولێر، ٢٠٢١. ل ١٧٨ ـ ١٧٩.

١٣ – عبدالخالق علاء الدين: دڵدار، شاعیری شۆڕشگێڕی کورد. س..پ. ل: ١٣.

١٤ – هێمن عومەر خۆشناو: نالی لە بەڵگەنامەکانی عوسمانیدا، چەند زانیارییەکی تازە. لەبڵاوکراوەکانی دەستنووسخانەی زانکۆی سۆران، چاپی یەکەم.٢٠١٧.

١٥ – هێمن عومەر خۆشناو: نالی لە بەڵگەنامەکانی عوسمانیدا. س.پ. ل ٣٠.

١٦ – دکتۆر کەمال غەمبار: دیوانی ڕەئووف، مەلا ڕەئووف. س.پ. ل: ٧١.

١٧ – مەلا عەبدولکەریم مودەڕیس و فاتیح عەبدولکەریم: دیوانی نالی، س.پ. ل ٣١.

١٨ – هێمن عومەر خۆشناو: س.پ.




تەوەرێکی نوێی گۆڤاری خاڵە و
کۆمەڵێك بابەتی هەمەچەشن
دەخـاتە بـەر دیـدی خـوێنەرانـی



نووسینی: فەرەیدون ئەحمەد پێنجوێنی



# ڕووداوێکی لەیەکچوو
# لە ئەدەبی عەرەبی و ئەدەبی کوردیدا:

لە ئەدەبیاتی عەرەبیدا گێڕدراوەتەوە کە کابرایەك لە زانایەك دەپرسێت: وشەی الـ(كموج) مانای چیە؟ ئەویش دەڵێت: ئەو وشەیەت لە کوێ خوێندووەتەوە؟ کابراکە دەڵێت: بۆچی نەتبیستووە؟ لەو دێڕە شیعرەی شاعیری ناودار (امرو القیس)دا هاتووە کە دەڵێت: (ولَيْلٍ كَمَوْجِ البَحْرِ أَرخَي سَدَولَهُ.... عَلَيّ بِأنْواعِ الهُمُومِ لِيبْتَلي)، زاناکە دەڵێت: ئەها، الـ(کموج) چوارپێیەکە دەخوێنێتەوە، بەڵام لە شت حاڵی نابێت و تێناگات...! لەڕاستیدا وشەکە بریتییە لە(ک) واتە: «وەك» لەگەڵ وشەی (موج)دا کە بەواتای «شەپۆل» دێت، بەڵام کابرا کردوویەتی بە یەك وشە و بەدوای ماناکەیدا گەڕاوە...

لە ئەدەبیاتی کوردیشدا، مەلا محەممەدی شەڵماشی لە کتێبی (خاپەڕۆ) لەلاپەڕە (١٧٧)دا لە زمانی (هەژار)ی شاعیرەوە دەگێڕێتەوە کە وتوویەتی: کابرایەك بەناوی (کەریم ئەیـووبی) تێزی دکتۆرای لەسەر شیعرەکانی هەژار نووسیبوو، دەبوایە شیعرەکانی هەژاری بە نمونە وەربگرتایە، جا ئەڵێت ڕۆژێك نامەیەکی بۆ هاتووە لەو (کەریم ئەیـووبی)یەوە تیایدا نوسیویەتی: برا، وشەی (پەڕوعە) بەچی دەڵێن؟ ئەو وشەیە کوردی کوێ بەکاریدێنن؟. ئەڵێ: منیش بۆم نووسی نازانم، تۆ شیعرێکی خۆمم بۆ بنێرە کە ئەو وشەیەی تێدابێت. دیارە بۆی دەنێرێت کە ئەمە دێڕەشیعرەکەی هەژار بووە: (توتن و پەڕ و عەتر و بۆن)

هەژار ئەڵێت: منیش بۆم نووسی: برا، تۆ مانای (تروبۆن) لێکبدەرەوە، ئەوکات (پەڕوعە)ش ماناکەی ڕوون دەبێتەوە...!

دیارە کابرا وشەکانی تێکەڵکردووە و بڕگەی (تر)ی لە وشەی (عەتر) کردووەتەوە و بڕگەی (عە)کەی خستووەتە پاڵ وشەی پێشترییەوە و بووە بە (پەڕوعە).

# مۆڵەتنامەی پیشەگەریی
# لە مێژووی مسوڵمانان‌دا

وەك چۆن لە کەلەپووری ئیسلامیدا مۆڵەتنامە دراوە بە زانایان لە بوارەکانی جوانخوێندنەوەی قورئان (تلاوة القران) و گێڕانەوەی فەرمووده و مۆڵەتنامەی فەتوادان و مۆڵەتنامەی بوون بە زانا (ئیجازەی زانستی)، بەهەمان شێوە مۆڵەتنامە لە بوارە پیشەییەکانیشدا بە پسپۆڕانی ئەو بوارە دراوە، لە گشت پیشەکاندا، بەجۆرێك خاوەن پیشەیەك کە زانیویەتی کەسێك بەباشی لە پیشەکەیدا شارەزایی پەیداکردووە و مۆڵەتنامەی پێداوە. لەبەرئەوە لە هەر پیشەیەکدا (شیخ الحرفە) «گەورەی پیشە» یان بەزمانی ئەمڕۆ «وەستای وەستایان» هەبووە، ئیمامی سەخاوی لە ژیاننامەی زانایەکدا دەنووسێت:» ساڵی ٧٤٠ی کۆچی لەدایکبووە و لە پیشەکەیدا کە بەرگدروویی بووە هێندە پێشکەوتووە کە هونەری بەرگدروونی بۆ بەرگدرووان پێشنیاز کردووە«. مەرجی کەسی مۆڵەتدەریش ئەوەبووە کە لە پیشەکەدا زۆر شارەزا و بەتوانا بێت، لە هاوپیشەکانی شارەزاترین بێت، ڕەوشتبەرز بێت، دەستپاك و ئەمیندار بێت.

ـ بڕگەیەك لە نووسینێکی د.فەتحی مەلەکاوی لە کتێبی (مشروعات بحثية).



# ڕووانینی ڕووکەشانە

کاتێك ئیبلیس فەرمانی پێکرا کڕنووش بۆ ئادەم بنات، سەرنجی تەنها و تەنها لەسەر کڕنووشبردن بۆ ئادەم کورت ببوویەوە، ئەو سەرنجی نەدایە بابەتە گرنگەکە کە گرنگتر و گەورەتر بوو لە ئادەم و لە کڕنووشبردن بۆ ئادەم، ئەو بابەتە گرنگە: «فەرمان و ئەمری خوا» بوو، (أمر الله)، خوای گەورە پێیفەرموو: (مَا مَنَعَكَ أَلَّا تَسْجُدَ إِذْ *أَمَرْتُكَ*)، (چی ڕێگریی لێکردیت لە کڕنووشبردن کاتێك «فەرمانم پێ کردیت»؟)..

چەندین ساڵ و زەمەن تێپەڕ بوو بەسەر ئەو ڕووداوەدا، یەکێکی دیکە لە دەرچووانی ئەو قوتابخانەیە، کوڕەکەی نوح (سەلامی خوای لێبێت) بەهەمان تێڕوانین بیری کردەوە، ئەو بەدید و سەرنجێکی ڕووکەشیانەی سادە سەیری لافاوەکەی کرد، وەك بابەتێکی کەشناسی مامەڵەی لەگەڵدا کرد، ئەو وتی:( سَآوِي إِلَى جَبَلٍ يَعْصِمُنِي مِنَ الْمَاءِ)، (پەنادەبەمە بەر کێوێك لە ئاوەکە دەمپارێزێت)، لەدیدی ئەودا پاراستن و ڕزگاربوون تەنها ڕزگاربوونە لە ئاوەکە و بەس. بەڵام دید و سەرنجی باوکی جیاواز بوو، ڕووکەشانە نەیدەبینی، تێڕوانینێکی قوڵتری هەبوو بۆ بابەتەکە، نوح بۆ کوڕەکەی ڕوونکردەوە کە بابەتەکە گەورەترە لە تەنها هاتنی ئاو و لافاوێك، بابەتەکە پەیوەندیی بە «فەرمان و ئەمری خوا»وە هەیە بە خنکان و لەناوچوونیان، نوح بەکوڕەکەی فەرمووی: (لَا عَاصِمَ الْيَوْمَ مِنْ *أَمْرِ اللَّهِ* إِلَّا مَنْ رَحِمَ)، (ئەمڕۆ، هیچ پارێزەر و پارێزراوێك نییە لە «فەرمان و ئەمری خوا» مەگەر کەسێك خۆی ڕەحمی پێبکات)، شەپۆلەکە چاوەڕێی کۆتاییهاتنی وتووێژەکەی نێوان ئەو کوڕ و باوکەی نەکرد و (وَحَالَ بَيْنَهُمَا الْمَوْجُ فَكَانَ مِنَ الْمُغْرَقِينَ) کوڕەی لولدا و لەچاو ونبوو و خنکا.

بەداخەوە، بەداخەوە هێشتا ئەو قوتابخانەیە بەردەوامە و زۆری دیکەش لەهەمان ئەو قوتابخانەیە پەروەردە بوون و لەهەمان ئەو قوتابخانەیە خوێندنیان تەواوکردووە، ئەمانە دەڵێن:

- نوێژ، تەنها جوڵە و وەرزشێکە.
- حیجاب، تەنها داپۆشینی سەر و قژە.
- حەج، تەنها دروشم و ڕێوڕەسمێکە.
- ڕەمەزان، ڕێجیمێکی باشە.

ئەمانە بیریان چووە کە بابەتەکە زۆر لەمە گەورەترە، بابەتەکە بریتییە لە «فەرمان و ئەمر»ی پەروەردگار، بابەتەکە تاقیکردنەوەیە، بابەتی پەرستنی خوایە..

جا، بۆئەوەی نەکەویتە ژێر سایە و کاریگەریی ئەو قوتابخانەیە، هەمیشە سەرەتا سەیری «فەرماندەر» بکە پاشان سەیری «فەرمان»ـەکە بکە، فەرمانەکە تاقیکردنەوەیەکە لەلایەن خواوە، تاقیکردنەوە بەوەی گوێڕایەڵ و فەرمانبەرداری دەبیت یان نا، پەروەردگاری (الخالق) یش هەرگیز فەرمانێك بە مەخلوقاتەکانی ناکات کە زیانیانی تێدا بێت..

# ڕۆمانی (سەردەمی کەمتیارەکان)

یەکێك لەو ڕۆمانانەی کە لە پێش بەهاری عەرەبی بڵاوکرایەوە و دەنگدانەوەیەکی گەورەی هەبوو، ڕۆمانێکی (ئەشرەف عەشماوی) بوو بەناونیشانی (زمن الضباع) (سەردەمی کەمتیارەکان)، ئەم ڕۆمانە، کە تایپی سیاسییانەی گرتووە و باس لە بارودۆخی کۆمەڵگەی دەسەڵاتدار و هاوڵاتیانی وڵاتانی عەرەبی دەکات خاڵی جیاکەرەوەی بریتییە لەوەی کە بە زمانی گیانداران نووسراوە، ئەمەش تام و چێژێکی تایبەتی بە گێڕانەوەی ڕووداوەکان بەخشیوە.

نووسەرانی عەرەب لە سایت و ڕۆژنامەکاندا شیکار و شرۆڤەیان لەسەر ڕۆمانەکە نووسی و ستایشیان کرد، بیهێنە بەرچاوی خۆت دەبێت بارودۆخی دارستان چی لێبێت کاتێك لەجیاتی شێر کەرکەدەنێکی تەممەڵ حوکمی دەکات؟ یان ئاخۆ هەر لە بنەڕەتدا کەرکەدەن چۆن توانی بگاتە لوتکەی دەسەڵات؟ بڵێی گیانلەبەران بەویستی خۆیان هەڵیانبژاردبێت و کردبێتیان بە گەورەی دارستان؟ بێگومان نا، بەڵکو ڕووداوەکە لەو پیلانگێڕییەوە دەستپێدەکات کە دژ بە شێری پاشای دارستان گیرایەبەر، بەڵێ ئێستا ئێمە لە ناوەڕاستی دارستانداین، لەو شوێنەی کە شێر لەسەر کورسیی دەسەڵات دانیشتووە، بەڵام بەهۆی لاوازیی دەسەڵاتییەوە ڕێگەی بە کەمتیارەکاندا دزە بکەنە ناو جومگەکانی دەسەڵاتەوە، هەر شێر بوو کە تیمساحی گەمژەی کرد بە پارێزگاری ئەو ناوچە دوورەدەستەی دارستان و چاوی پۆشی لە کارە ناڕەواکانی لە ترساندنی گیانلەبەرانی دانیشتووی ناوچەکە و برسیکردنیان. هەر شێر بوو ڕێگەیدا بە گەورەکردنی ئەفسانەی دەیناسۆر و داتاشینی سیناریۆی بوونی دایناسۆرەکان کە دواتر کەمتیارەکان بابەتەکەیان قۆستەوە بۆ کۆنترۆڵکردنی دارستانەکە و گەیشتنە دەسەڵات بەپاساوی ئەوەی دارستان هەڕەشەی لەناوچوونی قەوارەکەی لەسەرە.

«من پۆستی پاشای دارستانم وەرگرت پاش ئەوەی گەندەڵیی لە سەردەمی شێردا گشت لایەکی تەنی، هەڵبژاردنی من وەك فەرماندەی گشتییە، نەك پاشابم بەسەرتانەوە، تا سەردەمێکی نوێی پاکی بێگەندەڵی، بێگەندەڵی، بێگەندەڵی دەستپێبکەین»، ئەمە بڕگەیەکی ئەو وتارە بوو کە کەرکەدەن لە ئاهەنگی بوون بە حوکمڕانی دارستاندا بۆ گیانلەبەرانی خوێندەوە، کە کەمتیار و سەگ و مەیمون و گوێدرێژەکان بەچەپڵەیەکی گەرم قسەکەیان پێبڕی، و هاواریان دەکرد بژی کەرکەدەن، لورە خەماوییەکەی گورگەکانیش ئاماژەی دەستپێکردنی ئەو سەردەمە نوێیە بوون.

ئێستا، ئێستا دارستان موڵکی کەمتیارەکانە، کەرکەدەن تەنها ڕوکارێکە کە کەمتیارەکان لەڕێی ئەوەوە حوکم دەکەن و یاسا دادەنێن، دواتریش بەفەرمی بەیانییەك لە ئاڵوگۆڕێکی




هێمنانەی دەسەڵاتدا لە نێوانیاندا کەرکەدەن لە پۆستی سەرۆك لادەبرێت و بەفەرمی گەورەی کەمتیارەکان بەسەرپەرشتی ئەنجومەنی دانایانی دارستان دەبێتە سەرۆکی دارستان، گوێدرێژ و مەیمون و بەرازەکان پشکی گەورەیان لە ژیانی سیاسییدا بەرکەوتووە، مارەکان کاروباری کارگێڕیی دارستان بەڕێوەدەبەن و هەرگیانداریك سەرپێچی بکات چارەنووسی مردنە. گامێش کۆمەڵێك گیانلەبەری کۆکردووەتەوە و خۆپیشاندان دەکات و دەسەڵاتی نوێ بەنیازە یان سەرکوتیان بکات یان لێیانبگەڕێت و وانیشانی ڕای گشتی بدات کە ئەوە ئازادیی ڕادەربڕینە. (گا) ڕاوێژکاریی هونەریی کاروباری دارستانە، فیل بەڕێوەبەری گشتیی کاروباری نەتەوەیی دارستانە، چوار مەیمون کراونەتە بەرپرسی پسپۆڕییە هونەرییەکان، بەڕێوەبەری پارێزگاری دوورگەی پایتەختی دارستان ئەسپی دەریایە و مەڕیش بەڕێوەبەری دوورگەی ناوەندییە و کەرەکێویش پارێزگاری دوورگەی مەزن و سەگی دەریاش بۆ ئیدارەی دوورگە بچووکەکە دیاریکراون، لەکاتێکدا لە سەردەمی شێردا هەموو ئەم پۆستە گرنگانە بەدەست شێر و بەچکەشێرەکانەوە بوون.

ڕۆمانەکە بەمجۆرە دەچێتە ناو کۆمبارسی دەسەڵات و حوکم و جیهانی سیاسەتەوە و ئەوەی لەو جیهانەدا ڕوودەدات لە پیلانگێڕیی و بگرەوبەردە، دەخاتەڕوو، فەرماندە و سەرکردەکانی دارستان هەموویان ئامادەگییان هەیە: شێری کودەتابەسەرداکراو، ڕێوی کە بەرپرسی زانیاریی و ڕاپۆرتەکانی دارستانە و لە نووسینگەکەیدا ژمارەیەکی زۆر توتەڵەسەگ و گوێدرێژ کاردەکەن. گەورەی کەمتیارەکان دەسەڵاتدارە، کەنغەر بەڕێوەبەری مەراسیمی کۆشکە، گورگ و تاووس وتاری ڕۆژنامەکان دەنووسن کە تیایدا بە شانوباڵی دەسەڵاتی نوێدا هەڵدەدەن، بزن کاری وتەبێژیی و ئیعلامی دەکات، ئەمە جگە لە تیمی مۆسیقای کۆشك کە لە مەیمون و تاووسەکان پێکهاتوون و ڕێوڕەسمەکان بەڕێوەدەبەن. پڵنگ دڵتەنگە بە بارودۆخەکە و هیچی پێناکرێت، فیل کاری فەرمانبەریی خۆی دەکات و گوێ بە ڕووداوەکان نادات، ئەمانە و چەندین دیمەنی دیکە سەرنجت ڕادەکێشێت و حەزدەکەیت زووبەزوو دەستبدەیتە خوێندنەوەی ڕۆمانەکە تا بزانیت کۆتایی دەسەڵات بەکوێ دەگات.

ئایا تۆی خوێنەر ڕازیت لە سەردەمی کەمتیارەکاندا بژیت؟ ڕۆمانەکە بخوێنەرەوە وەڵامەکەیت دەستدەکەوێت.. کە لە خوێندنەوەیشی بوویتەوە دەستبەجێ هەڵدەستیت و پەنجەرەی ژوورەکەت دەکەیتەوە تا دڵنیا بیتەوە لەوەی ئاخۆ بەڕاست ئێمە لەهەمان دارستاندا ناژین...!!

ئەشرەف عەشماوی، نوسەری ڕۆمانەکە، دادوەرێکی میسرییە و لە دادگای تێهەڵچوونەوە کاردەکات، ڕۆماننووسە و شەش ڕۆمانی بڵاوکردووەتەوە، ساڵی ٢٠١٤ ڕۆمانی (البارمان) خەڵاتی باشترین ڕۆمانی عەرەبی وەرگرت.



# «حافزی شیرازی»ی ساختە

(٩٩٪)ی وتە و شیعرەکانی حافزی لە خۆرئاوا ساختەن، «ئومێد سافی» مامۆستای توێژینەوەی ئاسیا و خۆرهەڵاتی ناوەڕاست لە ئەمەریکا و بەڕێوەبەری «سەنتەری دیوك بۆ توێژینەوەی ئیسلامی» ڕایدەگەیەنێت کە (٩٩٪)ی ئەو وتە و شیعرانەی کە لە خۆرئاوا بڵاوە و بەناوی حافزی شیرازیی شاعیری مەزنی ئیسلام بڵاودەکرێنەوە، ساختەن و قسە و شیعری ئەو شاعیرە نین.

ئەو ئەکادیمییە ئەمەریکییە، وەك لە وتارێکیدا کە لە سایتی (الجزیرة) بڵاویکردووەتەوە ڕایگەیاند ساڵانە چەندین دەقی پێدەگات بۆ دڵنیابوون لە ڕاستێتیی ئەو وتانە کە گوایە هی بەناوبانگترین شاعیرە مسوڵمانەکانن، لەنێویشیاندا حافزی شیرازی (٧٩٢ك) و جەلالەددینی ڕۆمی (٦٧٢ك).

بەپێی وتەی «ئومێد سافی» پاش وردبوونەوە دەرکەوتووە شاعیرێکی ئەمەریکی بەناوی (دانیال لادینسکی) لەدایکبووی ١٩٤٨ کە ئیشی سەرەکی نوسینی کتێب و ناونانیەتی بەناوی حافزی شیرازی، زیاتر لە بیست ساڵە دەستیداوەتە ئەو کارە و شیعر و وتەکانی خۆی کە بەزمانی ئینگلیزیی بڵاویاندەکاتەوە، دەکات بەناوی ئەو شاعیرە مەزنەی خۆرهەڵاتەوە. جا ئەوەی کە جێی سەرسامییە ئەوەیە ئەو کتێبانە پڕفرۆشترین

کتێبن و لە خانەی «کاری سۆفیگەریی» لە کتێبخانەکانی ئەمەریکادا پۆلێن کراون.

ناوبراو دەڵێت ئازاربەخشە دان بەم ڕاستییەدا دەنێم، لەبەرئەوەی خەڵکێکی زۆر حەزیان لە وەرگێڕانەکانی حافزی شیرازییە کاتێك وەردەگێڕدرێن بۆزمانی ئینگلیزی و داناییەکی قوڵی تێدا ڕەنگدەداتەوە، بەڵام لەڕاستیدا ئەوانە قسەی ئەو شاعیرە ئەمەریکییەن و بەناوی (شیرازی)یەوە بڵاویان دەکاتەوە و دەبنە پڕفرۆشترین کتێب.

لای خۆیەوە ئەو شاعیرە، (لادینسکی)، لە کتێبێکیدا کە لە ساڵی ١٩٩٦دا بەناونیشانی (I Heard God Laughing) بڵاویکردووەتەوە و بووە پڕفرۆشترین کتێب، دانی بەوەدا ناوە کە ئەو وتە و شیعرانە «وەرگێڕان»ی شیعرەکانی حافزی شیرازی نین و ئەم هیچ شارەزاییەکی لە زمانی فارسیدا نییە و هیچ پەیوەندییەکی بە شیعر و هۆنراوەکانی حافزەوە نییە، بەڵام بانگەشەی ئەوە دەکات کە شیرازی شەوێك هاتووەتە خەوی و سەدان دێڕ لە شیعرەکانی خۆی بەزمانی ئینگلیزی بۆ وتووە و «داوای لێکردووم ئەم پەیامە بگەیەنمە هونەرمەند و توێژەران».

نمونەی ئەو دێرە ساختانەی ئەم شاعیرە ئەمەریکییە بەناوی حافزی شیرازییەوە بڵاویکردوونەتەوە:

...

«تەنانەت پاش ئەم هەمووزەمەنە
خۆر هەرگیز بە زەوی نەوت: «تۆ قەرزاری منیت».
سەیرکەن خۆشەویستییەکی ئاوەها
چۆن هەموو ئاسمانی ڕووناك کردووەتەوە».

******

«ترس، هــەرزانتــرین ژووری مــاڵە.
ئاواتمە لە دۆخێکی باشتردا بتبینم».

******

«دڵی تۆ و دڵی من
دوو هاوڕێی زۆر زۆر دێرینی یەکن».

# سەڵاحەددینی ئەییوبی، سەرۆکوەزیرانێکی کارامە

لە باسوخواسی سەڵاحەددیندا زیاتر ئەو وەك گەورەی وڵات ناسێنراوە، بەڵام لایەنێکی دیکەش هەیە پێویستە ئاماژەی پێبکەین. لە بەدواداچوونی ئەزمونی «وەزیرانی چاکسازی»دا لە مێژووی مسوڵمانانەدا دەرکەوتووە کە پۆستی «دامەزراوەی وەزارەت، یاخود کابینەی وەزاریی» لەسەر دەستی دوو کەسایەتیدا گەیشتووەتە ترۆپکی چاکسازیی و ڕێکخستنی ورد، ئەوانیش: (نیزامولـمولك) (٤٨٥ك مردووە) کە وەزیری سەلجوقییەکان بووە، لەگەڵ سەڵاحەددینی ئەییوبی (٥٩٨ك مردووە) کە دواهەمین سەرۆکوەزیری دەوڵەتی فاتمی بووە لە میسر. لەڕێی ئەم دوو وەزیرەوە - هەریەکەیان لە سەردەمی خۆیدا - و بەهۆی ئەو چاکسازییە ئیدارییی و زانستییە قوڵانەی بەسەر دامەزراوەی کابینەی وەزارییدا هێنایان، جیهانی ئیسلامی لە سەردەمێکی هەستیاری خۆیدا گەیشتووەتە دۆخی ئارامیی و سەقامگیری.

نیزامولـمولك لە دەوڵەتی سەلجوقییەکاندا بووە وەزیری ڕێپێدراو هاوتای سەرۆکوەزیری ئێستا - و بەگرتنەبەری چەندین ڕێوشوێنی زانستی و سیاسیی و سەربازی توانی لە کۆتاییدا مەزهەبی سوننی بۆماوەی هەزار ساڵی دوای خۆی لە سیستەمی دەوڵەتدا بچەسپێنێت.

هەرچی سەڵاحەددینی ئەییوبییە، بەپێی ئەو ڕاپۆرتەی کە سایتی (الجزيرة نێت) بڵاویکردووەتەوە، توانی ئەو سیاسەتەی نیزامولـمولك لەگەڵ کۆمەڵێك گۆڕانکاریی کە بۆ ژینگەکەی خۆی گونجاو بوو، لە سەردەمی وەزارەتی خۆیدا جێبەجێ بکات و بەوەش توانی ڕووبەڕووی نالەبارییەکانی سەردەمەکەی ببێتەوە.

سەڵاحەددین کاتێك چووە میسر و بووە وەزیری ڕێگەپێدراوی خەلیفەی فاتمی، کە هاوتای سەرۆکوەزیرانی ئێستایە، وڵاتی میسر ئەوکات دوو سەدەی تەواو لەژێر دەستی ئەو دەوڵەتەدا بوو کە مەزهەبی ئیسماعیلی - لقێکی مەزهەبی شیعەیە - کردبووە مەزهەبی فەرمیی وڵات. جا سەڵاحەددین بۆ توانەوەی ئەو دەوڵەتە، ڕووبەڕووی دەوڵەتی قوڵ (الدولة العميقة) بوویەوە کە ڕەگی لەناو دەوڵەتە ئاشکراکەدا داکوتابوو. هەردوو (نیزامولـمولك و سەڵاحەددین) لەوەدا لەیەك دەچوون کە یەکەمیان فارس بوو و وەزیری دەوڵەتێك بوو کە خەلیفە عەرەب بوو و سوڵتان تورك، سەڵاحەددینیش کورد بوو وەزیری دەوڵەتێك بوو کە خەلیفە عەرەب و شیعە بوو.

بوون بەسەرۆکوەزیران: سەڵاحەددین بە فەرمانێکی خەلیفەی فاتیمی (العاضد ٥٦٧ك) پۆستی وەزارەتی وەرگرت، خەلیفە لە فەرمانەکەیدا هێندە دەسەڵاتی دا بە سەڵاحەددین کە بەدەستی خۆی نوسیبووی: (ئەمە بەڵێننامەیەکە کە هیچ وەزیرێك پێشتر

بەڵێننامە و عەهدی وای پێنەدراوە) لەڕووی بەرفراوانی دەسەڵاتەوە. سەلاحەددین لەگەڵ دەستبەکاربوونیدا یەکێك لە هەرە کارمەندە بەتواناکانی تەشریفاتی کۆشکی خەلیفەی کردە هاوکاری خۆی کە بە «القاضی الفاضل» ناسراوبوو.

**بۆ لەناوبردنی ئەو دەوڵەتە قوڵە شاراوەیەی فاتمییەکان، چەند ستراتیژێکی دانا:**

یەکەم: لاوازکردنی هێزی سەربازیی فاتمییەکان، ئەوەبوو ئەو کەتیبە سەربازیانەی کە وەلائیان بۆ فاتمییەکان هەبوو و ژمارەیان دە هەزار چەکدار بوو و هەریەکەیان سەر بە کەسایەتییەکی ئەرمەنی و سەقلییەیی و عەرەب و زەنجییەکان بوون، هەموویانی هەڵوەشاندەوە. لەجێگەیدا – بەپێی وتەی ئیبن ئیاسی حەنەفی لە کتێبی (بدائع الزهور)دا هێزێکی سەربازیی نوێی دامەزراند کە تەنها لە کوردەکان پێکهاتبوون، «ژمارەیان دوازدە هەزار جەنگاوەری ئازای کورد بوو».

دووەم: سیستەمی دادوەریی شیعەی ئیسماعیلی هەڵوەشاندەوە و لەبری ئەو سیستەمی دادوەریی سوننیی شافیعی دامەزراند بە سەرپەرشتی قازییەکی کورد بەناوی قازی سەدرەددین مارانی شافیعیی کوردی.

سێیەم: دامەزراندنی دەزگایەکی هەواڵگریی کە قازی عەبدولڕەحیم (القاضی الفاضل) سەرپەرشتی دەکرد و توانی لەڕێی زانیاریی هەواڵگرییەوە پیلانی کۆنە فاتمییەکان ئاشکرا بکات کە دەیانویست بەهاوکاریی خاچدروشمەکان دژی سەلاحەددین ڕاپەڕن و لە میسر دەریبکەن.

چوارەم: سەلاحەددین شۆڕشی ڕۆشنبیریی ڕاگەیاند و بەپارەی کۆکراوەی خەلیفە فاتمییەکان دەستیکرد بەدامەزراندنی قوتابخانە و خوێندنگە بۆ سەرجەم بوارەکان و بۆ مەزهەبە جیاوازەکانی شافیعی و حەنبەلی و حەنەفی و مالکی و دانانی زانای بەناوبانگ تیایاندا بۆ وانەوتنەوە، بەتایبەتی گرنگیدان بە بووژاندنەوەی مەزهەبی سوننی تا دژ بە هەژموونی دووسەد ساڵەی مەزهەبی ئیسماعیلی بووەستنەوە. یەکێك لەو خوێندنگایانە لە تەنیشت (دار الضرب) بوو واتە بانکی ناوەندیی وڵات یان دامەزراوەی سککەلێدان کە تیایدا پارەی چاپ دەکرد، یاخود بڵێین سککەی دراوی لێدەدا.

هەروەها سەلاحەددین بۆ یەکەمجار لە مێژووی قاهیرەدا – بەپێی ئیبن ئیاس لە کتێبی (بدائع الزهور)دا – بیمارستان واتە نەخۆشخانەی دامەزراند. هەموو ئەم خوێندنگە و نەخۆشخانانە لە پاش سەلاحەددینیش هەر مانەوە تا سەردەمی کۆتایی دەوڵەتی عوسمانیش.

بەمجۆرە، سەلاحەددین وەك سەرۆکوەزیران توانی کۆتایی بە هەژموونی دەوڵەتی فاتمیی بهێنێت و لەجیاتیدا دەوڵەتێکی نوێی بەناوی دەوڵەتی ئەییوبی دامەزراند.

ڕەحمەتی خوا لە سەلاحەددین، پیاوی مەزنی کورد، بریا سەرکردەکانی کورد لەم سەردەمەدا ستراتیژەکانی ٩٠٠ ساڵ پێش ئێستای ئەویان پەیڕەو بکردایە.



# بزوتنەوەی ڕوانگە

بزوتنەوەیەکی ئەدەبی نوێخواز بوو لە سەرەتای حەفتاکانی سەدەی ڕابردوو لە ئەدەبی کوردیدا سەریهەڵدا، کاریدەکرد بۆ نوێکردنەوەی ئەدەبی کوردی بەگشتیی و شیعر بەتایبەتی بۆ دەربازکردنی لەو چەق بەستووییەی کە تێی کەوتبوو، بیرۆکەی ڕاگەیاندنی ئەم بزوتنەوەیە دەگەڕێتەوە بۆ هەریەکە لە (شێرکۆ بێکەس، حوسێن عارف، کاکەمەم بۆتانی، جەمال شارباژێڕی، جەلالی میرزا کەریم)، ئەمانە ئەدیب و شاعیر و نوسەری ئەو سەردەمە بوون کاریگەریی ئەدەبی جیهانیی و ئەدەبی عەرەبی زۆر بوو لەسەریان کە لەوکاتەدا ڕەوت و بزوتنەوەی نوێخوازی لە جیهاندا سەریانهەڵدابوو، بۆ ئەم مەبەستە لە ڕۆژی ١٩٧٠/٤/٢٥دا یەکەم بەیاننامەیان بڵاوکردەوە کە تێیدا خاڵە سەرەکییەکانی بیروبۆچوونی نوێگەرییان بەیانکردبوو.

ڕوانگەییەکان لەڕووی تیۆرییەوە بیروبۆچوون و بیرۆکەی نوێ و زۆر جوانیان پێشکەشکرد، بەڵام لە واقیعدا نەیانتوانی جێبەجێی بکەن ئەمەش لەبەر چەند هۆکارێك لەوانە: بەرپەرچدانەوەی توندی ئەدیب و نوسەرانی ئەوکاتە و تاوانبارکردنیان بە لادان لە ڕێبازی باوی ئەدەبی کوردی کە لەوکاتەدا زۆرتر ئەدەبی ڕیالیزمی و تاڕادەیەکیش ڕۆمانتیکی پەیڕەو دەکران، هەروەها نەبوونی مەنهەجێکی تۆکمە و بەرچاوڕوونی تەواو لە نێوان ئەندامەکانیدا و هەریەکەیان ڕێباز و توانایەکی جیاوازی هەبوو لەویتر، سەرەڕای ئەمەش کارەکەیان زیاتر چاولێکەری بوو بۆ ئەدەبی گەلانی تر بەتایبەتی عەرەبی بەبێ ڕەچاوکردنی تایبەتمەندی ناوچەیی و نەتەوەیی، هەروەها کارەکەیان وەك دواتر دەرکەوت زیاتر هیوا خواستن و ئارەزووی کۆمەڵێك ئەدیبی لاو بوو تا ئەوەی هەوڵێکی واقیعی تێپەڕاندنی دۆخەکە بێت.

بەڵام ئەمان توانیان لە ماوەی کارکردنیاندا کۆمەڵێك کار بکەن لەوانە: دەرکردنی سێ (٣) ژمارەی گۆڤاری ڕوانگە، نوسین و بڵاوکردنەوەی شیعر بە شێوازی نوێ، بڵاوکردنەوەی چیرۆك، وەرگێڕانی چیرۆك و شیعری بیانی بۆ زمانی کوردی، نوسین و وەرگێڕانی چەندین وتاری ڕەخنەیی ئەدەبی، پەرەپێدانی پەخشانە شیعر.



## شێخ ئەمجەد زەهاوی کێیە؟

زانای ناوداری کورد شێخ ئەمجەد زەهاوی کوڕی شێخ محەمەد سەعیدی کوڕی شێخ محەمەد فەیزییە، لە ساڵی ١٨٨٢ لە بەغداد لەدایکبووە، بنەچەیان دەگەڕێتەوە بۆ میرەکانی بابان و لە سلێمانی نیشتەجێ بوون، بەڵام باپیری کۆچی کردووە بۆ سەرپێڵی زەهاو لای کرماشان و دواتر لە بەغداد نیشتەجێ بووە، باوکی و باپیری موفتی عێراق بوون.

شێخ ئەمجەد ساڵی ١٩٠٦ کۆلێجی یاسا و پەیمانگای دادوەری لە ئەستەمبوڵ تەواوکردووە، شارەزاییەکی زۆری هەبووە لە زانستە شەرعییەکاندا و فەتوای زۆری لە بابەتە فیقهییەکاندا هەبووە، موفتی ئەوکاتەی عێراق داوای لێکراوە وەکو باوك و باپیری ببێتە موفتی، بەڵام ڕەتیکردووەتەوە، لە ژیانیدا کۆمەڵێك پیشە و کاری گرنگی پێ سپێردراوە، لەوانە:

- سەرۆکی یەکێتی زانایانی عێراق.
- سەرۆکی دەستەی تەمیزی شەرعی.
- مامۆستا لە کۆلێجی ماف و خانەی زانستە شەرعییەکان.
- حاکم لە دادگاکانی عێراق.
- ئەندامی دامەزرێنەری کۆمەڵەی برایەتی ئیسلامی و یەکێتی زانایانی عێراق بووە، هەروەها یەکێك بووە لە دامەزرێنەرانی ڕێکخراوی پەیوەندی جیهانی ئیسلامی لە مەککەی پیرۆز.
- بە سەرۆکی کۆنگرەی جیهانی ئیسلامی هەڵبژێردراوە.
- لە ساڵی ١٩٦٠ کراوە بە سەرۆکی کۆمەڵەی ڕزگارکردنی فەلەستین.

سەرەڕای ڕەوشت و ئاکارە بەرزەکەیی و زانستە بە پێزەکەی کەسێکی زۆر لەخوا ترس و بە تەقوا بووە تا لە وەسفیدا گوتراوە:» ئەگەر ویستت تەماشای سەحابەیەکی پێغەمبەر (ص) بکەیت ئەوا تەماشای شێخ ئەمجەد زەهاوی بکە«.

ساڵی ١٩٦٧ لە بەغداد کۆچی دوایی کردووە و بە بەشداری ئاپۆڕایەکی گەورەی جەماوەری لە زانایان و پیاوماقوڵان و قوتابی و کەسایەتییە سیاسیی و کۆمەڵایەتییەکان بەخاك سپێردراوە.

INTERNATIONAL INSTITUTE OF ISLAMIC THOUGHT

iiit

# پەیمانگای جیهانی فیکری ئیسلامی

دامەزراوەیەکی فیکریی ئیسلامیی ڕۆشنبیریی سەربەخۆیە، لە سەرەتای سەدەی پانزەیەمی کۆچی (١٤٠١ك - ١٩٨١ز) لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لەسەر دەستی کۆمەڵێك بیرمەندی عێراقی و کورد دامەزراوە، لەوانە د.جەمال بەرزنجی و د.تەها عەلوانی و د.هیشام تاڵیب، کار بۆ ئەم خاڵانەی خوارەوە دەکات:

- فەراهەمهێنانی تێڕوانینی گشتگیرانەی ئیسلام، لەپێناو تەئسیلکردنی مەسەلە هەنووکەییەکانی ئیسلام و ڕوونکردنەوەیان، هەروەها لەپێناو پێکەوەگرێدانی بەش و لقەکان بە هەمەکییەکان (الكليات) و مەبەست و ئامانجە گشتییەکانی ئیسلام.

- گێڕانەوەی ناسنامەی فیکریی و ڕۆشنبیریی و ژیاریی بۆ ئوممەی ئیسلامی، ئەویش لە میانەی چەند هەوڵ و کۆششێکی بەئیسلامکردنی زانستە مرۆڤایەتیی و کۆمەڵایەتییەکان و چارەسەرکردنی مەسەلەکانی فیکری ئیسلامی.

- چاکسازی لە پرۆگرامەکانی فیکری ئیسلامی هاوچەرخدا، بۆئەوەی ئوممەی ئیسلامی توانای دووبارە گەڕاندنەوەی شێوە ژیانە ئیسلامییەکەی خۆی و هەروەها ڕۆڵی خۆی لە ئاڕاستەکردنی کاروانی ژیاریی مرۆڤایەتی و بەرچاوڕۆشنکردنی و گرێدانی بە بەها و ئامانجەکانی ئیسلامەوە، هەبێت.

پەیمانگا، بۆ بەدەستهێنانی ئامانجەکانی چەند هۆکارێك دەگرێتەبەر لەوانە:

- بەستنی کۆنگرە و سیمیناری زانستی.

- هاوکاریی هەوڵ و کۆششی زانا توێژەرەوەکانی زانکۆ و بنکەکانی توێژینەوەی زانستیی و بڵاوکردنەوەی بەرهەمە زانستییە نایابەکان.

- ئاڕاستەکردنی توێژینەوە زانستی و ئەکادیمییەکان لەپێناو خزمەتکردن بە فیکر و مەعریفە.

هەروەها پەیمانگا چەند نووسینگە و لقێکی لە پایتەختی وڵاتە عەرەبی و ئیسلامییەکان و وڵاتانی تریش هەیە، کە لە ڕێگەیانەوە کار و چالاکییە جۆراوجۆرەکانی خۆی ئەنجام دەدات، هەروەها چەند ڕێکەوتننامەیەکی لەگەڵ ژمارەیەك زانکۆی عەرەبی و ئیسلامیی و خۆرئاوایی لە سەرانسەری جیهاندا بۆ هاوکاریی زانستی هاوبەش، هەیە، لە کوردستانیش سەنتەری زەهاوی بۆ لێکۆڵینەوەی فیکریی نوێنەراتی دەکات.

# دروستکردنی کاغەز

**ئایا دەزانیت مسوڵمانان هێندە گرنگییان بە زانست و نوسین و خوێندنەوە داوە کە لە سەدەی دووەمی کۆچیدا، واتە ١٢٠٠ساڵ لەمەوپێش، لە سەردەمی خەلیفەی عەبباسی هارونە ڕەشیددا کارگەی دروستکردنی کاغەز لەبەغدا دامەزرا، کارگەکە کاغەزی بەئامادەکراوی دەدایە نوسەران بۆ دانانی کتێب و لەبەرگرتنەوەیان.**

**سەرچاوە: (تاریخ الادب العربی، العصر العباسی الاول، د.شوقی ضیف، دار المعارف، ٢٠١٨، ص١٠٣).**



# خەرمانی خاڵ






















ئەم خەرمانە بڵاوکراوەکانی (خاڵ)ە، لە ساڵی ٢٠٢١، چوار ژمارەی گۆڤاری (خاڵ) لە چوار وەرزی (ساڵ)دا کە ژمارەکانی (٣١، ٣٢، ٣٣، ٣٤) لەخۆدەگرێت. لەگەڵ حەوت کتێبی ناوازە و جیاواز، کە بریتین لەمانەی خوارەوە:

**١. تۆفیق کەریم: کاریگەری ئیسلام لەسەر فۆلکلۆری کورد.**

توێژینەوەیەکی تێروتەسەلە لەسەر فۆلکلۆر و بەشەکانی وەک: دابونەریت، یاری کوردەواری، پەندی پێشینان، مەتەڵ، کەلەپوور، گاڵتەوگەپ، ئەفسانە، حەکایەت، بەیت و داستان، هونەر. بە وردیش کاریگەری ئاینی ئیسلام لەسەریان باسکراوە، بە پشت بەستن بە سەدان سەرچاوەی جیاواز.

**٢. ئیدریس سیوەیلی و تۆفیق کەریم: ڕۆژنامەی ڕاپەڕین ناساندن و بیبلۆگرافیا.**

پێکهاتووە لە هەر چل و سێ ژمارەکەی ڕۆژنامەی ڕاپەڕین (١٩٩٧/١١/٢٢ – ١٩٩٩/٧/١٢)، لەگەڵ ناساندنێکی تێروتەسەلی ڕۆژنامەکە و دروستکردنی دوو بیبلۆگرافیا بۆ نووسەران و بابەتەکانی ڕۆژنامەکە، ئەم بڵاوکراوەیە سەرچاوەیەکی گرنگە بۆ ئەوانەی لە مێژووی ڕاگەیاندنی بزاڤی ئیسلامی دەکۆڵنەوە.

**٣. عومەر ئیسماعیل: حاجی قادری کۆیی – شاعیر و زانا و بیرمەندی چاکسازی.**

لێکۆڵینەوەیەکی وردە لەسەر: سەردەم و ژیان و ژانەکانی حاجی، مەرجەعیەت و ڕەهەندەکانی فکری حاجی، نووسەر سەرەڕای سوودوەرگرتن لە نزیکەی سەد سەرچاوە بۆ نووسینی کتێبەکەی، وەک لێکۆڵەرێک دیدو بۆچوونی جیاوازی خۆشی دەربڕیوە لەسەر ئەو شاعیرە شۆڕشگێڕە.

**٤. سەلاح سالار: ڕۆژژمێری خاڵ.**

بۆ سێیەم ساڵ و بە ڕووخسار و دیزاینێکی جوانتر و زیادکردنی زانیاری نوێ لەلایەن ئامادەکارەوە ڕۆژژمێری خاڵ گەیشتەوە کتێبخانەکان.

**٥. کۆبەرهەمی شێخ محەمەدی خاڵ.**

گەورەترین بەرهەمی ئەمساڵی (خاڵ)ە، کە پێکهاتووە لە سەرجەم نووسینەکانی شێخ محەمەدی خاڵ، لە دووتوێی هەشت بەرگ و (٤٢٨٦) لاپەڕەدا. کە لە ساڵی ١٩٣٥وە دەستپێدەکات تا کۆتایی ژیانی ١٩٨٩، هەشت بەرگەکەش بەم شێوە دابەش کراوە:

**بەرگی یەکەم:** پێکهاتووە لە تەفسیری جزمی یەک، دوو، سێ، چوار، لەگەڵ نامیلکەی تەفسیری سورەتی (الفاتحة). شایانی باسە جزمی چوار بۆ یەکەمجارە بە چاپ دەگەیەنرێت.

**بەرگی دووەم:** پێکهاتووە لە تەفسیری جزمی ٢٧، ٢٨، ٢٩، ٣٠. لەگەڵ وتارە تەفسیرییەکانی شێخی خاڵ کە لە گۆڤاری گەلاوێژدا بڵاوکراوەتەوە.

**بەرگی سێیەم:** هەردوو بەشەکەی فەرهەنگی (خاڵ)ی لەخۆگرتووە.

**بەرگی چوارەم:** تایبەتە بە پەندی پێشینان.

**بەرگی پێنجەم:** بەشی یەکەم (نالەی دەروون)ە، کە چەندین بابەت و وتاری تێدایە.
**بەرگی شەشەم:** هەر بە ناوی (نالەی دەروون)ە، بەشی دووەم پێکهاتووە لەم نامیلکە و کتێبانە (مەولانا خالیدی نەقشبەندی، موفتی زەهاوی، بەشێک لە ژیانی شێخ ئەمینی خاڵ، بەدیعوزەمان مامۆستا سەعیدی نورسی، ڕێڕەوی ژیانی شێخ محەمەدی خاڵ، مەولودنامەی نەوئەسەر یان تاریخی پێغەمبەر، سۆزی مینبەر، لە سەرگوزەشتەکانی ژیان، پێشگر و پاشگر).
**بەرگی حەوتەم:** ئەم بەرگە و بەرگی هەشتەم نووسینە عەرەبیەکانی شێخ محەمەدی (خاڵ)ن، (البیتوشي، الشیخ معروف النودهي البرزنجي).
بەرگی هەشتەم: بریتییە لە (فهرس مخطوطات مكتبة الشيخ محمد الخال في السليمانية المؤنثات السماعية، تأريخ الامارة الأفوراسيابية).

**٦. کۆبەرهەمی پاڕەزانی:**

بڵاوکرانەوەی سەرجەم نووسینەکانی مامۆستا شێخ عەزیزی پاڕەزانی لە سێ بەرگدا، بەم شێوەیە:
**بەرگی یەکەم:** هەردوو بەشەکەی (ژیانی پێغەمبەری مەزن)ی لەخۆگرتووە، کە (٦٩٥) لاپەڕەیە.
**بەرگی دووەم:** ئەم بابەتانە لە خۆدەگرێت: نموونەیەک لە ئیسلام، ئیسلام بەرنامەی ژیانە، پێنج پایەکانی ئیسلام، کوڕێکی لاسار و باوکێکی هەژار، خێزانی بەختیار و کۆمەڵی کامەران، لە دەروازەی ئیسلامەوە.
**بەرگی سێیەم:** ئەم بابەتانە لە خۆدەگرێت: ئیشکردن نەک تەمەڵی، دوو خەربزە بە دەستێ هەڵناگیرێ، تا جوانتر لە ئایینی ئیسلام تێبگەین، وەڵامی نووسەری کتێبی (گەردوون)، بەشی عەرەبی، بیبلۆگرافیای پاڕەزانی.

**٧. محمد رؤوف محمد: اشارات و مفاتیح لفهم القرآن الكريم.**

ئەم کتێبە بڵاوکراوەیەکی دیکەی ناوەندی (خاڵ)ە، دوو بەرگە، زیاتر لە هەزار لاپەڕەیە، نووسەر ئەزموونی چل ساڵی وردبوونەوە و ڕامان و تێگەشتنی خۆی لە قورئانی پیرۆز کۆکردووەتەوە و لەم دوو بەرگەدا دایڕشتووە. ئەم لێکۆڵینەوە نایاب و داهێنەرانەی نووسەر، سەرنجی هەریەکە لە د.ئەحمەد بالیسانی و د.ئیبراهیم ئەمین جاف و د.عوسمان هەڵەبجەیی ڕاکێشاوە و لە سەرەتای کتێبەکەدا ستایشی هەوڵ و ماندووبوون و وردەکارییەکانی نووسەریان کردووە.









# هۆبەندی نێوان عەقڵ و وجود لە هزری ئیسلامیدا

کتێبی نوێی سەنتەری زەهاوی بۆ لێکۆڵینەوەی فیکریی
ئێستا لە کتێبخانەکاندایە